## لویی فیشێر

# گاندی و ستالین

### دووڕیانێك لە بەردەم مرۆڤایەتیدا

## سلێمان دڵسۆز

دەزگای توێژینەوە و بڵاوكردنەوەی موكریانی

- **گاندی و ستالین**
- نووسینی: لویی فیشێر
- وەرگێڕانی: سلێمان دڵسۆز
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی
- پیتچنین: شاناز پیرۆتی نیا
- بەرگ: مراد بەهرامیان
- ژمارەی سپاردن: ١٦٢٢
- نرخ: ٣٠٠٠
- چاپی یەكەم ٢٠٠٨
- تیراژ: ١٢٥٠
- چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆك)

زنجیرەی كتێب (٢٩١)



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com



پێشكەشە:

بە رێبوارانی گومناو و لادراو و خاكەڕای رووگەی ئاشتی، عیشق و دادپەروەری و ئازادی

بە منداڵانی ئەمڕۆ و رێبوارانی سبەی،

بە كچانی ئەمڕۆ و دایكانی سبەی،

بە دەستكورتانی بێ گوتەبێژ...تا بۆخۆیان ببێژن.

# ناوەرۆك

## پێشەكیی وەرگێڕی فارسی:

# وتەیەك لەگەڵ خوێنەران

ئێمە خەڵكانی سەر گۆی زەوی پێویستیمان بە ڕێگە چارەیەكی "گاندی"یانە هەیە.

ئێمەی ئێرانی زیاتر پێویستیمان بە ڕێگەچارەیەكی "گاندی"یانە هەیە.

ساڵانی بەرودوایان نێو ناوە سەردەمی گاندی. دیارە دەبینین كە جیهان هێشتا ئێجگار تینووی ڕێژنە بارانێكە كە بتوانێ وەڵامێكی گاندییانە بەسەر بێبەش و چارەڕەشانی تینووی خۆشەویستی و تەبایی و عەشق و ئازادی و دادپەروەری و ناتوندوتیژیدا ببارێنێ.

ئێمەی ئێرانی ئەزموونی جیاواز، بەڵام تاڵمان زۆرن. هێشتاكەش خەریكی ئەزمونی تاڵین. هیچ كام لەو ئەزموونانە نەیانتوانی وەڵامێك بن بۆ سەرلێشێواویی ڕۆحی، فیكری، كردەیی و كۆمەڵایەتیمان. شكست دوای شكست. ئەمەیە سەربردەمان!

ئەزموون، كاتێك تاڵ و كارەساتبار بێ، مرۆڤ دەكاتە یەخسیری زنجیرەیەك لە توندوتیژی. مرۆڤی ئێرانی تا كوێ و تاكەی دەبێ ئەم زنجیرە كۆنەی توندوتیژی دووپات بكاتەوە؟ ئاخۆ ڕێگەیەك بۆ دەربازبوون لەو بازنە داخراوە بەدی ناكرێ؟

مێژووی هاوچەرخ دەڵێ كەسانێكی وەك گاندی، شتێكیان گوت كە دەكرا بۆ دووپاتبوونەوەی توندوتیژی ببێتە خاڵی كۆتایی. گاندی هەرچەند بە ڕواڵەت نوشستی هێنا، بەڵام توانی تیۆرەكەی لە ناو ڕۆح و گیانی هەزاران بیرمەندی هاوچەرخی خۆی و پاش خۆیدا بچێنێ، كە دەڵێ:



دەشێ بۆ زنجیرەی توندوتیژی، بیر لە كۆتایی بكرێتەوە.

هەروەك ئێمە جارێكی دی "گاندی"مان لە *خان عەبدولغەفار خان*[1]، *مارتین لۆسەركینگ*، *ماندێلا*، *واسلاو هاوڵ* و كەسانی دیكەدا بینیەوە كە هەروا زیندووە و بیر دەكاتەوە و زاوزێ دەكا.

ئێستا و داهاتووی ئێمە هەروا ئاتاجی گاندییە. لەجێدا كۆی مرۆڤایەتی تاهەتایە، پێویستی بەو ڕێگە سادەیەیە كە گاندی، بە تاقی تەنیا، دۆزەرەوە خاكەڕا و سەرلەنوێیەكەیەتی. هەموان بە **زمان** ئەو ڕێگایە شارەزان و زۆر كەسی زمانپاراو بە باشی دەتوانن لێی **بدوێن** بەڵام **باجی** بۆ نەدەن. ئەوە تەنیا گاندی و كەسانی وەك ئەون كە ئازایانە و بە دانی باج، بە **كردەوە** ئەم ڕێگایە دەگرنەبەر. گاندی **پاڵەوانی قسان** نییە، ئەو **پیاوی كردەوەیە** كە ئازار و نەهامەتیی مرۆڤی پێ قەبووڵ ناكرێ و ناتوانێ بۆ ڕازیكردنی دەروونیی خۆی، پەنا بباتە بەر ئەشكەوتەكانی كوێستانی هیمالایا و لە خەڵك دوورەپەرێز بێت. بەم جۆرەیە كە **بارودۆخی مرۆیی** و **تراژیدیای بارودۆخ**، گاندی دەكەنە موقەددەسترین سیاسەتوان یان سیاسیترین موقەددەسی سەردەم.

**لە شوێنێكدا دەڵێ:**

" ئەو كاتەی بە هیچ شێوەیەك نەتوانم خراپە بكەم و ئەو كاتەی كە هیچ شتێكی دزێو و ڕۆح زلانە، تەنانەت بۆ ساتێك نەتوانێ بێتە نێو دنیای ئەندێشەمەوە، ئەو كاتەیە كە ڕێبازی ناتوندوتیژی دڵی گشت خەڵكی جیهان دادەگرێ و بەر لەوە بەو ئامانجە ناگەم. **من ئامانج و ئەزموونی نەكردەنیم نەخستۆتە بەردەم خۆم و بەردەنگەكانم.** ئەوەی من دەمەوێ، ئیمتیاز و مافی سروشتیی مرۆڤە. ئێمە بەهەشتمان بزر كردووە و ئێستا دەبێ هەوڵ بدەین بیدۆزینەوە."

---

(١) خان عەبدولغەفار خانی پشتوون (١٨٩٠-١٩٨٨) یەك لە هاوڕێیانی گاندی و بەناوبانگ بە گاندیی سەرحەد كە دوای تیرۆری گاندی، تا ژیا لە ناوچەی پیشاوەر و نێو هۆزەكانی پاكستاندا خەریكی خزمەتی خێرخوازانە بوو و سوپای بێچەكی *خزمەتكارانی خوای* دامەزراندبوو.

مەگەر ئەوانەی پارە وەردەگرن تا بۆ ئاسایشی نەتەوەیی وڵاتان پلان دابڕێژن، پرۆگرامی سەربازی دەنووسن، پێشبڕکێی خۆ پڕچەککردن وەڕێ دەخەن، سیناریۆی دوورودرێژی ستراتژیك دەنووسن، یان ئەوانەی کارگەکان رادەسپێرن بە بەرهەمهێنانی چەند شەفتی و بەلێشاو، جبەخانەکان بئاخنن، دیسانەوە چەك دەکڕن و تاقەتی دەکەن و هەراوهوریای ئایدیولۆژی یان ناسیونالیستی دەنێنەوە، بۆ ئاسایشی نەتەوەیی وڵاتەکانیان چییان کردووە؟ ئایا بۆ ساتێك توانیویانە گەلان لە دڵەڕاوکێی وەهمی مەترسیی **دوژمن** و **ئەویدی** و **جودابیر** و کێ و کێ رزگار بکەن؟ راستیت دەوێ ئەمانە نانیان لە تەشەنە پێکردنی ئەو وەهمەدایە. مرۆڤایەتیی دیلی وەهمی دوژمن، ئاساییە کە بە هەزار لاڕێدا بڕوا و لە شانۆگەریی هەڵبەسراوی سیناریستاندا ببێتە رۆڵگێڕ و لە ئەنجامدا ئازار و مەینەتیی خۆی و خەڵکی تر زێدەتر بکا.

بەڵام کە گوێمان لە.. رێگەچارەیەکی گاندییانە.. دەبێ، کەڵکەڵەیەکی دووپاتە بەرۆکمان دەگرێ کە نەکا ئەمەش فیرقەیەکی دیکە بێت و بیهەوێ ببێتە گۆڕەپانەکە و بۆ جاری چەندەمین، بە بەزمی موراد و مورید و ئایدیۆلۆژیبازی خەڵکە داماوەکە دەسخەرۆ بکا؟ ئێمە مەگەر چەندەمان دەرفەت بە دەستەوە ماوە تا هەر رۆژەی، ئەم پیر و ئەو شەخس تاقی بکەینەوە و دوایەش، بخیچێین و بدۆڕێین و سەرمان بەرینەوە نێو قاوغی تەریکیمان؟ ئەم کەڵکەڵەیە بێجێ نییە. بەرهەمی دەست سووتانمانە بە پۆلووی ئەزموونەکانمان. بەڵام تۆ بڵێی گاندی لە چوارچێوەی موراد و **موریدبازدا** جێ بگرێ؟ دەبێ شێلگیرانە بۆی لە مل بدەین کە ئەگەر *پوپێر* لە بواری تێوردا جەخت لەسەر ناموتڵەقیی هزری زانستی و ئەوپەڕ زانستیی مرۆڤ دەکاتەوە، ئەمجارە گاندی لە واری **کردەوەدا** هەموو ساتێك پێمان دەڵێ:

"گاندی هیچ رێبازێکی نوێی دانەهێناوە، گاندی پیر و موراد نییە، شتێك بە ناوی گاندییزم بوونی نییە." گاندی لە فیرقەگەرایی بێزارە. گاندی تەنیا دووپاتکەرەوەی یاسایەکە کە بە قەد چیا گەردنکەشەکانی هیمالایا کەونارە. گاندی هیچی نەخستۆتە سەر دنیا. گاندی تەنیا و تەنیا خەریکی تاقیکردنەوە و



قەرەبووکردنەوە و چاککردنی هەڵە ئەزموونکراوەکانی خۆیەتی. ژیاننامەکەی خۆی، کە ساڵی ١٩٢٦ نووسیویەتی، ناو دەنێ *ئەزموونەکانی من لەگەڵ هەقیقەت*. ئەو تەنیا تەقەللادەرێکی لێبڕاو و جیددی بوو، بە لانیکەمی بەهرەی مرۆڤێکی مامناوەندییەوە. هێندە مامناوەندی کە بۆ ئەزموونکردن و هەڵەکردن و پێگەیشتن بشێت ببێتە سەرمەشقێك بۆ هەموو خەڵکی ئەم جیهانە خاکییە. ئێمەش رەنگە بتوانین لە گەلێك لە ئەزموونەکانیدا هەڵەی گەورە و بچووك ببینین، بەڵام هێڵی جیاکەرەوەی ئەو لەگەڵ هەموو بانگەشەکەرانی رێگەبڕین و خەبات و ئایدیۆلۆژی و قوتابخانە و سیاسەت و رەوشت و خواناسیدا، لە خاڵێکی زۆر سادە و ئێجگار مەزندایە کە هەر ئەو خاڵەیە لێناگەڕێ هێنانەوەئارای دووبارەی هزری گاندی، گەڕانەوەیەکی دیکە بێ بۆ بیرکردنەوەی موتڵەق و دیتنی تەواوی هەقیقەت لای یەك کەس یان یەك بیروبڕوا. خاڵە سادەکەش ئەوەیە: گاندی بەڕاستی و لە دڵەوە – و بە پێداگرییەوە – بە وتە و کردەوە نایەوێ ببێتە قارەمان و موراد و رێبەر. دەڵێ وەك هەموو مرۆڤێکی ساکار، ناموتڵەقە. بڕوای وایە کە ئەو کەسایەتی نییە. بڕوای بەوەیە کە تەنیا دەبێ فێر ببێ و ئەزموون بکا و باوەڕی بە رێبواربوون و ناتەواویی خۆی هەیە. ئەوە کە ژیاننامەی خۆی ناو دەنێ: *ئەزموونەکانی من لەگەڵ هەقیقەت*. هەر ئەویشە کە دەڵێ: "من هەر لە قوماشی ئەو مرۆڤە هەڵەکارانەم کە لاوازترین هاوڕەگەزەکانیشمی لێ دروستکراون، منیش وەك هەر کەسێکی تر لەوانەیە بەهەڵەدا بچم و لە رێگە لابدەم." هەروەها دەڵێ: "ئەگەر یەکێك پێم بڵێ کە خواوەند، خوای ناڕاستی و خوای ئەشکەنجەیە، من سەرپێچی لە پەرستنی خوایەکی وا دەکەم، با هەموو تەمەنی خۆشم بۆ پەرستنی تەرخان کردبێ." واتە: هیچ موتڵەقێکی نووسراو و نەنووسراو و زیندوو و مردوو لای من نییە کە بتوانێ تەنگ بە بنەمای ئەخلاقیی من هەڵچنێ. ئەم ئەخلاقەش، ئەخلاقی بەزەیی و خۆشەویستی و ناتوندوتیژییە کە لە زەینی مندا دەتوانێ بە سەر هەموو نەریت و نوێکارییەکدا زاڵ بێ نەك بە پێچەوانەوە.

کاکڵەکە لێرەدایە: - ئامادەیی بۆ رەخنەکردنی بێبەزەییانەی هەموو ئەو شتەی هەمانە- لەبەرچاو نەگرتنی ئەرکێك (ریسالەتێك) بۆ خودی خۆمان (جیا لە مرۆڤەکانی دیکە) و زانینی هەر جۆرە ئەرکێك بە هی هەموان و بۆ هەموان، خۆپاراستن لە مورید و موڕادبازی - لە کاتی هوروژمی پرسیاری موریدانی خوازراو و نەخوازراودا - خۆنەدیتن وەك زانای گشتی و کامڵ، رێبوار و فێرخواز و ناتەواو مانەوەی هەمیشەیی، بەڵام هاوکات، هیواداریی بەردەوام بە گەشە و هەڵدان و پێگەیاندنی کەسایەتیی خۆمان و گشت مرۆڤەکان و باشترکردنی رەفتاری مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤ و هەروەها باشترکردنی پێکهاتەی دامەزراوەکانی مرۆڤ، نەفرەتکردن لە ستەم نەك لە ستەمکار، لە هەمووشی گرینگتر، موتڵەق نەکردنی ئیمان و بڕوا، لەسەر حیسابی دروستکردنی ئازار و کوێرەوەری بۆ خەڵك (تەنانەت یەك مرۆڤیش) و دواجار، رەچاوکردنی سەرمەشق و رەفتاری گاندی بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە هەموو رۆژێ دەڕژێنە کۆڵان و جادەکانەوە. لێرەدایە کە کەڵکەڵە رەوایەکەمان وەڵامێکی سووکناییبەخش و بەجێی دەست دەکەوێ کە: گاندی، دەمارگرژیی مەزهەبی نییە تا لەسەری، دەست بنێینە بینەقاقای خۆمان و خەڵکی دیکە، بەتاوانی لادان و گومڕایی و گومانەکانیان ئازاریان بدەین و بیانکوژین. گاندی تەنیا دووپاتی **وورینگەی ئارام و وردیلەی دەروونە**. پێوانەیەکە کە تۆ هەمیشە پێت بووە و نەتزانیوە پێتە. تۆ دەتوانی بێبەزەییانە هەریەك لە رەفتار و کردەوەکانی گاندی بخەیە بەر رەخنە و هەڵە و غەدرەکانی بیر بخەیەوە، بەڵام ناتوانی نکوولّی لەو **رێبازە بێناوە** بکەی کە ئەو ئاماژەی پێدەکا (لە هەزاران ساڵ لەمەوبەریشەوە هەبووە)، چونکە ئەو رێگایە ئیمکانی خۆپالاوتنی هەر لە سەرەتای کارەوە لەگەڵ خۆی و تۆ کردۆتە مەرج و هەموو ساتێك ئامادەیە دوا دەستکەوتەکانی بخرێنە بەر رەخنە و رەخنەکانت لێ وەربگرێ تا باڵای پێ بکا. هەر بۆیە رێبازێك نییە هەر لە سەرەتاوە چارەنووسەکەی دیاری کرابێ، بێجگە لەوەی رێز لە **یاسای کەمکردنەوەی دەرد** و **ئازار** و **میهرەبانیی بەربلاو** دەگرێ، بۆیە هەرگیز ناکرێ ئیدیعا بکرێ کە ئەم یان ئەو **نەریت!** کە



هەڵقولاوی ئەو رێبازەیە، ئەم و ئەوی بە لاڕێدا بردووە. چونکە لەجێدا خاوەنی هیچ **نەریتێك** نییە. ئەم وتانە هەموویان پەیوەندییان بە خودی رێبواری ئەو رێگایەوە هەیە، چونکە هەردەم نەك ئیمکانی رەخنەگرتن هەیە، بەڵکو توخمی بنەڕەتیی پێشڤەچوونیەتی.

لویی فیشێر لەم نووسینە کاریگەرەدا، بە یارمەتی وەگرتن لە گاندی، پەنجە لەسەر خاڵێکی گەورە و سادە دادەنێ، هەر ئەو شتەی کە هەمووان دەیزانن و دەیبینن، بەڵام بە ئەنقەست و بەپەلەپرووزێ بە پەنایدا رەت دەبن و دەستی رێزی بۆ سینگەوە دەنێن تا لەدەستی رزگاریان بێ: ئەو دەپرسێ دەوری تاك لە میانەی ئەو دوا پەلەقاژەیەدا چییە؟ ئاخۆ دەکرێ دەوری تاك و کۆمەڵ لە یەکتری جیا بکرێتەوە؟ ئایا ئەم جیاکردنەوەیە هەر لە سەرەتاوە هەڵە نییە و بۆ راکردن لە بەرپرسیارێتی نییە؟ ئاخۆ چاوەنواڕی دامەزراوەکان بوون، روویەکەی تری **ملکەچی و لەوەڕان لە دۆخی جێگیر** نییە؟ فیشێر بە گێڕانەوەی دوو بیرەوەری لە بەشی کۆتایی ئەم کتێبەدا، وەڵامی ئێمە و هەموو سۆراخکەرە داودۆزەکانی ئەمڕۆ و سبەی دەداتەوە: تاك، خاڵی دەستپێك و کۆتایی هەموو گۆڕانێکە. کەواتە دەشێ بڵێین:

ئێمە، زیاتر پێویستمان بە رێگەچارەی گاندییانە هەیە.

# کورتەیەك لە بارەی لویی فیشێرەوە

لویی فیشێر کوڕی ماسیفرۆشێکی دەستگێڕ بوو کە لە ٢٩ی فیبریوەری ١٨٩٦ لە فیلادلفیای ئەمریکا لە دایك بوو. دوای خوێندن لە قوتابخانەی پەروەردەی مامۆستایان (١٩١٤-١٩١٦) بوو بە مامۆستای قوتابخانە.

ساڵی ١٩١٧ چووە ناو تیپی جوولەکان کە یەکەیەکی سەربازی بوو لە فەڵەستین. دوای گەڕانەوە بۆ ئەمریکا بۆ ئاژانسێکی دەنگوباس لە نیویۆرك کاری دەکرد. ساڵی دواتر چووە مۆسکۆ و بووبە پەیامنێری گۆڤاری *ناسیۆن* (nation).

ئەو کاتەی لە سۆڤیەت بوو، چەندین کتێبی نووسی کە هەموویان لەو سەردەمدا بە باوەڕپێکراوترین سەرچاوەی سۆڤیەتناسی دەژمێران، هەندێکیان بریتین لە: ئیمپریالیزمی نەوتی، قەیرانێکی جیهانی بۆ نەوت (١٩٢٦) و سۆڤیەتییەکان لە جیهاندا (١٩٣٠). ناوبراو ماوەیەك هەواڵی شەڕی براکوژیی ئیسپانیا- ی دەگواستنەوە و ماوەیەکیش بوو بە ئەندامی بریگادی نێونەتەوەیی (یەکێتیی چەپەکانی جیهان) کە لە هەمان شەڕدا دژی فرانکۆی پادشاییخواز وەستایەوە.

ساڵی ١٩٣٦ گەڕایەوە ئەمریکا و لە نیویۆرك نیشتەجێ بوو. لەگەڵ ناسیۆن درێژەی بە کارەکەی خۆی دا و لە ١٩٤١دا ژیاننامەی خۆی بە ناونیشانی *مرۆڤەکان و سیاسەت* نووسی.

دوای مشتومڕێك لەگەڵ سەرنووسەر، لەسەر داکۆکیکردنی سۆزدارانەی گۆڤاری ناسیۆن لە ستالین و سیاسەتەکانی سۆڤیەت، ساڵی ١٩٤٥ گۆڤارەکەی جێهێشت. بێهیوایی ئەو لە کۆمۆنیزم (هەرچەند هیچکات نەبووە ئەندامی حیزبی کۆمۆنیست) لە کتێبێکی بە کۆمەڵدا بەناوی the god that filed, 1949 رەنگیدایەوە. ئەم کتێبە بە ناونیشانی *ئەو بتەی شکا* (بە فارسی) وەرگێڕدراوە.

لەوە بەدوا فیشێر بۆ گۆڤارە ئازادیخوازە دژ بە کۆمۆنیستەکانی وەك *پێشکەوتووی* دەنووسی.

کتێبەکانی تری فیشێر بریتین لە: ژیانی مەهاتما گاندی (١٩٥٠) کە فیلمی ٨ سەعاتەی ریچارد ئاتن بورو(١٩٨٢) لەرووی ئەوەوە دروست کرا، ستالین (١٩٥٢)، لێنین (١٩٦٤)، گاندی و ستالین (١٩٤٧)، هەفتەیەك لەگەڵ گاندی (١٩٤٢) و دەیان کتێب و وتاری دیکە لە بارەی سۆڤیەت (وڵاتێك کە ئۆگری بوو) و گاندی (کەسایەتییەك کە خۆشی دەویست).

فیشێر تا کاتی مەرگی لە ١٥ی ژانیوەری ١٩٧٠، لە زانکۆی *پرینستۆن*، وانەی *(یەکێتی سۆڤیەت)*ی دەگوتەوە.

من ساڵانی هەشتا لە *وتارەکانی (جۆرج ئۆروێل)*دا ناوی ئەم کتێبەم بەرچاو کەوت کە لە وتارێکی پڕنێوەرۆکی ئۆروێلدا لەمەڕ گاندی، وتەیەکی لویی فیشێر وەرگیرابوو.

دوای ئەوە چەندین ساڵ بە دوای ئەو کتێبەدا گەڕام تا ئەوەی پرۆفیسۆر *راج موهان گاندی*، مامۆستای مێژوو لە زانکۆکانی ئەمریکا و هیندستان (نەوەی مەهاتما گاندی)، لە سەفەری خۆی بۆ ئێران ساڵی **١٩٩٧** لە وتووێژێکی رۆژنامەوانیدا داوای کرد ئەم کتێبە تەرجەمە بکرێ. ئەمجارە ئینتەرنێت بە هانامەوە هات و لەو رێگایەوە کتێبەکە بە خێرایی کەوتە دەستم و وەرمگێڕا. وەك پێشپەیڤێك، لێرەدا وتارێکی *کریشنا کری پالانی*، یەك لە هاودەمە بڕواپێکراوەکانی *رابیندرانات تاگوور* دەهێنینەوە. ناوبراو کۆکەرەوەی پوختەی وتەکانی گاندی بە ناوی *خەڵکی هەموویان بران* بووە بۆ یونسکۆ. وتارەکە لەم سەرچاوەیە وەرگیراوە:

Ghandi, a life : Krishna Kripalani, Nasional Book Trust, India, 1993.



پێشپەیڤ:

## گاندی: جۆرێك ژیان
## کریشنا کری پالانی بچووك

بە درێژایی مێژووی دوور و درێژ و پڕ رووداوی نیمچە قارەی هیند، هیچ سەدەیەك بەقەد ئەو سەدەیەی بە لەدایکبوونی گاندی دەستی پێکرد و ئێستا[٢] لە ئاخر و ئۆخریدایین، شایەدی گۆڕانکارییەکی ئەوتۆ بەگوڕ لەژیانی سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئابووریی خەڵك نەبووە.

ئەو کاتەی گاندی هاتە دنیا (٢ی ئۆکتۆبەری **١٨٦٩**) حکوومەتی بەریتانیا لە هیندی باشوور بە تەواوی پنجی داکوتابوو. راپەڕینی ساڵی **١٨٥٧** بە ناوی جۆربەجۆری وەك *راپەڕینی سپۆی*، *شۆڕشی مەزن* یان *شەڕی یەکەمی سەربەخۆیی* تەنیا بە قازانجی گۆڕان و سەقامگیر بوونی کۆمپانیا ئابوورییەکانی ئینگلیز بۆ ئیمپراتۆرییەکی گەورە شکایەوە. ئەم زاڵبوونە، تەنیا سیاسی نەبوو. پێگەی بەریتانیا، وێڕای زاڵبوونە فەرهەنگی و فیکرییەکەی، وەها بەهێز ببوو کە نەوە نوێیە خوێندەوارەکەی هیند، هەڵپەی تووڕدانی کولتووری خۆیان و خۆخستنە باوەشی "ئەرکی بەشارستانیکردن"ی ئیمپراتۆرییە مەزنەکەیان بوو. **هیچ دەسەڵاتێك ئەوەندە موتڵەق نییە کە ئەوەی ملی بۆ کەچ دەکات بە ئیرادەی خۆی تەمەنناى بکات. هیچ زنجیرێك هێندە مەحکەم لە پەل و پێی خەڵك نائاڵێ کە کۆیلەکە بە ویستی خۆی بیکاتە ملی.** لە هیندی ئەو رۆژگارەدا، ملکەچی هێندە فراوان و خۆبەدەستەوەدان هێند چڕ بوو کە وا بیر دەکرایەوە ئیمپراتۆریی بەریتانیا لە هیند بە ئەمری خوا نازڵ بووە و بۆ ئەوە هاتووە تاهەتایە لێرە بمێنێتەوە.

---

(٢) ساڵی ١٩٦٨.

کاتێ گاندی دنیای بەجێهێشت، گەلی هیند گەلێکی ئازاد بوو کە بەو کارەساتە کۆستی کەوت. دۆزەخ نشینانی سەر زەوی، خەڵکانی بێدەسەڵات و رەشورووت و بێبەش لە سامانی وڵاتی باب و باپیران، میراتی لە دەستچوویان کەوتبۆوە دەست و بێزمانەکان زمانیان کرابۆوە. کووڕبووەوەی لە ترسان، ئێستا پشتیان راست کردبوونەوە. بێچەك، شیرێکیان دەسوو کە سەرنێزەی بەریتانی چی پێ لەگەڵ نەدەکرا، چەکێك لە گشت جبەخانەکانی دنیادا نموونەی نەبوو.

بەڵێ چەکێك کە بەبێ ئەوەی بکوژێ، دەیتوانی سەربکەوێ. چیرۆکی ئەو پەرجووە، چیرۆکی ژیانی "*گاندی*"شە، ئاخر ئەو لە هەموو کەس زیاتر وەستا و هەروەها ئەندازیاری ئەو دیاردە مێژووییە بوو. لە خۆڕا نییە کە هاونیشتمانە ئەمەگناسەکانی، ناویان لێناوە باوکی میللەت.

لەگەڵ ئەوەشدا پێ لێبڕینە کە ئیدیعا بکەین گاندی بە تەنیایی ئەو گۆڕانەی دروست کرد. هیچ تاکێك، هەر چەندەش بیرتیژ بێ، ناتوانێ وەستاکاری یەکتەنی پرۆسەیەکی مێژوویی بێ. زنجیرەیەك لە پێشینانی بەرجەستە و کەسانی هاوچەرخی بەتەمەنتر، بە بێڵ و شیر هەوڵیان داوە بێستانی پڕ لە دڕك و داڵی ژەهراویی ترس و لاوازی و بیری پڕوپووچ بژار بکەن. ئەوانە هەوڵیان دا زەوییەکە وەرگێڕن و خۆشی بکەن تا بلیمەتیی گاندی بیکاتە مەیدانی بەهێزی خەبات و هاونیشتمانەکانی لە رێپێوانێکی گەورەدا، بەرەو ئازادی رێنموونی بکا. ئەگەر گاندی سەد ساڵ زووتر لە دایك ببا، زەحمەت بوو ئەوە روو بدا کە روویدا. هیندیش ئەگەر رێبەرێکی وەك گاندیی نەبوایە نەیدەتوانی بگاتە چارەنووسی ئێستای خۆی و شێوازی تایبەتی خۆی دەست بخات. شێوازێکی هێند شکۆمەند کە ئازادیی لەگەڵ سەرفرازی بە دیاری هێنا. شێوازێکی تەواو ریزپەڕ کە مرۆڤ نازانێ ئەم ئەزموونە دەشێ جارێکی دیکە دووپات بێتەوە یان نا؟

گاندی بۆ خەڵکەکەی ژیا، رەنجی دا و مرد. لەگەڵ ئەوەدا گرنگیی ژیانی ئەو تەنیا لەبەر وڵاتەکەی خۆی نییە. جگە لەوە، گاندی تەنیا وەك نیشتمانپەروەر یان



چاکسازێکی شۆڕشگێڕ نییە کە لە یادی نەسلەکانی داهاتوودا دەمێنێ. خاڵی بنەڕەتی لە چیرۆکی گاندیدا ئەوەیە لە بنەڕەتدا هێزێکی ئەخلاقی بوو کە داخوازی ئەو لە ویژدانی مرۆڤ، هەم جیهانییە و هەم نەمر. ئەو بۆیە لە سەرەتاوە بۆ هاونیشتمانانی و نەك گەلانی دی، خەباتی کرد، چونکە لەناو ئەواندا لە دایك ببوو و ئازار و زەلیلییان، هاندەری پێویست بوون بۆ جووڵانەوە ئەخلاقی و خەباتە سیاسییەکەی، وانەیەکن بۆ ئەوە دەبێ هەموان فێری بن نەك تەنیا هیندییەکان.

ئەگەر گەورەیی گاندی تەنیا بە هۆی خۆشەویستیی گڕگرتووی ئەو بۆ نیشتمان و هەروەها رێبەرایەتییە پڕ جموجووڵەکەی لە کاتی خەباتێکی سەرکەوتووانەی سیاسیدا بوایە، ئەوە بەس بوو بۆ ئەوەی خەڵك وەك باوکی میللەت سوپاسگوزاری بن. بەڵام ئەو پاساوە بە زەحمەت دەتوانێ شی بکاتەوە کە بۆچی باقی خەڵکی جیهان بە شێوەیەکی تایبەت رێزی لێدەنێن یان هانەیەکی تایبەتی لە وتەکانیدا دەبیننەوە؟

ئەوڕۆکە لە جیهاندا **باوکی میللەتمان** کەم نین. **لەراستیدا بەبێ وجوودی هەندێك لەوان، دنیا دەکرا چارەنووسێکی باشتری هەبێ.** بەڵام ئەو پیاوە رەقەڵە رەشتاڵەیە لە بەرگێکی جاودا، شتێکی زیاتری لە *باوکی میللەت* تێدابوو. دەسکەوتەکانی وی زۆرن. هەر کامێکیان، کە بە گوێرەی شێوەی راپەڕاندن یان ئاکامی کارەکە هەڵسەنگێنراون، ناوی ئەویان لە سەرانسەری دنیادا ناسراو و سەرفراز کردووە. گاندی رزگاری لە زنجیری کۆیلەتیی بێگانەی بە یەك لەسەر پێنجی چەشنی مرۆڤ بەخشی و دوا بەدوای ئەوە، رزگاریی هیند - بە پێی هەندێك را - بووە پێشەنگی رزگاریی گەلێك وڵاتی ئاسیای باشووری رۆژهەڵات و ئەفریقا.

ئەوەی ئەو بۆ ئەو مرۆڤانەی کرد کە جاران پێیان دەگوترا **گلاو**، لە سەربەخۆیی هیند کەم بایەختر نەبوو. گاندی زنجیری دەیان سەدە زوڵم و زۆری چینایەتی و سووکایەتیی کۆمەڵایەتی ئەوانی پساند. پێداگریی ئەو، لەمەڕ ئەوەی کە ئازادی دەبێ هاوڕێ لەگەڵ بەختەوەریی کۆمەڵایەتی، ئەخلاقی و ئابووریی ملیۆنان کەس بێ کە لە گوند دەژین و هەروەها ئەو شێوازانەی بۆ گەیشتن بەو ئامانجە گرتنیە بەر،

ڕێبازێکی بۆ ژیان خستە ڕوو کە لەوانەیە ڕۆژگارێك ببێتە جێگرەوەی کۆمەڵگا ناوەندگەرا و بەرژەوەندیخوازەکانی ئەمڕۆ.

مردنەکەشی بۆخۆی دەسکەوتێکی گەورە بوو، چونکە شەهید بوونەکەی ڕێگەی لە سەرشێتیی ڕق و براکوژی لە نێو نەتەوەکەیدا گرت و زەمینەی سەقامگیریی شوناسی سێکۆلار و دیموکراتیی سیستەمی ساوای یەکگرتووی هیندی خۆش کرد، بەڵام هیچ دەستکەوتێکی مرۆیی، هەر چەند گەورەش بێ، ناتوانێ تاسەر بمێنێتەوە یان لەو دنیا هەردەم لەگۆڕانەدا، بێ گۆڕانکاری درێژە بە ژیانی خۆی بدا. ئەوی گاندی بە دەستی هێنا لەوانەیە لەناو بچێ یان بە لاڕێدا بڕوا یان دەتوانێ تا ئاستی یادەوەرییەك کاڵ بێتەوە، بەڵام گاندی دیسانەوەش دەژی. چونکە مرۆڤ لە دەستکەوتەکانی مەزنترە. لە وجوودی ئەودا، مرۆڤێکی جیهانی هەبوو کە هەمیشە بە دوای هەقیقەت و کەماڵی ئەخلاقیدا دەگەڕا. خۆی گوتەنی: "من زیاد لەوەی کە نەهێڵم نەتەوەکەم ئازار بچێژێ، بیر لەوە دەکەمەوە زاتی مرۆڤ لە بێبەزەیی دوور بخەمەوە... ئەگەر ئێمە هەموومان فرزەندی یەك خواین، لە گوورانێکی خواییدا پێکەوە هاوبەشین، کەواتە دەبێ لە تاوانی کەسێکی تردا - چ سەر بە ئێمە بێ یان نەتەوەی تر - هاوبەش بین." رابیندرانات تاگوور ساڵی **١٩٣٨** دەنووسێ: "لە هیندیش وەك شوێنەکانی دیکەی دنیا، نیشتمانپەروەری وا هەن کە بە قەد گاندیی ئازیز، خۆیان بۆ نیشتمان تەرخان و قوربانی کردووە و هەندێکیان جەزرەبە و ئازاری توندتر لەوەیان چێشتووە کە گاندی دەبوو بیچێژێ. تەنانەت لە دیدی ئایینییەوە هەندێ مورتاز لەم وڵاتەدا دەژین، ئەوەندەیان ریازەت (خۆ ئازاردانی ئایینی) کێشاوە کە ژیانی گاندی لەچاو هی ئەوان، ئاماڵ حەسانەوەیەك بووە. بەڵام ئەم نیشتمانپەروەرانە، تەنیا نیشتمانپەوەرن نەك زیاتر، مورتازەکانیش تەنیا پاڵەوانانی ڕۆحانین و وەك مرۆڤەکانی دی دیلی کەراماتێکن کە خەڵکی دیکە پێی سەرسامن. لە کاتێکدا پێدەچێ ئەم پیاوە، لە کەراماتەکانی مەزنتر بێ. کەراماتێك کە هەرکام دنیایەك گەورەیین." **گاندی پەرستگە و مەزهەبێکی بنیات نەنا و گەرچی بە**



**ئیمانداری ژیا، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ بیروباوەڕێکی تەسك و دەمارگرژانەی لە دوای خۆی جێ نەهێشت تا پەیڕەوانی لەسەر کەلەپوور و سوننەتەکانی دەم لە خوێنی یەکتر بنێین و هەرا بنێنەوە. ئەو، سەرەڕای ئەوەی بە شێوازی خۆی بە قووڵی ئەمەگدار و بڕواداری ئەو ئایینە بوو کە لەگەڵیدا لە دایك ببوو، بەڵام هەر چەشنە بنەمایەکی ئایدیۆلۆژی، ڕێوڕەسم و عیبادەتی نائەخلاقی - کە لە ڕوانگەی ئەوەوە ڕەتکەرەوەی یاسای مەعنەوییەت و میهرەبانیی فراوان بێ - بەبێ ترس و ڕووبینی و بەرژەوەندخوازی ڕەت دەکردەوە.** هەر لە ساڵی **١٩٠٩** دا هاوڕێ باپتیستەکەی[٣]، *جۆزێف دۆك* لە بارەیەوە نووسی: "نازانم ئاخۆ هیچ سیستەمێکی ئایینی دەتوانێ کە هەڵفڕینی ڕۆح و ئەندێشەی ئەو بە شێوەیەکی موتڵەق ڕابگرێ؟ ڕوانگەی هێندە لە مەسیحیەت نزیکە کە پێناچێ بە تەواوی هیندوویی بێ و هێندە تژین لە هیندوویەتی کە ناکرێ ناوی مەسیحییەتی لێ بنێی، لە کاتێکدا هەست و سۆزی ئەوەندە بەربڵاو و باڵادەستە **کە مرۆڤ وا بیر دەکاتەوە گەیشتۆتە جێگایەك کە ڕێبازە فیرقەییەکانی لەلا بێ مانان."**

بیست و حەوت ساڵ دواتر گاندی خۆی، هەندێ لە هاوکارانی کە ئەنجومەنێکیان بە ناوی ئەوەوە دامەزراندبوو تا بیروباوەڕی ئەوی تێدا بڵاو بکەنەوە، بەم جۆرە ئاگادار دەکاتەوە کە: "شتێك بە ناوی *گاندی گەراییەوە* بوونی نییە. نامەوێ فیرقەیەك لە دوای خۆم جێبهێڵم. ئیدیعای ئەوە ناکەم کە بنەمایەکی فیکری یان تیۆرێکی نوێم داهێناوە. من تەنیا بە شێوازی خۆم هەوڵم داوە هەقیقەتی هەمیشەیی و تاهەتایی لەسەر کێشەکان و ژیانی ڕۆژانەمان تاقی بکەمەوە... ئەو ڕایانەی دەرمبڕیون و ئەو ئاکامانەی پێیان گەیشتووم، بە هیچ شێوەیەك یەکلاکەرەوە نین. ئەگەر سبەی بگەمە شتی باشتر، لەوانەیە بیانگۆڕم. هیچ شتێکم نییە فێری دنیای بکەم. هەقیقەت و ناتوندوتیژی بەقەد چیاکان کۆنن. ئەوەی کردوومە هەندێ تاقیکردنەوە بووە لەسەر

(٣) ڕێبازێکی پرۆتستان کە بڕوای بە ئەنجامدانی ڕێوڕەسمی بسمیلکردن (تعمید) دوای باڵغبوونی منداڵە نەك زووتر.

هەردووکیان، بە مەودایەکی تا بکرێ بەرینتر و بە باشترین جۆری مومکین کە لە توانامدا بووە. لەو پێناوەدا، هەندێ جار هەڵەم کردووە و پەندم لە هەڵەکانم وەرگرتوون... بەڵێ، هەموو فەلسەفەکەی من - ئەگەر بکرێ ئەو وشە پڕفریو و پڕئیدیعایەی بۆ بەکار بێنین - لەوەدا کورت دەکرێتەوە کە ئێستا گوتم. ئێوە نابێ نێوی لێ بنێن *گاندیگەرایی*، چونکە ئیمان بە قیبلەیەکی نوێ و *ئایدیۆلۆژییەکی نوێی* تێدا نییە. بۆ راڤەکردنیشی، وتار و پڕوپاگەندەی بە باقوبریقی ناوێ. لەبارەی منەوە، لە کتێبە پیرۆزەکان شتتان وەرگرتوون، بەڵام راشکاوانەتر لە هەر کاتێکی تر، پابەندی بڕوای پتەوی خۆمم کە هەقیقەت نابێ ببێتە قوربانیی هیچ شتێکی تر. ئەوانەی بڕوایان بەو هەقیقەتە سادانە هەیە کە من باسم کردوون، تەنیا بە هێنانەدیی ئەو هەقیقەتانە و ژیان لە هەناویاندا، دەتوانن پڕوپاگەندەی بۆ بکەن، نەك بە وتە و بانگەشە و پڕوپاگەندەی لە بەرژەوەندیی ئەم یان ئەو باوەڕ." گاندی هیچ تایبەتمەندییەکی دیاریکراوی بۆ خوا دانەنا جگە لە *هەقیقەت* و هیچ رێوڕەسمێکی بۆ گەیشتن بە خوا پێشنیار نەکرد، مەگەر گەڕان و پەیدۆزی شەرافەتمەندانە و بێ ئامان، بە ئامرازێك کە هیچ بوونەوەرێکی زیندوو تووشی زیان نەکات. کێ دەوێرێ ئیدیعا بکا گاندی تەنیا بۆ خاتری خۆی هەوڵی دەدا، جگە لەوەی دانی پێدا بنێ کە ئەو بۆ هەموان تەقەللای داوە؟

ئەو راستییەش کە گاندی وەها لەدایك نەبوو کە دواتر **پێی گەیشت** خاڵێك نییە لە خاڵەکانی دیکە کەم بایەختر بێ. ئەگەرچی لە تەمەنی ژووروودا گۆڕانی بەسەر خۆیدا هێنا، بەڵام لە ساڵانی سەرەتای ژیانیدا، هیچ بەهرەیەکی سەرووئاسایی لە خۆی نیشان نەدا کە منداڵە هاوتەمەنەکانی تێیاندا نەبێ و بە پێچەوانەی کەسانێکی بەرجەستە لە هاوچەرخانی خۆی، هیچ ئەندێشەیەکی پێ ئیلهام نەدەکرا. وەك چۆن رابیندرانات تاگووری لاو خاوەن بەهرەیەکی وا بوو. ئەو نە بە دەم خەونە پڕ لە



نهێنییەکانی *راما کریشنا*وە[٤] دەتلایەوە، نە بە دەمارگرژیی تۆخی نێو پەندەکانی *ڤیڤێ کاناندا*[٥] خوێنی وەکوڵ دەهات. منالێکی ئاسایی بوو، وەك هەموو منالێکی دی. خاڵی شیاوی باس ئەوەیە کە لە زۆر منداڵان کەم زەینتر و لە زۆربەیان فەقیرۆکەتر بوو و بە هۆی شەرمنیی لە رادەبەدەری، دەچەوسێنرایەوە. شەرمێك کە وەك گرێی دەروونی، تا ماوەیەکی زۆر ئازاری دا.

جگە لە ترسنۆکی و بڕوا بەخۆنەبوون، ناشیرینیی روخسار، مامناوەندی بوون لە خوێندن و بە گشتی مومتاز نەبوون، وەك منداڵێك یان مێرمنداڵێك، شتێکی تر لە رواڵەتی جەستەی یان توانای فیکریی ئەودا نەبوو کە نیشانەی هێزی شاراوەی بورکانی جاری خامۆشی دەروونی وی بێ. لەو رووبەرە ئارامەوە گرمەی هیچ خرۆشانێکی خەوتوو نەدەبیسترا، نە ئاورینگێك دیار بوو نە دووکەڵێك تا نیشانەی شمشێرێکی ئاگرین بێ کە لە سەر سندانی وجوودیدا خەریکبوو شکڵی دەگرت. رەنگە ویستی یەزدان بووبێ کە خوا لەبەر ئێرەیی شەیتان، چەکێکی دەگمەن کە بە پەنامەکی دروستی دەکرد و بۆ ئەوەی لە چاوی شەیتانی بە دوور بگرێ، لە کالانێکی هێند پەڕپووتدا بیشارێتەوە سەرنجی هیچ کەس رانەکێشێ. تەنانەت کالانەکە خۆشی لەبارەی ئەو ئاگرە خامۆشەی دەروونی یان ئەو چارەنووسەی کە بۆ داهاتووی، خۆی لە بۆسە نابوو، هیچ سەرەداوێکی بە دەستەوە نەدەدا. هیچ هۆشیارییەکی تایبەت و تەنانەت کردەوەیەکی نائاسایی، هەواڵی دەرکەوتنی بلیمەتێکی لە بیچمی هەرزەکارێکی بە رواڵەت ئاساییدا، رانەدەگەیاند. شەپۆلی هیچ خرۆشانێکی چاوەڕواننەکراو، رووبەری هێمن و یەکهەوای منداڵیی بێ رووداو و ئاسایی ئەوی

(٤) Rama krishna 1836-١٨٨٦: پیاوچاکی بەنگالی، دامەزرێنەری فیرقەی راما کریشنا، باوەڕمەند بە یەکگرتوویی ئایینەکان.

(٥) Vive kananda 1873-١٩٠٣: بەناوبانگترین شاگردی راما کریشنا، فەیلەسووف و نووسەری بەنگالی بڵاوکەرەوەی رێبازی ودانیست و ئەندێشەکانی راما کریشنا لە دنیادا.

نەدەهەژاند و هیچ تامەزرۆییەکی لەرادەبەدەر لە قووڵایی نائاگای ئەوەوە دزەی نەدەکردە دەرەوە.

مێرمنداڵێك کە لە نائاگای خۆیدا هەستی بە بەختەوەری دەکرد، لە هەموو قەیرانێکی بەر لە باڵغبوون کە هەوێنی کامەرانی و هەروەها ناکامیی گەلێ لە بلیمەت و پێغەمبەران بووە، دوور بوو، تا ئەوەی بیر و کەسایەتیی ئەو گوڵی کرد و توانی بەرگەی تەوژمی تەقینەوەی ناخی خۆی بگرێ، ئەو کاتە بوو کە ئەم قۆناغەی بە ئازایەتی و بێدەربەستی، بە بێ خۆدزینەوە، بە بێ فیز و رۆحزلی و بێ شەرفرۆشی دەستپێکرد.

راستە هەستکردن بە جۆرێك وەفاداری بەرامبەر بە دایك و باوك، ئەرکناسی و خۆدوور گرتن لە ناڕاستی، لەم قوتابییە رووتەڵەیەدا دیار بوو، بەڵام لە کەشوهەوای کۆمەڵایەتیی پەروەردەی ئەودا، ئەو تایبەتمەندییانە زۆر نائاسایی نەبوون. ئەوی لەودا بە راستی سەرووئاسایی بوو، لە قووڵایی رۆحی ئەودا شاردرابۆوە کە لەو تەمەنەدا، بە زەحمەت نیشانەیەکی دەردەکەوت.

کەوابوو بە زانینی ئەم راستییە کە ئەگەر ئەو لاوە ئاساییە بە یارمەتیی کرداری رێکوپێکی ئیرادە گەیشتە جێگایەك کە ئێمە دەیزانین، هەر مرۆڤێکی ساکاری دیکەش رەنگە تانووت لە خۆی بدا کە باشە بۆچی من نابێ بتوانم لەو کارەدا سەرکەوم. **ئەگەر کورپژگەیەکی ترسنۆك کە بە بێ چرا ناوێرێ بچێتە ناو پێخەفەوە: "وا بیر دەکەمەوە تارماییەکان لە لایەکەوە و دز لە لایەکی تر و ماریش لە لایەکەی دیکەوە بۆم دێن" بتوانێ ببێتە یەکێك لە بوێرترین مرۆڤەکان، بۆ هەموو مرۆڤێکی دیکەش هیوایەك هەیە.**

ئەگەر باسی بلیمەتیی گاندی بکەین، ئەو بلیمەتییە لە سووربوون و پێداگریی ماندوونەناسانە و چاونەترسانەی ئەو، لە شان خستنە بەر ئازار و مەینەتی لە پێناوی ملکەچی بەرامبەر بە ویستێکی گڕگرتووی ئەخلاقییەوەیە. ژیانی وی دوای بڕینی قۆناغی گەنجێتی، رێگەبڕینێنکی دوورودرێژ و خەباتێکی نەپساوە و گەڕانێکی بێ



ئۆقرە و بێ خۆگنخاندن بووە لە پێناو دۆزینەوەی هەقیقەتدا. هەقیقەتێکی نەك ئەبستراکت و خەیاڵی و میتافیزیکی، بەڵکو هەست پێکراو، لە چوارچێوەی پەیوەندیی رۆژانەی مرۆڤدا. گاندی هەنگاو بە هەنگاو هەڵکشا، بە هەنگاوێك کە لە هی مرۆڤی ئاسایی گەورەتر نەبوو، تا ئەوەی ئەومان لە جێگەیەکدا بینییەوە کە لە مرۆڤێك زیاتر بوو. *ئەلبێرت ئەنشتاین* کە خۆی بە تەنیایی لە هزری مرۆڤی ئەم سەدەیەدا بورجێکی بڵندە، لە بارەی گاندییەوە وەهای نووسی: **"رەنگە ئەو نەسلانەی لە داهاتوودا دێن، بە زەحمەت بڕوا بکەن کە مرۆڤێکی وا بە جەستەیەکی بریتی لە گۆشت و پێست و خوێن هەر بە سەر ئەم خاکەدا هەنگاوی نابێ."**

ئەگەر لە دوادواییەکاندا، گاندی وەك هیچ مرۆڤێکی دی نەدەهاتە بەرچاو، وا باشترە وەبیر خۆمانی بێنینەوە کە سەرەتا ئەویش وەك مرۆڤەکانی دیکە بوو.

جوانیی بێهاوتای ژیان و هزرەکانی لەم خاڵەدا خۆی حەشار داوە. بە خۆشییەوە ئەم خۆی، رووداوە سەرەکیەکانی بۆ تۆمار کردووین. تا ئەوەی کە بە حزووری هەمیشەیی خۆی لە ناو خەڵکدا، تا رادەیەکی زۆر هەر جۆرە سنوورێکی تاکەکەسی و شەخسیی خۆی وەلا نا. گاندی بە دیقەتێکی مووقەڵێشانە و راستگۆییەکی چاونەترسانە، گەشەکردنی ویژدان و وشیاریی ئەخلاقی و سیاسیی خۆی روون کردۆتەوە. ئەگەر وا نەبوایە، لە وڵاتی خۆشباوەڕی هیندا کەم نەبوون ئەو مێژوونووسە دەروێشانەی کە هەندێ نیشانەی پڕنهێنی لەبارەی موژدەی خواوەند بۆ لە دایکبوونی گاندی دابتاشن و تەنانەت هەر لەو کاتەدا کە کۆرپەڵەیەك بووە لە پزدانی دایکیدا، تریفەیەکی خواییشی لە دەوری سەری بکێشنەوە. دەمخۆش تاگوور لەو بارەوە چ جوانی گوت:

گەورەم!

**تۆ خۆت، بە سادەیی دەدوێی... نەك ئەوانەی لە تۆ دەدوێن.**

گاندی پیاوچاك بوو یان سیاسەتڤان؟ ئایا پیاوچاکێك بوو لە ناو سیاسەتڤانان یان سیاسەتڤانێك لە ناو پیاوچاکاندا؟ ئاخۆ یەك کەس دەتوانێ هەڵگری ئەو دوو سیفەتە بێ؟

ئایا ئەو توانی رۆحی دلۆڤانیی بە بەر جەستەی گەندەڵی سیاسە، ئەو جۆرەی کە پەسندەرانی دەیلێن؟ ئاخۆ ئەو نەتەوەیەی، گاندیی بە باوکی خۆیان لە قەڵەم دەدەن، تا ئێستا بووەتە شایەدێکی ئەم وتەیە؟ ئەمانە پرسیارگەلێکن کە خەڵکانی داهاتوو دیسانەوەش دەیانکەن.

لەو نێوەدا، هەموو ئەو شتەی کە دەکرێ بیلێین ئەوەیە کە ئەو هەر چییەك بێ، لەگەڵ هیچ مرۆڤێکی هاوچەرخی خۆیدا لەیەك کر نەبوو. تاگوور دە ساڵ بەر لە مردنی گوتی:

"رەنگە سەرنەکەوێ، رەنگە شکست بێنێ، هەر وەك بوودا تێشکا، هەر وەك مەسیح شکستی خوارد، هەر وەك ئەوان نەیانتوانی بەر بە بەدفەڕیی مرۆڤ بگرن، بەڵام ئەو بۆ هەتاهەتایە، وەك کەسێك کە ژیانی خۆی کردۆتە وانەیەك بۆ هەموو چاخەکانی داهاتوو، لە بیری خەڵکدا دەمێنێتەوە."



## بەشی یەکەم

# دنیا چی لێقەوماوە؟

لە پەنجا ساڵی رابردوودا دنیا گەشەسەندنێکی ئیلهامبەخشی بەخۆیەوە بینیوە، بەڵام ئەو گەشەکردنە هاورێ لەگەڵ دڵنیایی لە ئاشتی و باشیی بژێودا نەبووە.

گۆڤار و رۆژنامەکان لە ساڵانی دوای شەڕی یەکەمدا (١٩١٩و١٩٢٠) پڕ بوون لە پێشبینیی بەجێ و ماقووڵ لەمەڕ هەڵایسانی شەڕی دووەمی جیهانی. لە گەرمەی شەڕی دووەمی جیهانیدا و دوای بڕانەوەشی و تا ئێستاش (١٩٤٧)، باسوخواسی زۆر لەبارەی سێهەمین پێکدادان بەسەر زارانەوەیە. ئەمڕۆکە بێ متمانەیی بە ئاشتی و ئارامی، گەورەترین نیگەرانیی مرۆڤە.

دکتۆر *چارلز ئێف. کێترنیگ* جێگری توێژینەوەیی کۆمپانیای جەنەڕاڵ مۆتۆرز و سەرۆکی ئەنجومەنی ئەمریکایی پێشکەوتنی زانست، لە جێگایەکدا دەڵێ: "ئێمە زانستی دابینکردنی خۆراکی پێویست بۆ هەر دوو ملیار دانیشتووەکەی زەویمان هەیە، بەڵام سێ لەسەر چواری حەشیمەتی دنیا - واتە ملیار و نیوێك پیاو و ژن و منداڵ - خۆراکی پێویستیان نییە." هەژاریی دەستکاری مرۆڤ، بەڵام قابیلی چارەسەر، دووەم نیگەرانیی گشت مرۆڤە.

بەشی هەرە زۆری مرۆڤایەتی لە ترسان و لە برسان ئازار دەچێژێ. مرۆڤایەتی، لە لێفەیەك لە نائارامی وەرپێچراوە.

حکوومەت و دیپلۆماتەکان بە چاکی هەست بەو نائارامییە دەکەن. خەڵکانی ئاساییش، بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن، بە پێداگری لەسەر فەرامۆشکردنی یان بە پەلەقاژەیان بۆ گەیشتن بە تەناهی، بوونی ئەو نائارامییە ئاشکرا دەکەن. نائارامیی

سیاسی و ئابووری، کاریگەریی لەسەر مێشك و جەستە و خووخدە و ئەخلاق و کار و کاسبی و هەڵبژاردن و یاساکان هەیە.

خەڵکانێك بۆ پاراستنی هەستی ئاسایشی ئابووری پارەی پێویستیان هەیە، بەڵام دەزانن کە ئاشتی و تەناهی جێی متمانە نین. ئەوان باش دەزانن ئاشتی ناسەقامگیرە و ئاگا یان نائاگا تێدەگەن کە سەرباری ئەو راستییە کە زانست و پیشەسازی دەتوانێ هەموو پێداویستییەکانی مرۆڤ دابین بکا، بەڵام لەکاتێکدا لە سەرانسەری دنیادا خەڵکی برسی و رووت و رەجاڵ و بێ ئەنوا هەن، چاوەڕوانیی هەبوونی ئاسایش چەندە هەڵەیە.

بوونەوەرێکی بێهیوا کە بە بێوەڵام مانەوەی ئاشکرای کێشە گەورەکان و دەستەوەستانی بەرامبەر دۆزینەوەی وەڵام بۆ پرسیارە گرنگەکان تووشی سەرلێشێواوی بووە، ئاسایش لە چێژوەرگرتندا دەبینێ یان وەدوای هەر کەس یان شتێك دەکەوێ کە لە رواڵەتدا سەقامگرتوو، بێبەری لە هەڵە و پڕ جموجووڵە و بەڵێنیی زۆریش دەدا. نائارامی، رووکردنە موتڵەقگەرایی سیاسی و ئایینی لێدەکەوێتەوە. زۆربەی ئەوانەی ناشادن، ئازادیی خۆیان دەبەخشن تا لە بری ئەوە ئیمکانی شادی دەست بخەن. نائومێدی یارمەتیی پاوانخوازی دەدات. خەڵکانی هەژار و ترساو و داماو و ناهومێد، پارووی نەرم و حازری ستەمکارانن. ئاشتیی سەقامگیر و فرەیی بژیو و رەفاهیەت کۆتایی بە ستەمکاری دێنێ.

جیهان لە قەیراندایە و دڵتەزێنترین رووی قەیرانەکە، ئامادەیی زۆربەی مرۆڤان بۆ قوربانیکردنی ئازادی و ئەخلاقە بە هیوای گەیشتن بە ئاسایش: مۆسۆلینی کاتژمێری بەرێکەوتنی شەمەندەفەرەکانی رێکوپێك کرد، قەیدی چییە ئەگەر ئازادیی سەرکوت کرد؟

نەیارانی بە رۆن گەرچەك کوشتن، بەندیخانەکانی ئاخنین و بۆ بە شارستانیکردنی ئەتیۆپی گازی ژەهراوی بەکار هێنا، ئەمانە هەمووی قەیدی چییە؟ هیتلەر، بە قەولی



رۆژنامەکەی[٦] لە سەری ساڵی ١٩٣٩دا: دایکان: سوبسیدی حکوومی، منداڵان بیمە، کرێکاران پیشەی تەواو، نیشتمانپەروەران: ئیجازەی بە مووچەوە و هۆڵی خواردنگەی کارگایان: سیمفۆنی داونەتێ. جا ئەگەر نەتەوەیەك بکاتە کۆیلە و مرخ لەوە خۆش بکا لە دنیادا خوێن سەران بەرێ، بە لای ئەڵمانەکان و خەڵکی دیکەوە چ قەیدییە؟

پۆڵای زیاتر، خشتی زیاتر، چەکی زیاتر، دیسپلینی زیاتر و تەخشان پەخشانی زیاتر مایەی فیز و خۆڕانانی هەموو ستەمکارێکە. سیستەمی ستەمکاری (ئیستبدادی)، تەنگ بە هاووڵاتییەکانی هەڵدەچنێ و دەیانکاتە هاونشینی هەڕەشە و تۆقاندن، بەڵام هاوکات ئاماژە بە سەرەنجامیش دەکا کە بەڵێنی بەهەشت و سەروەریی نەتەوەییە. لەو ناوەدا پێشڤەچوونی زۆر کەم بەرەو دواڕۆژی وادەدراو بەدەستدێن. لە روانگەی ستەمکارەوە، ئازادی و بەهاکان لە هەمبەر دووسایدێکی پانوپۆڕ و کارگەیەکی تراکتۆرسازی یا کوورەیەکی قیتی تواندنەوەی ئاسندا هیچ نرخ و بایەخێکیان نییە.

دیوارێك هەڵدەچنرێ، دیوارێکی تر، کەمێ دواتر سێهەمین و ئینجا چوارەم، پاش کەمێکی دی دروستکەرەکەی لە زیندانێکدایە کە ژیان لەوێدا بە کاری قورس و درۆ رایی دەبێ. فیرعەونە نوێیەکان بە یارمەتیی کۆیلان ئەهرامیان دروست کردوون کە کۆیلەکانیان سەرەڕای ئەوەی پێشتر تامی کۆیلەتییان چێشتووە، بە خۆشحاڵییەوە، ٤٠ ساڵ وەك بەنی ئیسرایلییەکان بە بیابان و قاقڕاندا دەخولێنەوە، بۆئەوەی بگەنە ئۆردنی موژدەپێدراو (وڵاتی ئازادی). ئەو هەرەمانە کۆمەڵە مۆمیاییەکیان لە ناودان کە: رەمزی ئاسایش و نهێنیکاریی دژی کەرامەتی ئینسانی و هەروەها نیشانەی دەسەڵاتی فیزیکیی دژە ئەخلاقین...، بەڵام لە تەنیشت ئەو هەرەمانەدا، ئەمە ئەبولهولە کە کڕوکپ و گوماناوی، دانیشتووە بزانێ داخوا ئەنجامی پاڵەوانبازییەکە بە کوێ دەگا.

گەلان رەنگە لە پێناوی چەکدا دەست لە نان هەڵبگرن و لە ئەنجامی تینوێتییان بۆ ئاسایش، ببنە دڕندەی دژە ئەخلاق. بەڵام ئەمڕۆکە ئەڵمانی نازی لە چ حاڵێکدایە؟

---

(6) Voelkischer Beobachter .

گەلان رەنگە بە نرخی تێکدانی ئاسایشی نەتەوەی بچووکتر و راماڵینیان بۆ گۆڕەپانی دەسەڵاتی خۆیان کەمە ئاسایشێك وەدەست بێنن، بەڵام زۆری پێناچێ ئەو جانەوەرە بتەهەوێ و نەتەهەوێ لەگەڵ جانەوەرێکی دی دەگەنە یەکتری و قسەی تێدا نییە ئانگژای یەکتر دەبن.

لە کاتێکدا پۆلیسی نهێنیی دەسەڵاتداری ستەمکار دەتوانێ ئازادیمان لێ زەوت کا، چۆن دەشێ باسی ئاسایشی تاکەکەسی بکەین؟ ئاسایش لە سێبەری رژێمێکدا کە هیچ کەڵکەڵەیەکی ئەخلاقی نییە و لەبەر ئەوە لێپێچنەوە هەڵناگرێ، چتۆ ئاسایشێکە؟ لەگەڵ هەمووی ئەوانەدا، هەر ئەو بانگەشەیە کە دیکتاتۆر، خانوو و کارگایان دروست دەکا و ئاسایش دەپارێزێ، لە زۆر شوێن و لای زۆر کەس شەرعیەتی پێدەدرێ.

قەیرانی سەردەمی ئێمە لە بنەڕەتدا ئەخلاقییە. ئێمە لە دنیایەکدا دەژین کە تێیدا خۆشویستنی ئازادی، پەنا بردن بۆ بەها بەرزە ئەخلاقییەکان، بەرگەگرتنی زەحمەتی و ئازار و، رێزگرتن لە وەچەی مرۆڤ، رووی لە کزی کردووە. ئەمە خاڵێکە کە لە هەموو شتێك زیاتر شکستی سیاسەتوانان رادەگەیەنێ. دادگایی و ئیعدامکردنی ساکۆ - ڤانزەتی[7] ئەمریکا و دنیای هەژاند. دادگاییکردنی تام مۆنەی[8]ش هەروەتر. بەڵام

---

(٧) Nicola Sacco (؟–١٩٢٧) و Bartolomeo Vanzetti (1888-1927) دوو کەسی کۆچبەری ئانارشیستی ئەمریکی بە رەچەڵەك ئیتاڵی بوون کە ساڵی ١٩٢٠ بە دزی و مرۆکوژی تۆمەتبار کران. ڤانزەتی پینەدۆز و ساکۆ ماسیفرۆشی دەستگێڕ بوو. دادگاییکردنی ئەو دوو کەسە ماوەی ٧ ساڵی خایاند و لە ساڵی ١٩٢٧دا حوکمی ئیعدامیان بۆ دەرچوو. رەوتی دادگاییکردنەکە، نارەزایەتیی رادیکاڵ و چەپ و رووناکبیرانی ئەمریکا و ئەوروپای هەڵایساند و باسی مافی کۆچبەر و جودابیرانی لە وڵاتانی رۆژئاوادا، کردە بابەتی هەرە سەرووی باسوخواسی جووڵانەوە چەپ و مافی مەدەنیی کەمایەتییەکان.

نارازییەکان رایان وابوو کە ئەو دوو کەسە بە هۆی بیروباوەڕیانەوە دادگایی دەکرێن. گرنگیی دادگایی ئەوانە بۆ مێژووی هاوچەرخی ئەمریکا تەنیا بە دەستەواژەی مێژووساز دەکرێ هەڵبسەنگێنرێ. ئەمریکای پێش و پاش ئەو دادگایی و ئیعدامە (٢٣ی ئووتی١٩٢٧) بە دوو ئەمریکای جیاواز ناسران. گەلێك کتێب لەبارەی ئەو رووداوەوە نووسران، چ وەك شرۆڤەی یاسایی یا مەدەنی و بیۆگرافی و چیرۆك و ... دنیای شیعر و گۆرانییش رووی کردە ئەو بابەتە. فایلی ساکۆ —



ئێستا وای لێهاتووە کوشتوبڕی دەیان هەزار کەس رێگەی ناکەوێتە ناو دەنگوباسەوە. تاوانەکانی پۆلیسی نهێنیی سۆڤیەت لە سیبریا، ئازاردانی کۆیلان لە کۆنگۆی بەلژیکا، جوولەکە قڕان و رەشەکوژیی ئەرمەنییەکان، گەلانی دوورەدەستی لە سەدەی نۆزدە و یەکەم دەیەی سەدەی بیستەم تووشی خرۆشانی گەرموگوڕ کرد. بەڵام ئەورۆکە بوونی ملیۆنان کەس لە ئۆردوگا بەکۆمەڵەکاندا (ناوی رواڵەتیی ئۆردوگاکانی مەرگی هیتلەر) و ئۆردوگاکانی کاری زۆرەملیی ستالین، بە دەگمەن تەنانەت دەبنە هۆی ساتێك بیرکردنەوەی خامۆش. لە گرانییەکەی ساڵی ٤٣-١٩٤٢ی بەنگالدا، بە لای کەمەوە

---

ڤانزەتی تا ئێستاش لە ئەمریکا کراوەیە و ئێستاش کتێبیان لەبارەوە دەنووسرێ. فیلمێکی بەناوبانگیش بەناوی ساکۆ — ڤانزەتی لەبارەی دادگاییکردنەکەیان دروست کرا کە گۆرانیی دڵنشین و حیماسیی Joan Baezی لەگەڵدایە. ئەمانە بە تەنیایی نیشانەی قورس و قایمن لەسەر هەبوونی کەرامەتی کەمتاکورتی تاکی مرۆڤ و "ئینسان وەك ئینسان" لە فەرهەنگی خەڵکی ئەمریکادا، بە بەراورد لەگەڵ بێبایەخیی کۆمەڵی مرۆڤە جیهانی سێیەمەکان لە فەرهەنگی کردەیی و رەفتاری رۆژانە و مێژوویيان بەرامبەر یەکتری و لە بەر چاوی ستالینە یەك دەرسەدی تا سەد دەرسەدییە دەسەڵاتدارەکانیان و لە ناو خۆیاندا و لە تۆرەمەی خۆیان.

ڤانزەتی لە دوا وتووێژی خۆیدا بەر لە مردنی، بە رۆژنامەنووسێکی گوت:

"ئەگەر لەبەر ئەو رووداو و تۆمەتە نەبوایە، تەمەنی خۆم لە سووچی شەقامان و بە چەنەبازی لەگەڵ خەڵکی رەشۆکدا بەسەر دەبرد. واتە لەوانەبوو ژیانم گومناو و بێ شەقڵ و چیرۆکی شکستێك بێ، بەڵام ئێستا ئێمە تێشکاو نین. ئەمە ژیان و پیشە و سەرکەوتنی ئێمەیە. ئێمە هەر بە خەیاڵیشماندا نەدەهات لە هەموو تەمەنماندا بتوانین دەورێکی وا بۆ تەبایی و دادپەروەری و تێگەیشتنی مرۆڤ لە مرۆڤ بگێڕین، کە ئێستا بە هەڵکەوت گێڕاومانە. وشەی ئێمە، گیانی ئێمە و ئازارەکانی ئێمە گرنگ نین، ستاندنی گیانی ئێمە — گیانی پینەدۆزێکی کارامە و ماسیفرۆشێکی دەستگێڕ- گرنگ نییە، گرنگ ئەوەیە کە دوا چرکەسات هی ئێمەیە. ئەو ئێش و ئازارە، سەرکەوتنی ئێمەیە."

لە رۆژی ئیعدامکردنیاندا، ٢٥٠٠٠ کەس لە رێپێوانێکی بێدەنگدا بە نیشانەی پرسە، لە بۆستۆن کۆبوونەوە.

(٨) تام مۆنەی (Tom Money,1892-1942) چالاکی سەندیکاکانی کرێکاری و رێکخەری یەکێتیی سۆسیالیستەکانی ئەمریکا کە بە دەست هەبوون لە پیلانی تەقینەوەی خوێناویی ساڵی ١٩١٦ تۆمەتبار کرا و لەسەر ئەوە ماوەی ٢٣ ساڵ لە گرتووخانەی کالیفۆرنیادا بەند کرا.

یەك ملیۆن كەس لە برسان مردن. هیتلەر ٥ ملیۆن جوولەكەی كوشت. هەر لەم ساتەدا ملیۆنان كەس لە چین و هیند و ئەوروپا برسیەتی دەچێژن. تیتۆ، فرانكۆ، سالازار، پرۆن و دیكتاتۆرەكانی دی مافی بندەستانی خۆیان پێشێلدەكەن. زوڵم و زۆری نەتەوەیی لەگەڵ پەرەگرتن و وەهەرمێن كەوتنی نەتەوەخوازیدا گەشەی كردووە.

تراژیدی و دڵڕەقییەكانی دنیای دەوڵەمەند و پێشكەوتوو و نوێی ئێمە هێندە بەربڵاو و فرە رەنگە كە لە بەر چاو و سۆزی زۆربەی خەڵك بزرە، یان رەنگە بە ئەنقەست لە زەینی خۆمانی بسڕینەوە تا دژكردەوەیەكی بەرگریكەرانەمان لە خۆمان نیشان دابێ. ئەگەر ئەو بارودۆخە هەردەم لە زەینماندا زیندوو بوایە، مەحاڵ بوو مرۆڤ بتوانێ بەرگەی ئازار بگرێ و نەمرێ.

هەندێك مرۆڤ لەگەڵ دڵڕەقی و بێبەزەیی و ئازار رادێن، هەندێكی تر بەرگەی ناگرن. كەسی ناسك ئەغڵەب دەڕووخێ و تێكدەشكێ، یان پەنا دەباتە بەر گوێ پێنەدان و لاپرەسەنی و بێخەمی، یانژی سەر دەباتەوە نێو قاوغی تەنیایی و گۆشەگیری. چاكیش دەزانێ لە دەرەوەی ئەو پەناگە شەخسییەدا چەند كلۆڵ و داماوە. لەبەر ئەوەیە كە لەو دۆخەدا، بێمەیلییەكی بەربڵاو بەرامبەر بە **كردەوەگەریی سیاسی** یان بەشداریی جددی لە **رێكخراوەكانی كەمكردنەوەی ئازار و نەهێشتنی شەڕ** لە ئارادایە. بەڵێ ئێمە پارەیەكی چرووك یان كاتژمێرێك دەبەخشین، نەك زیاتر. بەڵام ئەوە ئەو شتە نییە كە لە چاو گەورەیی ئەرك دەبێ ئەنجام بدرێ.

هەرچی مرۆڤ زیاتر دەست لەسەر دەست دابنێ، بەو رادەیە گرفتی زیاتر سەر هەڵدەدەن و مەیدانێكی بەرینتر بۆ تەڕاتێنی زمانلووس و زۆرداری دەستڕەش و پیاوكوژ و دەستبڕی سیاسی چۆڵ دەبێ. گرفت بە دوای گرفتدا دێن، هێند لە ناكاو كە بیركردنەوە لە رێگەچارەی بنەڕەتی زەحمەت دەبێ. سیمینار بە دوای سیمیناردا دێ، بە پەلە، ئامادەكرنی رەشنووسی پەیمانان ئەوەندە وزەی زەین و كاتی دیپلۆماتان دەبا چاویان ئیتر ئامانجە سەرەكییەكان نابینێ.



مەودای نێوان جەنگی جیهانیی یەكەم و دووەم بە كۆبوونەوەی "سەركەوتوو"، پەیمانی ئاشتی، وتاردان لەمەڕ قازانجەكانی هەڤاڵەتیی نێونەتەوەیی، باسوخواسی چەك داماڵین و بەڵێنی باشبوون تێپەڕی: پەیمانی لۆكارنۆ، سواری، كلوك —بریاند، لەبارەی قەدەغەكردنی شەڕەوە لە ساڵی ١٩٢٨ و میونیخ لە ساڵی ١٩٣٨دا. ئەو بەزمە سەرۆك وەزیری وڵاتانی بە توندی بە خۆیەوە سەرقاڵ كرد. دوای هەر كۆنفرانسێكی نمایشی، دیپلۆماتەكان لە خۆشییان خەنی بوون و هاواری گەشبینییان لێ هەستا، بێ ئاگا لەوەی لەو نێوەدا جەنگێك خۆی مەڵاس دابوو.

سیاسەتە نێودەوڵەتی و ناوخۆییەكان زۆربەی جار بە شێوەی كۆنفرانس، پەیمان، بڕیارنامە، بازرگانی، بەخشینی ئیمتیازی نەوتی، حیزبەكان، دەنگدان، یاسا، نرخ، باج، دامەزراندن و هیتردا دەبینرێ. ئەو روانینە ناڕاست نییە، بەڵام بە بێ لەبەر چاوگرتنی رۆحی مرۆڤ و لایەنە ئەخلاقییەكانی، شتێكی نیوەچڵە. سیاسەت بەر لە هەموو شتێك پێویستی بە تۆكمەیی و هاودڵیی بەرەنجامی بنەماكانە. بەڵام هەڵسوكەوتی **تیۆرداڕێژە شڕەخۆرەكانی سیاسەت** سەلماندوویە كە راستییەكە لە كردەوەدا وا نییە. لەو نێوەدا پابەندبوون بە بنەما ئەخلاقییەكان، دەتوانێ هاوئاستی و یەكپارچەیی كەسێتی و یەكڕوویی شەرەفی رەفتاری بەدی بێنێ.

مرۆڤایەتی، پێویستی بە هاوسەنگی لە نێوان **سیاسەت** و **بنەماكان** و لە نێوان **كردەوە** و **بنەماكان** لای تاكەكانە. زۆربەی كات ئەو دووە بە یەكتری نامۆن. بە جۆرێك كە هەموو شتێك تەنیا بە پێی ئاكامی بەرژەوەندییەكان لێكدەدرێتەوە: "ئەدی من (ئێمە) چیمان پێدەبڕێ؟"

لە حكوومەتی ستەمكاریدا، سیاسەت و بنەماكان دوژمنی یەكترین. ئامانج، پیرۆزیی بە هەموو جۆرە ئامرازێك دەبەخشێ. رەنگی پیرۆزیی لە شەڕ و درۆ و تاوان هەڵدەسوێ. بەڵام دیموكراسی، بە گوێرەی پێناسە و رۆحی خۆی، دەبێ بەرامبەر بە هەڵبژاردنی ئامراز و شێوازەكان سەختگیرتر بێ.

سەرۆکی فەرماندە ستالین و، مەهاتما[٩] گاندی نموونەیەکن لە تیژ و ئەنتی تیژی نێوان ستەمکاری و دیموکراسی. ئەم ئەنتی تیژە گەورەترین ئەنتی تیژە لە دنیای نوێدا.

لە روانگەی جۆزێف ستالین، ستەمکاری کۆمۆنیست، کەڵەگای هەموو رووسیا، بلیمەتی رێکخستنەکان و مامۆستای دەسەڵاتەوە، سیاسەت ئامانجە. ئامرازەکان گرنگ نین. پەیمان لەگەڵ هیتلەر؟ ئۆردوگای مردن؟ کۆیلەکردنی وڵاتە بچووکەکان؟ ئەمانە گشتی کاری چاکن، ئاخر ئامرازێکن لە خزمەتی یەك ئامانجدا، واتە ئامرازی بەدەستهێنان و پاراستنی دەسەڵات.

لە دیدی مرۆڤێکی وەکو گاندییەوە کە هەم پیاوی خوایە و هەم پیاوی سیاسەت، خاوەنرایە و سۆسیالیستێکی ئامانجدار و ئاشتیخواز، سیاسەت و بنەماکان لێکدی جیاواز نین.

ئەو دوو پیاوە بە لایەنگەلی ئەوپەڕ جیاواز بەرامبەر بە مرۆڤ، بە **ئامرازەکان** و بە **وشەکانی** خۆیانەوە هەر یەکەو رێگایەکیان گرتۆتە بەر و لێکتر دوور دەکەونەوە.

دەشێ لە "گاندی"دا ئاشتی و ئارامی بدۆزینەوە.

(٩) MAHATMA: نازناوێکە بە مانای رۆحی مەزن، کە گاندی خۆی لە بارەیەوە دەڵێ: "من خۆم بە شیاوی نازناوی مەهاتما نازانم. هەرچەند ئێستا لەگەڵ حکوومەت نێوانم نییە، بەڵام ئەگەر بێتو حکوومەت یاسایەك دابنێ کە هەر کەس من بە مەهاتما ناو ببا و بە لاقمدا بنووسێ [بە پێی دابی هیندییەکان بە مانای رێزگرتن] بە تاوانبار دابنرێ، من بە خۆشحاڵییەوە بۆ پەسندکردنی ئەو یاسایە هاوکاریی حکوومەت دەکەم. لە ئەشرام (ماڵی ئایینی)ی خۆمدا کە دەتوانم هەندێ یاسا و رێسا دابنێم، ئەو جۆرە کارانە تاوانن... لەبەر هەستی ستایشی بە لێشاوی خەڵك بەرامبەرم بەراستی نەخۆش بوومە. ئەگەر تفیان لە رووی کردبام حاڵم لەوەی کە هەیە باشتر دەبوو. ئەودەم رەنگە هێندە پێویستیم بە دان پێدانانی زۆر و کاری ناراستی تر و پێداچوونەوە بە دۆخی خۆم نەبوایە." بەهەرحاڵ ئەو نازناوە بە پێچەوانەی خواستی خۆی لە سەرتاسەری دنیادا ناوبانگ و مەقبوولیەتی پەیدا کرد. پێداگریی توندی گاندی لەسەر ئەو مەسەلەیە زۆر هەژێنەرە و خاڵێکی ئێجگار سەرنجڕاکێشە بۆ بەراورد و خوێندنەوەی بەراوردکارانەی سیماکانی مێژوو.



## بەشی دووەم

# سیاسەت و بێدەسەڵاتان

*موهانداس کرامچەند گاندی* هەفتەنامەیەك بە زمانی ئینگلیزی بەڕێوە دەبا کە ناوی *هاریجان* (کوڕی خوا)یە. بە ناوی خۆیەوە وتاری تێدا دەنووسێ و گۆشەیەکی پرسیار و وەڵامیشی هەیە.

لە مانگی مارسی ١٩٤٦، وەفدی نێردراوی کابینە کە لە سێ ئەندامی باڵای حکوومەتی کرێکاریی بەریتانیا پێکهاتبوو، سەردانی هیندستانی کرد تا بۆ پێدانی ئۆتۆنۆمی رێگەچارەیەك بدۆزێتەوە. وەفدەکە لەو سەردانەدا چاوی بە گاندی، *جەواهیر لەعل نەهرۆ* و سەرکردەکانی تری حیزبی کۆنگرە و هەروەها *محەمەدعەلی جەناح*، رێبەری مسوڵمانان و گەلێ کەسی تر کەوت.

لە کۆتاییدا، رۆژی ١٦ی مانگی مەی، وەفدی نێردراو گەڵاڵەیەکی بڵاو کردەوە کە دەستوور و دەوڵەتی نەتەوەیی بە هیند دەبەخشی. لە رواڵەتدا کێشەکە ئەوە بوو کە ئاخۆ هیندییەکان بەو پلانەی ئینگلیز رازی دەبن؟ بەڵام پرسیاری راستەقینە شتێکی تر بوو: ئاخۆ مەهاتما گاندی پێی رازی دەبێ؟ ئاخر گاندی گەورەترین هێزی راستەقینەی هیندە.

گاندی بۆ وەڵامدانەوە **تاقیکردنەوە و ئەزموونی سۆراخگەرانەی چوار رۆژە**[١٠]ی بەسەر خۆیدا سەپاند و پاشان لە وتارێکی یەك لاپەڕە و نیویدا ستایشی وەفدەکەی کرد و گوتی:

(١٠) رۆژووگرتن بە دەربڕینی گاندی.

"پلانەکەیان باشترین بەڵگەیەکە کە دەوڵەتی ئینگلیز لە بارودۆخی جۆراوجۆری تائێستادا، توانیوتی بیخاتە روو." گاندی گوتی: "ئەندامانی کابینەی ئینگلیز هاتوون ئاسانترین و خێراترین شێوازی کۆتاییهێنان بە دەسەڵاتی ئینگلیز دابرێژن."

هەموو رۆژنامەکانی هیند ئەو وتارەیان لە *هاریجان* خواستەوە و لە چاپیان دا. دەقی وتارەکە بە بێتەل بۆ واشنتۆن نێردرا تا کاربەدەست و دیپلۆماتە گەورەکان بیبینن. رۆژنامەکانی بەریتانیا چەند بەشێکی تەواویان لێ بلاّو کردەوە.

هەر لە خوارەوەی وتارەکەی گاندی لەمەڕ پێشنیارە مێژووییەکەی ئینگلیز بۆ رزگاریی هیندستان، هاریجان وتارێکی دیکەی بە ئیمزای گاندی تێدا بلاّو بۆوە بە ناونیشانی *دەنکە تۆوی عەنبە* کە لەوێدا بەهای خۆراکیی دەنك *وەکو جێگرەوەیەکی گونجاو بۆ دانەوێڵە و کا و جۆ* پەسن دەدات. لە درێژەشدا دەڵێ: "چەند باش دەبێ ئەگەر هەموو ناوکە عەنبەکان کۆ بکرێنەوە و لە جیاتی دانەوێڵە بکوڵێنرێن و بخورێن یا بدرێنە خەڵکانی هەژار."

لە بەشێکی تری (*هاریجان*)دا دیسان نووسینێکی موهانداس کرامچەند گاندی تێدابوو باسی دەرمانی سروشتی دەکرد کە ماوەیەکە زۆربەی کاتی خۆی پێوە خەریك دەکا. گاندی لە وتارەکەیدا نووسیبویەتی:" دەرمانی سروشتی لە دوو بەش پێکدێ، سەرەتا بردنی ناوی خوا یان رامانام ا، دووەمیش پێشگیریی لە نەخۆشی لە رێگەی پەروەردەی قووڵی پاکوخاوێنی و ژینگە... کە لەودا پاکیی موتڵەقی دەروون و جەستەی تێدایە." گاندی جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە:" ئەودەم نەخۆشی دەبێتە شتێکی مەحاڵ." ئینجا دێتە سەر شیکردنەوەی قازانجەکانی شیر: "شیری گامێش ناگاتە ئاستی شیری مانگا."

ئەم ژمارەیەی هاریجان نموونەیەکە لە ژمارەکانی دیکەی و هەروەها نموونەیەکە لە تایبەتمەندییەکانی گاندی. چونکە ئەو ئۆگری ژیانی **تاکە** - و لە بەر ئەوەی ژیان چەند لایەنەیە - گاندیش مرۆڤێکی چەندلایەنەیە. چەندین و چەند جار لە ژمارە هەفتانەکانی هاریجاندا، گاندی لە گرنگیی خواردنی بادام زەمینی بۆ هاونیشتمانە



هیندییەکانی دەدوێ، یان وەڵامی پرسیاری ئافرەتێك دەداتەوە کە دەپرسێ: بۆچی گاندی خووی تف رۆکردنی هیندییەکان شەرمەزار ناکا و ئاوا وەڵامی دەداتەوە کە لەو بارەوە هەمیشە بەسەریان رۆیوە و ئێستاش جارێکی دیکە ئەو رەفتارە شەرمەزار دەکات.

گاندی لە وتارێکیدا، پێناسەیەك لە مانای سەربەخۆیی بۆ هیند بە دەستەوە دەدا، لە وتارێکی دیکەدا داوا دەکا رادەی هاوردەی شەکر کەم بکرێتەوە و ئاوی نەبات زیاتر بەرهەم بهێنرێ، لە وتاری سێهەمدا بەرامبەر بە گرفتی تاوانی مرۆڤکوژان دەوەستێتەوە، لە چوارەمیدا هیواداریی خۆی دەردەبڕێ کە هیندی ئازاد، خۆی لە دامەزراندن و راگرتنی سوپا بپارێزێ، لە پێنجەمین وتاردا رێسایەك دادەنێ کە درۆکردن هیچکات پاساو هەڵناگرێ: "راستبێژی ریزپەڕ (**استثنا**)ی تێدا نییە."

لە دیدی گاندییەوە: سیاسەت ئەوەندەش مەزن، دوورەدەست و هی **لەمەچێتران** نییە و بێدەسەڵاتانیش، وەك خۆیان بیری لێدەکەنەوە، هێندە وردەڵە و بچووك نین.

یەکێ لە سەرسوڕهێنەرترین تایبەتمەندییەکانی گاندی ئەوەیە کە ٢٤ سەعاتەی رۆژ و شەو لەگەڵ پڕایی خەڵك بەسەر دەبا و پێدەچێ لە ناویاندا هەڵدەدات و گەشە دەکات. نوێنەکەی دۆشەگێکە لەسەر عەرزی بەردینی هەیوانی دەرمانگای دکتۆر مەهتا یان هەر شوێنێکی تر کە لێی دەژی. سەکۆیەکە سەرئاوەڵەیە، هەر لەسەر عەرز چەندین کەس لە هاورێیان لە پەنا مامۆستاکەیان لەسەر هەمان سەکۆ دەخەون.

کاتژمێر چواری بەربەیان مەهاتما و گرووپەکەی دەست بە پاڕانەوە و نزاکردن دەکەن. ئینجا ئاوی پرتەقاڵ و عەنبەیەك دەخواتەوە و بە دەستی خۆی وەڵامی نامەکان دەنووسێتەوە. ٧٨ ساڵەیە و هیوادارە ١٢٥ساڵ بژیت[١١]. دەسخەتی خۆشە و بۆ ئەوە دەبێ ئیستنادی پێبکەی. باش دەبینێ و باش دەبیستێ. رۆژێ جارێك، راج کوماری ئامریت کانور کە ئافرەتێکی مەسیحیی سەر بە بنەماڵەی پادشایی هیندە،

(١١) هەڵبەت لە ساڵانی کۆتایی تەمەنیدا ئارەزووی دەکرد تا زووە بمرێ بۆئەوەی لە ئازاری براکوژیی نێوان مسوڵمان و هیندووەکان، لە هیندی ئازاد رزگاری بێ.

هەواڵەکانی لە رووی کۆپیی هەواڵنامەیی ئاژانسێکی دەنگوباسی بەریتانیاییی بۆ دەخوێنێتەوە. ئەم خانمە بۆ خزمەت بە گاندی و سکرتێریکردنی، دەستی لە هەموو شتێکی خۆی هەڵگرتووە. گاندی قەت رۆژنامە ناخوێنێتەوە و گوێ لە رادێو ناگرێ.

بەڵام هیندستان بە هەزاران نامە و سەدان میوانەوە رووی تێدەکا. هەموو رێگەپێوان و گفتوگۆیەك و هەر کارێکی تر، بە کاتژمێرە باخەڵییەکەی ئەو دیاری دەکرێ کە لە پشتێندە بەدەست چنراوەکەی خستووە. کات بە لایەوە ئێجگار گرنگە. گفتوگۆکان بەزۆری کاتژمێرێك دەخایەنن و ئەمە گاندی خۆیەتی کە کۆتایی کاتەکە رادەگەیەنێ و گفتوگۆکە دەبڕێتەوە. گاندی زۆربەی جار جڵەوی ئاخاوتنەکە بە دەستەوە دەگرێ. گفتوگۆی پێخۆشە. لە راستیدا چێژ لە هەموو کارێك وەردەگرێ، بەتایبەتی ئەگەر ئاخاوتن بێ، رێکردن بێ، خواردن بێ یان خەوتن.

ماوەی حەفتەیەك لە گوندێکی گەرم لە هاوینی ١٩٤٢دا لەگەڵ گاندی ژیام.ساڵی ١٩٤٦یش شەش رۆژ لەگەڵی بووم. کاتژمێر ٥:٣٠ی بەربەیان لەگەڵی دەچوومە رێگەپێوان. یەکەم بەیانی لێی پرسیم خەوت چۆن بوو؟ گوتم: خەوم ناخۆش بوو. مێشوولەیەك پێی وەدابووم.

پرسیم:" ئەدی تۆ چۆن خەوتی؟

وەڵامی دامەوە:" من هەمیشە خەوم خۆشە."

بۆ بەیانیی رۆژی دواتر دیسان لێی پرسیم خەوت چۆن بوو؟ گوتم:" زۆر باش، ئەدی تۆ؟"

وەڵامی دامەوە:" لێم مەپرسە. من هەمیشە خەوم خۆشە."

بەیانیی سێیەم رۆژ لێم پرسی خەوت چۆن بوو؟

جەختی کردەوە: "خۆ پێم گوتی لێم مەپرسە."

بە گاڵتە پێم گوت:" پێم وابوو بیرت نامێنێ."

گوتی:" ئەها، پێت وایە خەریکە لە دەست دەچم؟ دەی باشە، بۆخۆت خەوت چۆن بوو؟"



گوتم:"مەپرسە."

گاندی پێکەنی و گوتی:" بە گوڵێك خۆ بەهار نایە!"

چەند رۆژێك بوو هەوا هەور و هێڵ بوو و بەیانیان پڕیشکە باران دەباری. گوتم: "خۆ حوکم نییە بە بارانیش هەر بچیە پیاسەکردن؟"

لە وەڵامدا گوتی:"ها؟! بەڵێ، وەرێ کەوە. لێم بوویە پیرەمێرد؟"

وەك چوار ساڵ لەمەوبەر بە خێرایی رێ ناکا، بەڵام بە هەموو هێز و تواناییەوە هەنگاوی بەرز دەنێ و پاش ٤٥ دەقیقە رێکردن، ماندوو نابێ. دەگەڕێتەوە، دووەم بەرچاییشی دەخوا، دەنووسێ، چاوی بە خەڵکی دەکەوێ کە دێنە سەردانی، پەیامێکی زۆر دوور و درێژ لە دکتۆر مەهتا وەردەگرێ و پاشان دەنوێتەوە.

گاندی رۆژەکەی لە سەر دۆشەگێکی ئەستوور کە لە سەر عەردی بەردینی ژوورەکەی راخراوە دەباتە سەر و هەر لە سەر ئەویش دەنوێ. خواردنی لە دەوریی فەخفووری بریقەدار و خاوێن یان قاپی کانزایی سواوەی جوان بۆ دێنن. خواردنی بریتییە لە سەوزە و گیای خاو و لێنراو، مێوە، خورما و شیری کوڵێنراو، فرنی و کێکی تاوەیی هیندی. نان و هێلکە و گۆشت یان ماسی ناخوا" چا و قاوە یان مەشرووبیش ناخواتەوە. گاندی زۆربەی کات لە کۆڵێتێکی ئاسایی لە نێو ماڵە هەژارەکاندا دەژی. دانیشتووی ئەو کۆڵێتانە گڵاوەکانن. هیندووی ئیماندار زۆربەی کات خۆیان لە گڵاوەکان دوور دەگرن، چونکە بڕوایان وایە کە دەستیان وێبکەون ئەوانیش پیس دەبن. گاندی خوازیارە ئەو هیندووانەی باوەڕیان بە مەسەلەی چینایەتی[١٢] هەیە، دەست لەو رەفتارە بێبەزەییانەی خۆیان بەرامبەر گڵاوەکان

(١٢) caste ئاییینی هیندوو، کۆمەڵگا وەك پێنج چین پێناسە دەکا: رۆحانییەکان ، جەنگاوەران، کاسبکاران، جووتیاران و گڵاوەکان. لە هیندی سەردەمی گاندیدا، پۆخڵترین پیشەکان دەدرایە گڵاوەکان کە سێبەریشیان بە لای هیندووەکانەوە گڵاو بوو. ئیماندارانی هیندوو پێیان وابوو کاتێ سێبەری گڵاوێکیان بکەوێتە سەر، دەتوانن بەلێخشاندنی ئەو شوێنەی لەش لە جەستەی مسوڵمانێك، خۆیان لەو پیسییە پاك بکەنەوە. ئاشکرایە مسوڵمانەکانیش لەلای خۆیانەوە ئەوانیان

هەڵبگرن. لە ئەنجامدا، هیندووە چینایەتییەکان دەستیان پێکردووە گلاوەکان وەك خزمەتکار و چێشتکەر دادەمەزرێنن. جگە لەوە لە سەرانسەری هیند پێیان گوتم کە دیواری نێوان هیندووە چینایەتییەکان و گلاوەکان، بەتایبەتی لە شارەکان خەریکە تێکدەڕووخێ. گاندی ڕۆحانییەکانی پەرستگەی پیرۆزی هیندووی وا لێکردوون کە دەرگای پەرستەگەکانیان بە رووی گلاوەکاندا بکەنەوە، لە کاتێکدا ئەو دەرگایانە هەزاران ساڵ بوو بە روویاندا داخرابوون.

جارێکیان پێی گوتم: "من گلاوم." ئەو بە ڕەچەڵەك هیندوویەکە لە چینی کاسبکاران، بەڵام خۆی وەك چینی گلاوان لە قەڵەم دەدا، بۆ ئەوەی ئەمە خوایە هیندووەکانی تریش چاو لەو بکەن. لە درێژەدا دەڵێ: "من هیندووم، من مسوڵمانم، مەسیحیم، جوولەکەم و بوودابیم."، هیندییەکان کە دێنە لای، چەند نموونەیەکی دەگمەن نەبێ، بەرامبەری دەنوشتێنەوە و زۆربەی جار بە لاقیدا دەنووسێن. ئەویش بە مست لە پشتیان دەدا و پێیان دەڵێ واز بێنن. پاشان، وەك خۆی دەگێڕێتەوە، لە سەر زەوی هەڵدەتروشکێن و باسوخواس دەست پێدەکا. هەر کەس بۆی هەیە لە ماڵەکە دابنیشێ و گوێ رابگرێ، بەڵام زۆربەی کات گفتوگۆ لە نێوان گاندی و ئەو کەسەدا دەکرێ کە هاتووە چاوی بەو بکەوێ.

بەرپرسانی ستانیی حیزبی کۆنگرە دێنە لای بۆئەوەی ڕێنمایی و ڕای وەربگرن. ڕاهێنەرەکان دێن بیرو ڕاکانیان لای ئەو تاقی بکەنەوە. هەر کەس کارێکی نوێی بە دەستەوە بێ و ئەوانەی گەڵاڵە و پلان و کردەیەکی نوێشیان بۆ هیند بە دەستەوە نییە، دەخوازن دەستی زیارەت بکەن. کەسانی جۆراجۆر دێن بۆ چارەسەرکردنی کێشە تایبەتییەکانیان یارمەتییان بدات. لەو ماوەیەی لەگەڵیدا بووم، ژن و مێردێکی گلاو کە لە ژیانی هاوبەشیان ناڕازی بوون، کاتێکی زۆریان لێگرت تا بەسەرهاتی گرفتەکانی خۆیانی بۆ بگێڕنەوە. چەندین سەعات بەو دووانەوە خەریکبوو.

---

بە بتپەرست و جۆرە گلاوێك دادەنا. بەڵام لە نیگای هیندووکانەوە کە خۆیان بە پاکی بێغەش دادەنا، وەك ئامرازێك بۆ پاکبوونەوە تەماشا دەکران. جا سەیر کە و با سەرت سوڕنەمێنێ!



جووتیاران و کرێکاران بۆ ڕێگەچارەی چاکسازیی ئابووری و کۆمەڵایەتی داوای یارمەتیی لێدەکەن.

لە سەفەرێکی سێ کاتژمێر و نیوەدا بە شەمەندەفەر لە *پوونا*وە تا *بۆمبای* لەگەڵی بووم. گاندی و هاوڕێکانی کە نزیکەی دە سکرتێر و لایەنگر، لەگەڵ پزیشکەکەی بوون چوونە ناو ڤارگۆنێکی تایبەت کە پلە ٣ بوو و تەنیا کەرەوێتەی دارینی تێدا بوون. بارانیش بە خوڕ دەباری و پاش کەمێك لە سەقفەکەوە دڵۆپە دەستی پێکرد. گاندی وتارێکی بۆ هاریجان نووسی. ئینجا بە نموونەی چاپیی وتارێکی دیکەدا چۆوە. دوای ئەوە لەگەڵ سەرکردە سیاسییەکاندا خەریکی گفتوگۆ بوو کە هەر بەو مەبەستە سواری شەمەندەفەرەکە ببوون. لە گشت وێستگەکاندا سەرەڕای بارینی بارانی بە لێزمە، جەماوەر بۆ دیتنی کۆببوونەوە. لە کاتی یەك لەو وەستانانەدا، دوو هەرزەکاری دەوری ١٤ ساڵان، بە دەموچاوی تاوسووتەوە، لە پشت پەنجەرە ڕاوەستابوون و هاواریان دەکرد:"گاندی جەی، گاندی جەی" (جەی، پاشگری ڕێزگرتنە.)

لێم پرسی: تۆ لە ڕوانگەی ئەوانەوە چیت؟

دوو پەنجەی ئاماژەی لە تەنیشت سەرە کەچەڵەکەی قیت کردنەوە و گوتی: "شاخ، من مرۆڤێکم بە دوو شاخەوە. گاڵتەجاڕێك." (زۆر باش بە ئینگلیزی دەدوا.)

سەرم لەو هەموو توانا و وزەیە سوڕما. قەت بەر لە کاتژمێر ١٠ ناچێتە ناو پێخەفەوە. ئەو کاتانەی لە سەر سەکۆکە رادەکشا و من بە پێشیدا ڕەت دەبووم، قسەی خۆش و بە توێکڵی لەگەڵ دەکردم یان دەیگوت ئەگەر زیاتر دوعا بکەم، خەوم خۆشتر دەبێ. گاندی ئیماندارێکی تۆخە. جەوهەری ئایینەکەی، بڕوا بە خوا، بڕوا بە خۆی وەك ئامرازێکی خوا و، بڕوا بە ناتوندوتیژی وەك ڕێگەیەك بەرەو خوا لە ئاسماندا و بەرەو ئاشتی و دڵخۆشی لە سەر زەوییە. بڕوا بە ناتوندوتیژی، هەموو بیرو هزر و وتە و کردەوە سیاسییەکانی دەگرێتە بەر.

گاندی چەندین جار سووکە ئاماژەیەکی بە هەر دوو شەڕی جیهانی دەکرد. لێم پرسی بۆچی ناتوندوتیژی لەگەڵ ڕۆژئاواییەکان ناهێنێتە گۆڕێ. بە پێکەنینەوە گوتی: "من مرۆڤێکی ئاسیاییم. تەواو ئاسیایی، بەڵام مەسیحیش ئاسیایی بووە. من هێشتا نەمتوانیوە لەو بارەوە قەناعەت بە هیندییەکان بێنم، چۆن دەتوانم ڕۆژئاواییەکان بۆ ناتوندوتیژی بانگهێشت بکەم؟ من گوللەیەکی تەقێنراو و بە فیڕۆ دراوم."

دانی پێدا دەنێ کە خووخدەی لاوانی وڵاتەکەی، توندوتیژ و بێ جیکڵدانە و شۆڕشگێڕانەیە. گاندی ژیانی خۆی بۆ سەربەخۆیی وڵاتەکەی تەرخان کردووە. لەگەڵ ئەوەشدا ڕازی نابێ لە ڕێگەی توندتیژییەوە بەو ئامانجە بگات. ئەمە ئەو خاڵەیە کە گاندی لە سۆسیالیستەکان جیا دەکاتەوە. لە بارەی *جای پراکاش نارایان* سەرکردەی ٤٤ ساڵەی جووڵانەوەی ڕوو لە گەشەی سۆسیالیستی هیندەوە دەڵێ: "من بەر لەوەی ئەو لە دایك بێ، سۆسیالیست بووم." جای پراکاش کەسایەتییەکی سەرسوڕهێنەرە. لە زانکۆکانی ویسکان سین و ئۆهایۆ خوێندوویەتی، لە شیکاگۆ فرۆشیاری دەستگێڕی کەلوپەلی ئارایشت بووە و بەشی خۆشی لە هیند زیندانی کێشاوە. جای پراکاش، وەکو هەموو سۆسیالیستەکانی سەرانسەری دنیا، دژە کۆمۆنیست و دژە سۆڤیەتە. گاندی خۆشی دەوێت و ئەویش شەیدای گاندییە. بەڵام سۆسیالیستەکانی هیند بە سەرکردایەتیی جای پراکاش لە کاتی خەباتی سەرپێچی مەدەنیی گاندی لە ساڵی ١٩٤٢ دەستیان دایە هەندێ کردەوەی توندوتیژ. سۆسیالیستەکان کاری تێکدەرانەیان کرد، ڕێکخراوێکی نهێنییان دامەزراند، خۆیان لە پۆلیس شاردەوە و بە زەبری زۆر بەریان بە چالاکیی کاربەدەستانی حکوومەت گرت. ئەم کردەوانە گشتیان لە ڕوانگەی بنەماکانی ناتوندتیژیی گاندییەوە، لەجێی خۆیان نین.

کەواتە سەرەڕای ئەوەی گاندی سەرچاوە و کانگای تامەزرۆیی ئەوانە بۆ ڕزگاریی نەتەوەیی و لە دوا ئامانجی سۆسیالیستەکاندا هاوبەشیانە، بەڵام دژی ئەو جۆرە سۆسیالیستانەشە.



گاندی دژی ژاپۆن و دژی نازی بوو، لەگەڵ ئەوەشدا، دژی شەڕیش بوو، چونکە بڕوای وابوو کە هێزە سەرکەوتووەکان لە ڕێگەی هێزی سەربازییەوە ناتوانن ئاشتی بێننە ئاراوە. گاندی بیری لە شتێکی سەرووتر لە نزیکترین ئامانج دەکردەوە و دەکاتەوە.

مەهاتما دەبینێ کە مرۆڤایەتی و تەنانەت هیندەکەی خۆشی، حەزی لێیە لە پێناوی دەسەڵاتدا دەسەڵاتدار بێ و لە ڕێگەی وەسەریەکنانی سەرمایەوە تاك بکاتە کۆیلەی حکوومەت. بەهەشتی ئابووریی گاندی دنیایەکە لە گوندی خۆبژێو کە بە پیشەی ناوماڵ و کشتوکاڵەوە خەریکن، لەگەڵ تاقمێکی کەم شاری بچووك. گاندی خۆی لە ڕیزی هەژار و نەدار و دەستکورتان دادەنێ.

وەك زۆربەی هیندییەکان، ئەویش **هیندتەوەرە. دەردەهیندیەتی**، واتە وەك ئەوەی دڵت نەخۆش بێ و دڵی نەخۆشیش خۆ فەرامۆش ناکرێ. هیندی بەر لە هەموو شتێك بیر لە کێشەکانی خۆیان دەکەنەوە، نەك کێشەکانی دنیای دەرەوە.

هیچ باسێك لەگەڵ گاندی لە بارەی بارودۆخ و واقیع و ڕاستییەکانی ڕۆژانە، وشك و بێ ڕۆح نامێنێتەوە. ئەمە ئەوە کە ئەو باسە بە وتەکانی خۆی دەباتە ئاستێکی بەرزتر و دوای کەمێك دەبینی بابەتەکە لە لایەنێکی فەیلەسووفانەی بەرینترەوە دەبینرێ کە کێشە هەرە گەورەکانی بەردەم مرۆڤی سەر گۆی زەوی تێدا هاتوونە ئاراوە.

وەفدێك لە ئەمریکاوە بۆ یارمەتیدانی لێقەوماوانی قاتوقڕی هاتبوونە دیداری گاندی. یەك لە ئەندامانی وەفدەکە لە گاندی دەپرسێ ئایا ئەمە ڕاستە خۆراك بدەینە ژاپۆنییەکان، لە حاڵێکدا وڵاتی ژاپۆن کۆنە دوژمنە و هیندیش ئێستا لە بەردەم قاتوقڕیدایە؟ گاندی لە وەڵامدا گوتی:" ئەگەر ئەو هەواڵە ڕاست بێ کە ژاپۆن لە هیند برسیترە، ئەمریکا دەبێ سەرەتا بە هانای ژاپۆنەوە بچێ، چونکە ئەمریکا هەوڵی لە ناوبردنی ڕۆحی ژاپۆنی داوە. جگە لەوە بەکارهێنانی بۆمبی ئەتۆمی بە توندی مەحکووم کرد.

گاندی نەتەوەخوازە، بەڵام مرۆڤایەتییەکەی، کەسێکی جیهانینیشتمانی لێ دروست کردووە. لە هەمان کاتدا، یەکەم کەڵکەڵەشی، هیندستانە.

لە روانگەی گاندییەوە، دانوستان لەگەڵ *سێر ستافۆرد کریپز* و چاندنی بادام زەمینی هەر دوو بۆ یەك ئامانجن، واتە ئاسوودەیی چوارسەد ملیۆن هیندی. گاندی خۆی لەناودا تواندوونەوە، بۆیە زۆرترین خۆشەویستیی بەرامبەر دەردەبڕدرێ و دەسترۆیشتووترین کەسی هیندە. هیندووەکان یەك خوا دەپەرستن، بەڵام ئیلاهە و بتی بچووکتری زۆریش دەپەرستن و ئێستا لە هەندێ پەرستگەی هیندووەکاندا بتی گاندی - ش هەن.

باجگرێکی ساردوسڕی خەڵکی *بۆمبای* پێم دەڵێ: "دەروازەکانی ئاسمان چاوەڕوانی پێشوازی لە گاندین." گاندی داوایان لێدەکا دان بە خۆدا بگرن. ئەو هەوڵ دەدا، زەوی ئاسمانیتر بکا.

رۆژهەڵات هێندە برسی و رووت و خەمبارە کە بە ورگی بیر دەکاتەوە، بە رووتو قووتییەکەی دەبینێ و بە داماوییەکەی هەست بە شت دەکا. سەدان ملیۆن کەس لە ترسی فلان رێکخراو و فیسارە دامەزراوەی دەسەڵات وەك مێژۆك دەلەرزن، بەڵام ئەوانە کە دەستبەرداری خۆشی و بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیان دەبن و خۆیان دەکەنە قۆچی قوربانیی ئاسوودەیی خەڵك، تەنیا خۆشیان دەوێن. گاندی رەمزی دەستبەرداری و فیداکردنی هەموو تەمەنی خۆیەتی. ئەو هیندییەکان دەژی و بۆیان دەژی-ت. کەسانێك هەن لەگەڵ ئەو جیاوازان، زۆرکەس را سەرنجراکێشەکانی لە بارەی دان بە خۆداگرتنی دەروونی و جنسی، ئاشتیخوازیی تەواو و دەرمانی سروشتییەوە رەت دەکەنەوە. بەڵام هەر هەموویان رێز لە راستگۆیی، ژیری و تامەزرۆیی ئەو بۆ هەقیقەت دەنێن. ئەو کاتانەی گاندی قسەی خۆی وەردەگرێتەوە و رەخنە لە خۆی دەگرێ، رۆژئاواییەکان دەڵێن: ئەو بووە بە کەسێکی وازوازی" بەڵام رۆژهەڵاتییەکان دەڵێن گاندی لەگەڵ خۆی راستگۆ بووە.



گاندی نکوولّی لە دەسترۆیشتوویی بەربڵاوی خۆی دەکا. دەڵێ: "من خزمەتکاری خوام."

لەگەڵ ئەوەشدا گەلێك لە خەڵکانی بێبڕوا خۆیان بە پەیڕەوی وی دەزانن، ئاخر ئەو خزمەتکاری مرۆڤە. گاندی بە پێی غەریزە ئەوی *وۆدرو وێڵسن* سەردەمێك دەیگوت بە باشی تێیدەگا:" دیموکراسی لە بەربڵاوترین مانای خۆیدا، گەلێ زیاتر لە جۆرێکی تایبەت لە حکومەت مانا دەبەخشێ... دیموکراسی لە راستیدا سیستەمێکی رێکخستنی کۆمەڵایەتییە کە بەشی هەرە زۆری لایەنەکانی پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و مرۆڤ دەخاتە ژێر کاریگەریی خۆیەوە."

بە بڕوای زۆر لە خەڵکی، سیاسەت بە مانای حکوومەتە. لە روانگەی گاندییەوە سیاسەت واتە مرۆڤ. سیاسەتوانی ئاسایی و هەروەتر سەرۆکی ستەمکار خۆیان بە **گەلدۆست** پیشاندەدەن. بەڵام گاندی حەزی لە گرووپ و جەماوەری بێ شکڵ و بێ شوناس بە ناوی خەڵکەوە نییە. ئەو نیگەرانی خەڵك بە مانای تاکەکانە. لە پاژ (جزء)ەوە بەرەو گشت (کل) هەنگاو دەنێ.

ساڵی ١٩٤٦، لە بەنگاڵ شەڕ و پێکدادانی خوێناوی لە نێوان هیندووەکان و مسوڵمانان روویدا کە هەزاران کەس تێیدا بوونە قوربانی. مەهاتما گاندی یەکسەر چووە خراپترین شوێنی شەڕەکە، ناوچەی مسوڵماننشین لە بەنگاڵی رۆژهەڵات. پیرەمێردی لاواز لەگەڵ یەك دووکەسی تر، بە پێیان گوند بە گوند رۆیی. تکای لە گوندییە مسوڵمانەکان کرد شەوێ رایبگرن. چاوی بە کەس و تاقمەکان کەوت و لەبارەی دۆستایەتیی نێوان نەتەوەکان لەگەڵیان دوا. هەموو ئەوانەی کە بۆ بیستنی قسەکانی دەهاتنە لای لەگەڵیان دوا و دوعای بۆ کردن. چەندین مانگ لە ناو ئەو خەڵکە رەشوڕووتەدا ژیا کە خەڵکیان کوشتبوو و کەسی ئازیزیان لێ کوژرابوو. لە کۆلێتەکانیاندا مایەوە. لەو خۆراکەی خوارد کە ئەوان دەیانخوارد و بەو جۆرە هاتوچۆی کرد کە ئەوان هاتوچۆیان دەکرد. دەستی لەگەڵیان لە قاپێك نا تا تێیان بگا و سارێژیان بکا. سیاسەتوانی ئاسایی لەو بارودۆخەدا، لە بارەی تەبایی و

وێکهەڵکردنەوە بۆ خەڵك دوا و دوای ئەوە گەڕایەوە ماڵەکەی خۆی و خەریکی کاروباری دیکە بوو. کاتێ هاوسەری گاندی مرد، خەڵکی هیند بونیادێکیان بە ناوی ئەوەوە بۆ پەرەپێدانی دەرمانی سروشتی دامەزراند. دکتۆر دینشاه مەهتا خەنی بوو، چونکە ساڵانی زۆری بە نەبوونی کەرستەی پێویست، پارەی کەم و کەمبوونی بەردەستی ڕاهێنراو بە سەر بردبوو. بەڵام گاندی نەیهێشت. ئەو حەزی لە کردنەوەی بنکەیەکی تایبەتی نەبوو کە ژمارەیەکی کەم خەڵکی دەوڵەمەند دەیانتوانی سەردانی بکەن و چارەسەری نەخۆشییەکانیان بکەن. گاندی دەیویست دەرمانی سروشتی بە جووتیاران بناسێنێ و بە گوێرەی توانایان دەستیان پێی ڕابگا. لەو پێناوەدا هەندێ ئەزموونی بە شێوازی ناوماڵ و هەرزان دەست پێکردن کە خۆی چاودێری دەکرد. ئەزموونی وەك: دەرمانکردن لە ڕێگەی گوڵ، هەتاو، خۆراك، ئاو، شێلان و...تاد.

گاندی شۆڕشگێڕێکی ئێجگار ڕادیکاڵە کە لە ماوەی ژیانیدا لێبڕاوە ڕەگ و ریشەی **خراپە** هەڵکێشێ. ئەو بە بەرزەفڕییەوە دەروەست دەبێ کە سەدان ملیۆن کەس بە خستنەڕووی سەرمەشقی کردەیی و بە وشەکانی، گەشە پێبدا و بگوڕێ. بە نیشاندانی خۆی وەك کەسێك کە ژیانی ڕۆژانەی لەگەڵ گلاوەکاندا بەسەر دەبا، هەوڵ دەدا بنەمای دڵڕەقانەی *گلاوبوون* تێکبڕووخێنێ. ئەوەدەمەی کە گرکانی توورەیی *هیندوو - مسوڵمان* هەڵدەچێ، خێوەت و بارەگا سادە و بێنازەکەی خۆی لە لێواری لافاوی گڕەکە هەڵدەدا. **٢٤ کاتژمێر** لە پەنا جووتیاران دەژی، ئاخر هیند وڵاتێکی کشتوکاڵییە.

کرێکارێك کە خۆی لە ناو دڵی پڕ لە گازی زەوی ڕادەکا تا بەردە خەڵووز دەربێنێ، بەرامبەر بەو کارە دژوارە، دەبێ لە کۆشکدا بژی، کەچی بە پێچەوانەوە لەکۆڵێتێکدا دەژیت. لە کاتێکدا پیاوانی تەلارنشین ناهێڵن هەقدەستەکەی زیاد بکرێ. ئەوانەی هەر بۆڵەیان دێ و ئامادە نین ئەو مووچە و هەقدەستانە زیاد بکەن، دەتوانن مانگێك کارەکە تاقی بکەنەوە و وەك کانگاچییەك بژین. ئەو دوژمنکارانەی



کە دوژمنی جاران و خۆ بەدەستەوەدەری ئێستا[١٣] برسی دەکەن، دەتوانن ژیانی ڕۆژێ بە ١٢٠٠ کالۆری بۆ ماوەیەکی کورت تاقی بکەنەوە. مەودای گەورەی نێوان مرۆڤی *دەسەڵاتدار* و مرۆڤی *بێدەسەڵات* لە دنیادا، یەك لە هۆکارە سەرەکییەکانی هەبوونی شەڕ و ئاژاوەیە. پیاوە دەسەڵاتدارەکان چوونەتە ناو سات بە ساتی ژیانی هاووڵاتیی مامناوەندییەوە. هاووڵاتیی مامناوەندی دەبێ لە دەسەڵاتی مرۆڤە دەسەڵاتدارەکاندا بەشدار بێ و لەو ڕێگەیەوە کەمی بکاتەوە. ئەو ڕێسایە، دەوڵەتەکان، حیزبە سیاسییەکان، کۆمپانیا گەورەکان، سەندیکاکانی کرێکاری و لە ڕاستیدا هەموو دامەزراوە مرۆییەکان دەگرێتەوە. دەسەڵاتی بێسنوور، بۆ ئەوانەی کە بەکاری دەهێنن و بۆ ئەوانەشی کە بە دەستییەوە دەناڵێنن، ناتەندروستە.

ستەمکار دەسەڵاتی هەیە چونکە زەبروزەنگ لە دەستیدا پاوان کراوە. بەڵام گاندی بە بێ هیچ زەبروزەنگێك، خاوەنی هێزە. ئەو نە دەتوانێ کەس خەڵات بکا و نە کەس سزا بدا. لەسەر هیچ کورسییەك دانەنیشتووە. پیاوێکە بە بەڕەیەکی سادەوە، لە کۆڵێتێکدا.

دەستڕۆیشتوویی گاندی لە خۆشەویستی ئەو بۆ مرۆڤەوە سەرچاوە دەگرێ.

گاندی **تاکگەرایەکە** نە زەبروزەنگی هەیە و نە پارە. تاکگەرایی وی ئەو مافەی ناداتێ کە هەرچی لە توانایدا بێ، لە ڕێگە و لە ژێر باڵی یاسادا وەدەستی بێنێ و بیکاتە هی خۆی.

تاکگەرایی وی لە سەر بنەمای دارایی نییە. لەسەر بنەمای کەسێتی و کردەوەیە. بەو مانایەی کاتێك هەست دەکا ئامانجەکەی دادپەروەرانەیە، دەتوانێ بە تاقی تەنێ لە بەرامبەر دنیادا ڕابوەستێ. بە هەبوونی گاندییەوە، تاکێتی واتە ئەوپەڕی ئازادی لە بارودۆخی دەرەکیدا و ئەوپەڕی پێگەیشتنی بەها دەروونییەکان.

**گاندی، پیاوێکی ئازادە لە قووڵایی وجوودەوە.**

(١٣) مەبەست، وڵاتە سەرکەوتووەکان(ڕۆژئاوا، ئەمریکا، ئینگلیز و...تاد) و نەتەوە تێکشکاوەکانی شەڕی دووەمی جیهانییە.

# بەشی سێیەم

## مەهاتما گاندی و سەرۆکی فەرماندە مارشاڵ ستالین

گاندی قارەمانی بەرزی ئازادیی هیندستان لە ڕێگەی ناتوندوتیژییەوەیە. بەڵام کاتێ کە ناتوندوتیژیی گاندی وەردەگێڕدرێتە سەر زمانی ژیان و کرداری ڕۆژانە، شتێکی زیاتر لە ملنەدانی مەنفی لێدەردەچێ. (شتێك کە بە هەڵە و بە ناوی خەباتی مەنفی پێیانەوە نووساندووە) لێرەدایە کە تیۆرەکەی وی زیاتر بە لای فەلسەفەیەکی سەرسوڕهێنەر و ڕادیکاڵدا دەشکێتەوە.

گاندی سەردەمێك لە کوێرەدێیەکی هەژار و رووت بە ناوی *ئوورولی* دەژیا. شەوێك دز لە کۆڵێتی ڕەنجبەرێك وەژوور کەوتن، زۆریان لێدا و چی هەبوو بەتاڵانیان برد. بۆ سبەی شەو، قوربانییەکەیان هێنایە لای گاندی. ئێستا دەبوو چی بکا؟ گاندی گوتی سێ ڕێگامان بۆ ئەو کێشەیە لەبەرن: یەکەمیان **ڕێگە ئاسان و لەدەستان خۆشەکەیە** واتە پۆلیس تێبگەیەنین، گوتیشی زۆربەی کات ئەم کارە دەبێتە هۆی ئاوەڵاکردنی دەستی پۆلیس بۆ کاری گەندەڵانەی زیاتر، شتێك کە کەم وا هەیە دەردی لێقەوماوەکە دەرمان بکا. ڕێگای دووەم، کە گوندییەکانی تێیدا ناهومێد و دەستەشکاو دەبن ئەوەیە: دەست لەسەر دەست دانێین و هیچ کارێك نەکەین. گاندی گوتی: "ئەوە شەرمەزارییە، ریشەی لە ترسنۆکیدایە و تاوانیش تا ئەو کاتەی ترسنۆکی هەیە، برەوی دەبێ." شێوەی بەربەرەکانیکردنی گاندی لەگەڵ دزاندا، ***ساتیاگراها***(١٤)یان هەمان ناتوندوتیژییە. گاندی بە گوندییەکانی گوت: "ئەم ڕێگایە داوا لە ئێوە دەکا کە تەنانەت لەگەڵ دز و پیاوخراپان وەك برا و خوشکی خۆتان

---

(١٤)Satyagraha بەدەربڕینی گاندی، خۆڕاگری لە ڕێگەی هەقیقەتە و ناتوندوتیژی یان ئاهیمسا تەنیا شێوازێك بۆ وەدیهێنانی وی.

رەفتار بکەن. تاوان، بەو چاوە تەماشا بکەن کە نەخۆشییەکە کە قوربانییەکە تووشی بووە و دەبێ دەرمان بکرێ."

گاندی پێشنیاری کرد کە پیاوخراپ دەبێ فێرە پیشەیەك بکرێ و کەرستەی گۆڕینی ژیانی بۆ دابین بکرێ، ئینجا گوتی:

**"دەبێ بزانن کە دز یان پیاوخراپ بوونەوەرێك نییە لە ئێوە جیاواز بێ. لە راستیدا ئەگەر چراکە لە ناخی خۆتان بگرن، جیاوازیتان لەگەڵ دز، تەنیا هەنگاوێکە. چرای هۆشیاری لە ناختان بگرن.**[١٥]

گاندی ئینجا ئەو گوفتارە زولاڵەی هێنایە سەر زوان:

کەسێکی دەوڵەمەندی پارەدار کە سامانەکەی لە رێگەی چەوساندنەوە یان ئامرازی ناشەرعیی تر بە دەست هێناوە، هیچ لەو دزە بێتاوانتر نییە کە گیرفانی خەڵك دەبڕێ یان وەسەر دیواریماڵی خەڵك دەکەوێ. تەنیا جیاوازیی لەگەڵ هێلکەدزەکە لەوەدایە کە ئەو، خۆی لە پشت پێگە و ناو و ناوبانگدا حەشار دەدا و لە سزای یاساش دەرباز دەبێ.

لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: "ئەگەر راستیتان دەوێ، هەموو سامانە کەڵەکە بوو و هەڵاوساوەکان کە لە پێداویستییە مەشرووعەکانی کەسێك زیاتر و فراوانترن، ماڵی دزێتین. ئەگەر دابەشکردنی ژیرانەی سامان و دادپەروەریی کۆمەڵایەتی بە تەواوی لەئارادا بووایە، لەجێدا هیچ دەرفەتێك بۆ سەرهەڵدانی دزی نەدەڕەخسا و ئاساییە دزیش هەر نەدەبوو."

بەم جۆرەیە کە ناتوندوتیژی، بەرەو سۆسیالیزمی یەکسانخوازانە پاڵی دەنێت.

لە وتارە چاپکراوەکەی لە بڵاڤۆکی هاریجان لە یەکەمی ژووئەنی ١٩٤٧دا دەخوێنینەوە:

(١٥) قسەیەك کە بە هی مەسیح دەزانرێ لەو وتەیە نزیکە: لە ئەڵقەی سەنگسارکردندا ژنی تۆمەتبار بە گوناه گوتی: "ئەو کەسەی هیچ گوناهێکی نەکردووە، یەکەم بەرد بهاوێ"... هیچ کەس نەیهاویشت.



"نایەکسانیی ئابووری، ئێجگار زۆرە. بنەمای سۆسیالیزم یەکسانیی ئابوورییە. لە بارودۆخی ئێستادا کە نایەکسانییەکی شەڕخوازانە لەئارادایە، بە جۆرێك کە تاقمێکی کەم لە سەروەت و ساماندا نوقم بوونە و خەڵکانیش تەنانەت بەشی ئەوەیان دەست ناکەوێ زگی خۆیانی پێ تێر بکەن، شوێنەوارێك لە حاکمیەتی خوا نابینرێ. من تیۆری سۆسیالیزم - م تەنانەت ئەو کاتەی لە ئەفریقای باشوور بووم پەسند کرد." زیاتر لە ٣٠ساڵ لەمەوبەر.

بەڵام گاندی لە زۆربەی سۆسیالیستەکانی ئەمڕۆ جیاوازە. لەو رووەوە جیاوازە کە ئەو حەز بە حکوومەت ناکا. بە خەڵکی لادێی *ئوورولی* گوت: "پۆلیس ئاگادار مەکەنەوە، مرۆڤی چاکسازیخواز ناتوانێ سیخوڕ بێ.[١٦] پاشان جەختی لە سەر دەکاتەوە: " تێگەیشتنی کەسێك کە دەکەوێتە ژێر زەخت و زۆرەملیی (**باش**)ەوە ناتوانێ گەشە بکا و بەرەو باشبوون بچێ، راستت دەوێ پاشەکشەش دەکا و ئەو دەمەی زەخت و زۆرەملییەکەی لەسەر لادەچێ، هەموو عەیب و کەمایەسیەکانی، تەنانەت بە هێزی رووخێنەرترەوە لێ وەدەردەکەونەوە.

گاندی دەیەوێ لە رێگەی چاکبوونی مرۆڤەوە، سیستەم چاك بکرێ. رێچکەکەی وی بۆ چارەسەری کێشە جیهانییەکان و کێشەکانی هیند، بە ناو پاڵاوتن و پیتاندنی کەسایەتی و کرداری مرۆییدا رەت دەبێ نەك پیتاندنی یۆرانیۆم.

گاندی توانیویە بە سەرمەشقی کەسێتی و لێدوانی پێداگرانەی خۆی، بێ ئەوەی حکوومەتێکی لەبەر دەستدا بێ، هەستی کەرامەتی ئینسانی و هێز و توانای جەمعی بە هیندییەکان ببەخشێ. ژنانی هیند ئازادیی سیاسییان بەدەست هێنا، زمانێکی نەتەوەیی هیندی لەدایك بوو، گلاوەکان دیتیان پێگەیان بەرەو باشتر بوون دەچێ و هەموو میللەت خۆی لە داهێزان و خەوێکی کۆن راچڵەکاند - چونکە گاندی دیسانەوەش بە کردەوەی پڕ جموجووڵی راستەوخۆ کە بێسەبریی شۆڕشگێڕان لەگەڵ

(١٦) جیاوازیی دەربڕینی **ناتوانێ**، **لە دەستی نایە**... ، **پێی ناکرێ**...لەگەڵ دەربڕینی **نابێ**.. جێی تێڕامان و لێورد بوونەوەیە!

وەسواسی ئایدیالیستان بەیەکەوە دەبەستێتەوە، توانی شێوازی ناتوندوتیژی تەواو بکات.

جارێکیان برادەرێك لێی پرسی: ئایا ئەمە روودەدات کە پێویست بێ "ئامانجەکان بە بەرژەوەندی بگۆڕییەوە؟" گاندی وەڵامی دایەوە: "نا، هەرگیز، من باوەڕم بەوە نییە کە ئامانج پاساوی ئامراز بێ."

ئەم بۆچوونەیە، گاندی لە ستەمکار و گەلێك سیاسەتمەدار جیا دەکاتەوە.

گاندی دەڵێ: "لە هەموو تەمەنمدا بۆ ئازادیی هیند تێکۆشاوم، بەڵام ئەگەر ناچار بم لە ڕێگەی توندوتیژییەوە بەدەستی بێنم، نامەوێ." لە لای دیکەوە، فاشیست و کۆمۆنیستەکان، بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان پەنا دەبەنە بەر هەموو ئامرازێك.

ئامرازیش، زیاتر خودی مرۆڤە. لەو رووەوەیە کە کەسی دیموکرات تاك پەسن دەدات و لە بەرزترین شوێنی دادەنێ. بەڵام ستەمکار تاك دەکاتە قوربانی. ستەمکار تاك لە پێناوی بەرژەوەندییەکانی تاکدا دەکاتە قوربانی! ئامانجێك کە خۆی بانگەشەی بۆ دەکا.

گاندی بەرامبەر بە بەپیشەسازی کردن و زەبەلاح بوونی سیستەمەکان دژکردەوەی مەنفی نیشان دەدا. گاندی ئاشقی ژیانی ساکاری لادێیە. بەڵام بۆ گونجان و داشکاندن لەو باوەڕەی خۆی دەنووسێ: "ئەگەر ژمارەیەکی زۆری مرۆڤ پێکەوە کاریان کردبا، خاوەندارێتیی حکوومەتم پەسند دەکرد. ئەوان دەبنە خاوەنی بەرهەمی کاری خۆیان. بەڵام حکوومەت نابێ بۆ ئەو ئامانجە پەنا بباتە بەر توندوتیژی. من پارەدارەکانم بەزۆری رووت نەدەکردن، بەڵام لە پرۆسەی کردنە خاوەندارێتی حکوومەتیدا، دەستی هاوکاریم بۆ درێژ دەکردن. لە کۆمەڵگادا هیچ کەس دەرکراو نییە. چ ملیونێر و چ هەژار. هەر دووکیان برینی یەك نەخۆشین."

گاندی کە متمانەی بە سروشتی ئیلاهیی مرۆڤە، لەباتی توندوتیژی، بە شێوازی خۆبەخشانە بەرامبەر بە سەرمایەداری و دزی دەوەستێتەوە. تا ئەو جێگایەی بکرێ کەمتر کەڵك لە حکوومەت وەردەگرێ و ئەودەمیش، دەستتێوەردانی حکوومەت



زیاتر بۆ پشتگیری و یارمەتیدانی هەوڵ و رەوتێکە کە بە هیممەتی خەڵك وەڕێ خراوە. دەیگوت: "پێموایە ئەگەر خەڵك خۆی دەستپێشخەری بکا، ئەودەم سیاسەت، چاودێر و پارێزەریان دەبێ." لەو روانگەیەوە و لە زۆر روانگەی دیکەوە، گاندی جەمسەری تەواو پێچەوانەی سەرۆکی فەرماندە ستالینە. تەنیا ژمارەیەکی کەم لە هاوڕێ نزیکەکانی ستالین دەزانن کە ئەو پەیمانی برایەتی لەگەڵ چ شتێکدا بەستووە و خۆی بە چ ئامانجێك فرۆشتووە، یان لەجێدا ئەو کارەی کردووە یان نا. خەڵك نازانن ماڵەکەی لە مۆسکۆیە یان لە دەرەوەی شارە یان لە کوێ رۆژانی پشوودان دەباتە سەر. کاتێ دەچێتە سەفەر، شەمەندەفەرە تایبەتەکەی بەنهێنی بەڕێ دەکەوێ. نابێ هیچ کەس پێبزانێ. ناهێڵن هیچ کەس لە هێڵی شەمەندەفەر نزیك بکەوێتەوە. ستالین لە نۆڤەمبەری ١٩٣٢دا لە ڕێوڕەسمی بە خاکسپاردنی هاوسەری پێشووی لە دوای تەرمەکەوە بە شەقامەکانی مۆسکۆدا دەڕۆیی. بەڵام سەیر ئەوەیە، پۆلیسی نهێنی هەموو ئەو شەقامانەی پاکسازی کردبوون و بە درێژایی ڕێگاکە پیاوی خۆی لە باڵاخانەکان دانابوون تا نەهێڵن خەڵك لە پەنجەرەکان نزیك بکەوێتەوە.

- ژیانی گاندی کتێبێکە تەواو ئاوەڵا و کراوەیە.

- ستالین لە پشت پەردەیەکی ئەستووردا دەژی. هیچ ستەمکارێك لە رەعیەتەکانی نزیك ناکەوێتەوە.

- مەهاتما هیوادارە کە دزەکە چارەسەر بکا.

- کرملین لە ئاوریلی ١٩٣٥دا سزای مەرگی منداڵانی تاوانباری ١٢ساڵە و گەورەتری پەسند کرد.

- گاندی حەزی نەدەکرد کە جووتیارەکان راپۆرتی دزێك بدەنە کاربەدەستان.

- رژێمی بۆلشەڤیك[١٧] چاوی لەوەیە کوڕان و کچان، بەسەر دایك و باوکیانەوە ببنە جاسووس.

- گاندی رق و شەڕخوازی لە دەست نایە.

---

(١٧)Bolshevik بالی زۆرینەی حیزبی سۆسیالیستی روسیا.

– ستەمکاری، لەسەر بنەمای رق و ئەشکەنجەی هەمیشەیی دامەزراوە. لە رۆژانی سەرەتا و کەمتر پڕنەهامەتیی ستەمکاریی بۆلشەڤیکی، لێنین داوای لە مارتۆف، ڕێبەری مەنشەڤیکەکان[18] و چەندین دژبەری سیاسیی دیکە کرد بۆ ئەوەی نەگیرێن، رووسیا بەجێبێڵن. بەڵام ئەمڕۆ دەروازەکانی روسیا گاڵە دراون. لە ساڵی ١٩٢٢ تا ئەمڕۆ هیچ پەنابەرێکی دژی سۆڤیەت نەیتوانیوە رووسیا بەجێبێڵێ.

ستالین لە گورجستاندا، لە نێو دڵی چیا سەخت و دڵڕفێنەکانی قەفقازدا لە دایك بوو. تا ئەم دواییەش، گورجییەکان دەرگیری دوژمنکاریی خوێناوی بوون کە بە مەرگ و کوشتن نەبوایە کۆتاییان پێنەدەهات.

ستالین زۆر بەر لەوەی لە سەر سیاسەتی ئابووری یان شۆڕشی جیهانی بە دژی ترۆتسکی بوەستێتەوە، کێشەی لەگەڵ پەیدا کردبوو. ئەم دوو کەسە لە شەڕی ناوخۆی ساڵانی ١٩١٨ تا ١٩٢١دا رکابەری یەکتر بوون. ناوی ترۆتسکی هەمیشە ئاوەڵدووانەی ناوی لێنین و بە مانای دامەزرێنەری شۆڕش بوو. دوو وشەی لێنین و ترۆتسکی هەمیشە پێکەوە دەهاتن. ترۆتسکی وتاربێژێکی بەتوانا و وەستای زۆر باشی نووسین بوو. خوێندنی باڵا و خوێندنەوەی بەربڵاوی هەبوو. شارەزای فەلسەفە و مێژوو بوو. بە زمانی فەڕەنسی و ئەڵمانی و ئینگلیزییەکی پاراو دەدوا. دنیای دەناسی و دنیاش دەیناسی. لەلایەکی دیکەوە، ستالین دەورێکی گرنگی لە بەرپاکردنی شۆڕشی ١٩١٧دا هەبوو بەڵام ئەو رۆڵە زۆر کەم بایەختر و زۆر نەناسراوتر لە هی ترۆتسکی بوو. ستالین نە وتاربێژە و نە نووسەر. هیچ زمانێکی بێگانە نازانێ.

من چاوپێکەوتنێکی ٦ سەعات و چارەگم لەگەڵ ستالین بووە. مرۆڤێکی خۆڕاگر و بەئیرادە و پتەوە. هێزێکی گەورە لە پشت ئەو قورس و قایمی و بەسەر خۆدا زاڵبوونەیەوە هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا وەك ترۆتسکی سەرنجڕاکێش و راکێشەر نییە. ستالین بە توانای راکێشەری یان کارتێکردن نییە کە سەردەکەوێ، بەڵکو بە پشت قایمی و پشتگیریی حیزبی، بە پیلانگێڕی و فێڵ و تەڵەکە و بە توانا

(١٨)Menshevik باڵی کەمینەی حیزبی سۆسیالیستی رووسیا.



ڕێکخستنەکەیەوە ڕێگەی گەیشتنە لووتکە دەبڕێ. ئەو بە سەر تەرمی هاوکارەکانیدا بە تایبەتی لیۆن ترۆتسکیدا کە رقی دنیای لێدەبۆوە، گەیشتە لوتکەی دەسەڵات.

ستالین هەر لە کاتی ژیانی لێنیندا دەستی بە بنکۆڵکردنی پێگەی ترۆتسکی کردبوو. بە جۆرێك کە کاتێ لێنین لە ساڵی ١٩٢٤دا مرد، جێگرە سروشتییەکەی واتە ترۆتسکی، لە دەسەڵاتی باڵا لادرابوو. لە راستیدا ستالین و هاوڕێکانی دوامین وەسیەتی سیاسیی لێنینیان ژێر پێ نا. ئەو لەو دەربڕینەی خۆیدا پێشنیازی بە هاوڕێیان کردبوو "ڕێگەیەك بۆ لادانی ستالین بدۆزنەوە." تیمی سێ کەسیی ستالین و زینۆڤیۆف و کامێنۆف دوای لێنین گەیشتنە دەسەڵات. ستالین بە یارمەتیی زینۆڤیۆف و کامێنۆف درێژەی بە لێدانی ناوبانگ و سەنگی ترۆتسکی دا. لەو ڕێگایەدا دەستی لە هیچ کارێکی بێزەوەر نەپاراست. دواتر گەلێ کتێب لە رووسیای سۆڤیەتدا لە بارەی لەشکری سوور بڵاو کرانەوە کە تێیاندا یەك جاریش ناوی ترۆتسکی، ڕێکخەر و یەکەم هەڵسووڕێنەری لەشکرەکە نەبردرا.

دواجار ترۆتسکی لە ڕێبەرایەتی حیزب لادەدرێ. دەچێتە پاڵ دژبەرە ئاشکراکان. ساڵی ١٩٢٩دەگیرێ و دوور دەخرێتەوە تورکستان.

بەم حاڵەشەوە ترۆتسکی هەزاران کیلۆمەتر دوور لە مۆسکۆ، لە ئابلۆقەی پیاوانی پۆلیسی نهێنی گ. پ. ئۆدا، دیسانیش چقڵی چاوی ستالینە. ئەو هێشتا لەلای سوپا و لاوان و هەروەها لای خەڵکیش کەسایەتییەکی بەوەجە کە ورەیان پێدەبەخشێ. هێشتا قۆناغی ئیعدامی سەرکردەکانی سۆڤیەت دەستی پێنەکردووە. بۆیە دوور دەخرێتەوە تورکیا. ئەوەش ستالین ئارام ناکاتەوە. زەخت لە تورکیا دەکا دەری بکا. ترۆتسکی دەچێتە فەڕەنسا. زەخت لە حکوومەتی فەڕەنسا دەکا و دوای ماوەیەك ترۆتسکی ناچار دەبێ کۆچ بکاتە نۆروێژ. لەوێش کۆمۆنیستانی خۆجێیی و دەستوپێوەندانی سۆڤیەت، ژیانی لێ تاڵ دەکەن. دواجار ترۆتسکی رووودەکاتە مەکزیك. لەوێ بە دەستی پیاوانی ستالین دەکوژرێ.

ستالین کە بە یارمەتیی زینۆڤیێڤ و کامێنۆف، ترۆتسکیی ڕەتاندبوو، لەگەڵ بوخارین، ریکۆف و تامسکی کلکیان لێکدەئالێنن تا سەری زینۆڤیێڤ و کامێنۆف بە فەتەڕات بدەن. سەردەمێك ستالین و کامێنۆف، وێنەیەکیان لەگەڵ لێنین گرتبوو کە لەملاوئەولای لێنین ڕاوەستابوون. ستالین کامێنۆڤی لە وێنەکە قرتاند و ملیۆنان دانەی لە وێنەی خۆی و لێنین، بە سەرانسەری وڵاتدا دار و پەخش کرد. زینۆڤیێڤ و کامێنۆف نزیکترین هاوکاری ستالین و هەروەها نزیکترین هاوکاری لێنین بوون. بەڵام ستالین سیاسەتی لەناوبردنی کەسایەتییە سیاسییەکانی تا جێگایەك درێژە پێدا کە دواجار، کار گەیشتە ئەوەی بە فەرمانی ئەو، زینۆڤیێڤ و کامێنۆف ئیعدام کران.

دوایەش، بوخارین و ریکۆف کە لە دژی زینۆڤیێڤ و کامێنۆف یارمەتیی ستالینیان دابوو، دوای دادگاییکردنی بەناوبانگی مۆسکۆ ئیعدام کران. هاوکارەکەی تریشیان واتە تامسکی، سەرۆکی جووڵانەوەی یەکێتییە کرێکارییەکانی سۆڤیەت، پێش ئەوەی بتوانن دەستگیری بکەن، خۆی کوشت.

دوای ئەوە، ستالین لە شوێنی هەرە ژووروروی شانشین پاڵی لێدایەوە و ئەوی لە بەردەستیشی بوون وەك بووکەشووشە ریزیان بەست.

دوای ئەوە، شەڕێکی نەخشە بۆ کێشراو دەستی پێکرد تا خەڵك ناچار بە قەبووڵکردنی تایبەتمەندییە بەزرەکانی ستالین بکەن! لە هەر دەرفەتێکدا، لە ملیۆنان دەرفەتدا، ناوی ستالین و وێنەی لێنین لە تەنیشت یەکتر دانران. ستالین جێگەی ترۆتسکی گرتەوە.

لەوکاتە بە دواوەیە کە ستالین سیستەمی سۆڤیەتی دروست کردووە. فەرمانەکان، ڕێوشوێنەکان، ئەدەب و فەرهەنگ و دامەزراوەکانی ئەم سیستەمە، گشتی جێپەنجەی ئاشکرای ستالینیان پێوە دیارە.

– گاندی بە وتە و کردەوە و ژیانیەوە هەڵدەسەنگێنرێ.(١٩)

(١٩) دوای وتاردانی ئێجگار کاریگەری گاندی لە بەردەم دوو ئەنجومەنەکە و کابینەی ئینگلیزدا، پەیامنێرێك لە سکرتێرەکەی دەپرسێ: ئەدی چۆن بوو گاندی بۆ ئەم دانیشتنە مێژووییە، لە پێشدا



– ستالین بەو تەقەللایانە و بە سۆڤیەتە دەستکردەکەیەوە هەڵدەسەنگێنرێ. ئەو رووسیا وەك وێنەی زیهنیی خۆی دادەڕێژێتەوە.

یەکێتی سۆڤیەت، بە سەرکردایەتی ستالین پرۆژەی زەبەلاحی بە ئەنجام گەیاندوون. گەلێ شاری نوێ و کارگەی نوێ و زلی دروست کردوون. رووسیا بووە بە هێزێکی گەورەی پیشەسازی. رووسیا ئەگەرچی لە رووی ئابوورییەوە سەربەخۆ نییە – هیچ وڵاتێکی دیکەش ئەوتۆ نییە – بەڵام بە یارمەتیی کارگەگەلی تازە دروستکراو و سەرچاوەی سروشتیی نوێ کە زانا ماندوونەناسەکانی سۆڤیەت کەشفیان کردوون، ئێستا لە هەر کاتێکی تر باشتر دەتوانێ لە سەر پێی خۆی رابوەستێ. لەکاتی شەڕی دووەمی جیهانیدا، بەرنامەی یارمەتیدانی ئەمریکا، یارمەتیی رووسیای دا سەربکەوێ. بەڵام راستییەکەی ئەوە بوو کە بەبێ بەرهەمهێنانی پیشەسازیی دامەزرێنراوی ستالین و بەبێ بەکارهێنانی لە رادەبەدەر و بێ ئەژماری هێزی مرۆیی لە لایەن ئەوەوە، ئەڵمانیا لەوانە بوو یەکێتی سۆڤیەت داگیر بکا.

رووسیا لە ئاکامی شەڕ و لە سایەی دیپلۆماسیی بەهێز و شێلگیرانەی ستالینەوە، قەڵەمڕەوی دەرەکیی فراوانی خستوونە سەر خاکی خۆی. ستالین رووسیای بەهێزتر و گەورەتر کردووە. بەم پێیە، رێبواری رێگەی ئیڤانی مۆخۆف، پێتری مەزن و کاترینی مەزنە کە لە بەرفراوانکردنی ئیمپراتۆریی رووسیادا بەشدار بوون و لەبەرئەوە لە ئەدەبی سۆڤیەتدا زۆریان پێهەڵگوتراوە.

بەڵام، تەنانەت مێژووییتر لە گشت ئەو گۆڕانکارییە گەورانە، ئیشتراکیکردنی کێڵگەداریی سۆڤیەت لەلایەن ستالینەوەیە. هەموو کێڵگە کشتوکاڵییەکانی سۆڤیەت بەکردەوە موڵکی حکوومەتن و بە دوو شێوە رەنێو دەهێنرێن: یا کێڵگەی دەوڵەتین

نووسراو و یادداشتی ئامادە نەکردبوو؟ سکرتێرەکە وەڵام دەداتەوە:"ئەو هەست بە چی بکا بیر لەوە دەکاتەوە. ئەوەی بیری لێبکاتەوە دەیهێنێتە سەر زمان و ئەوی بەسەر زمانیدا دێ بە کردەوە ئەنجامی دەدات." ئەمە رەنگە نموونەیەك بێ لە یەکگرتوویی را و کردار، مادە و مانا، دەروون و دەرەوە... ئارامییەکی قووڵ لە زەین و ویژدان و دەروونێکی یەکدەست بێ کە لەو یەکگرتووییەوە سەرچاوەی گرتووە.

کە کرێکارەکانی، بە پێی کاری ڕۆژانە هەقدەست وەردەگرن و بەرهەمەکەی دەدرێتە حکوومەت، یان بە شێوەی کێڵگەی ئیشتراکی. سەدان هەزار کێڵگەی ئیشتراکی لە یەکێتی سۆڤیەتدا هەن. بەشی هەرە زۆری کشتوکاڵی سۆڤیەت لە کێڵگە ئیشتراکییەکاندا ئەنجام دەدرێ. کێڵگەی ئیشتراکی، گوندێکە کە زەوی، ئامراز و ئامێری حکوومەت بە کاردێنێ و بەشی هەرە زۆری بەرهەمەکەی دەداتە حکوومەت.

ئەوەندی دەشمێنێ بە گوێرەی کاری ئەنجامدراوی هەر کام لەو گوندییانەی لەسەر کێڵگەی ئیشتراکین، بەسەریاندا دابەشدەکرێ. هەر جووتیارێك پارچە زەوییەکی بچووکیشی بۆ سوود وەرگرتنی تایبەتیی خۆی هەیە کە کەم وا هەیە بگاتە ٤٠٠٠ مەتری چوارگۆشە. دەتوانێ بیکاتە شینایی و بێستان و، مریشك و کەڵەشێر و بەراز و شتی تری تێدا بەخێو بکا. ئەو بەرهەمانە بۆ بژێویی ماڵەوەن، ئەگەر شتێکیش زیاد بوو(!) دەکرێ لە بازاڕدا بیفرۆشێت. لە حاڵێکدا زیاتر لە **٩٥** لەسەدی جووتیارانی سۆڤیەت، بە شێوەی ئیشتراکی کار دەکەن، هیچ وەرزێڕێکی ئیشتراکی مافی ئەوەی نییە ئەسپ، گاجووت، گاسن، کامیۆن یان تراکتۆری هەبێ. ئەمانە سەرمایەن و تەنیا حکوومەت دەبێ سەرمایەدار بێ.

بە ئیشتراکیکردن دوای سەردەمی ئازادکردنی سڕفەکان[٢٠]ی ئەورووپا بەملاوە، یەکەم ئاڵوگۆڕە لە سیستەمی کشتوکاڵدا رووی دابێ. ئەم شێوە کارکردنە، بۆ رەنێوهێنانی زەوی لەچاو شێوازەکانی دی، شێوەیەکی زانستیترە. ئەم شێوەیە لە تیۆردا، کشتوکاڵی *قیاس گەورە* لەگەڵ داهێنانە تاکەکەسییەکان ئاوێتەی یەکتری دەکا. هەر ئەم خاڵە، ئامانجی سەرەکیی بە ئیشتراکیکردن بووە. بەڵام سیستەمی سۆڤیەت - بەو جۆرەی کە ستالین لە جەڕ و مەنگەنەی داوە- ئەو پلانەی بە لاڕێدا برد. لە راستیدا، وەرزێڕی ئیشتراکی، سڕفێکە بە تەواوی لە ژێر چاودێریی

(٢٠) سرف: لە ئەورووپای فیۆدالّدا، بەو کەسانە دەگوترا کە ملکی زەوی بوون و ئاغاکان، بە زەوییەوە دەیانفرۆشتن و دەستاودەستیان پێدەکردن.



حکوومەتێکدایە کە زەوی و بنەتۆو و ئامرازی بۆ دابین دەکا، حکوومەتێك کە خۆی هەموو بەرهەمەکە لە بازاڕدا دەفرۆشێ.

کێڵگەی ئیشتراکی لە رەمزێکی سۆسیالیزمی پێشکەوتوو دەچێ، بەڵام لە کردەوەدا، دامەزراوێکی حکوومییە و ئازادیی تێدا نییە. قەوارە، قەوارەیەکی سۆسیالیستییە، بەڵام رۆح، هەمان رۆحی ستالینە: سەختگیری، دەسەڵات لە سەرەوە و لە دەرەوەڕا. لە هەر کۆمەڵەیەکی ئیشتراکیدا تاقمێکی ئێجگار کەم، خواستی کرملین جێبەجێ دەکەن...

کێڵگەکانی سۆڤیەت، پاژنەی ئاشیلی شێوازی ستالینین کە تێیدا خاوەن زەوییەك لە ئارادا نییە و سەلەمخۆرێکیش بوونی نییە. ئەم شێوازە دەبوایە گوندییەکان وا لێبکا بە باشی خۆیان ماندوو بکەن. ئەوان بۆ خۆیان و بۆ حکوومەتێك کار دەکەن کە حکوومەتی خۆیانە. بەڵام ئەمە ئەو شتە نییە کە لە واقیعدا روودەدات. کرملین ناچار بووە کاملترین سیستەمی هەقدەستی رەچاو بکا.

وەرزێڕانی کێڵگە ئیشتراکییەکان، وەك کرێکاری کارگایان، بە پێی رادە و جۆری کارەکەیان، هەقدەستیان دەدرێتێ. ئایا ئەم شێوازە نابێ هانیان بدا زیاتر کار بکەن؟ بەڵێ سروشتییە کە هانیان نادات!

هەموو جارێ کە وەختی کێڵانی زەوی، داچاندنی بەهاروو، تۆم چاندنی پایزە یان کاتی دروێنە دێت، تاقمێك کاربەدست لە مۆسکۆ هەڵمەتێکی گەورەی پڕوپاگەندە لە سەرانسەری وڵات دەست پێدەکەن. بۆچی دەبێ جووتیاران بۆ جووت و داچاندنی زەوی بانگەواز بکرێن؟ خدەی سروشتیی جووتیار وەهایە کە بە ویستی خۆی لە سەر زەوی کار بکا و بەرهەمەکەی هەڵگرێتەوە، ئەمە پێویستی بە بانگەواز و هاندان و هەڵمەتی پڕوپاگەندە نییە.

بەڵام گشت رۆژنامە گەورەکانی شار، لە مۆسکۆ، لە لێنینگراد و زۆربەی شارە گەورە پیشەسازییەکانی سەرانسەری رووسیا، سەروتاری دوور و درێژ لە سەرەتا و کۆتایی ساڵ دەنووسن کە پڕن لە داد و هاتوهاوار لە دەست کێڵانی درەنگوەخت،

دواکەوتن لە داچاندنی زەوی، رزینی خەلە و خەرمان لەسەر جۆخین، یان تراکتۆری تەعمیرنەکراو.

ئەم کاروبارانە بە شارەییان چی؟ بۆچی دەبێ شارەیی بە گوندییەکان بڵێن ئەمە بکەن و ئەوە مەکەن؟

*نامەی ئەدەبی* گۆڤارێکی حەفتانەیە کە لەلایەن *ئیدارەی گشتیی یەکێتی نووسەرانی یەکێتی سۆڤیەت* بڵاو دەکرێتەوە (سەرنج بدەن کە بڵاوکەرەوە *ئیدارەی گشتیە* نەك *یەکێتی نووسەران*) لە ژمارەی رۆژی ١ی مارسی **١٩٤٧**دا بابەتێك هەر چوار لاپەڕەی گۆڤارەکەی داگرتووە. ئەو بابەتە تەوای لاپەڕەی یەکەم و دووهەم و سێهەم و چوارەمی پڕ کردۆتەوە. بێجگە لەو بابەتە هیچ بابەتێکی تر لە گۆڤارەکەدا نییە. وتارەکە بریتییە لە دەقی بڕیارنامەی پەسندکراوی مەکتەبی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنستی سۆڤیەت، موو بە مووی دەقەکە، بێ یەك وشە زیاد و کەم و بە بێ هیچ راڤە و لێکدانەوەیەك. ناونیشانەکەشی ئاوایە: *لەبارەی هەوڵدان بۆ باشترکردنی کشتوکاڵ لە قۆناغی دوای جەنگدا*.

ئەمر کراوە کە هەموو بڵاوکراوەیەك لە یەکێتی سۆڤیەت دەبێ ئەو بڕیارنامەیە لە چاپ بدا، بۆیە *نامەی ئەدەبی* ژمارەیەکی تەواوی خۆی بۆ تەرخان کردووە. نووسەرانی سۆڤیەت بابەتەکەیان لە رۆژنامە ئاساییەکاندا خوێندبۆوە. بەڵام *نامەی ئەدەبی* نەیوێرا بڕیارنامەکە بڵاو نەکاتەوە یان هیچ نەبێ کورتی بکاتەوە. هیچ کەس زات ناکا راگەیەنراوەکانی ترۆپکی قووچەکەکە هەڵپەرتێوێ یان دەستکارییان بکا.

بڕیانامەی چاککردنی کشتوکاڵ فەرمانێکی ستەمکارانەیە بۆ کاربەدستی ناوچەکان، کە رووبەری کێڵگەکانی لۆکە، چەوەندەر، کەتان و گیای تفاق و ...هیتر، فراوان بکەن. ژمارەی ئاژەڵەکان زیاتر بکەن، ئاودێری باشتر بکەن، کارکردنی تیمی تراکتۆەکان و... باشتر بکرێن. دوای ئەوە دانی پێدادەنێ کە **لەو ساڵانەی دواییدا** کاری ناشایستی زۆر لە کێڵگە ئیشتراکییەکاندا روو دەدەن. دەقی نووسراوەکە، بە دەستنیشانکراوی پەنجە لە سەر **داگیرکردنی زەوییە نیشتمانییەکانی کێڵگەی**



**ئیشتراکی و دزینی دارایی کێڵگەکان وەکو ئاژەڵ، پارەی نەغد و شتی تر...** دادەنێ و لێی بە گازندەیە. فەرمان بە کاربەدستی ناوچەکان دەدرێ ئەو گەندەڵییە چارەسەر بکەن. بەڵام ئەو جۆرە کردەوانە ئاکامی دەسەڵاتی دژە *دیموکراسی* ئەندامانی حیزبی کۆمۆنیست لە سەر کێڵگەکان و ئەو زەبروزەنگەی ساڵانی نێوان **١٩٢٩ تا ١٩٣٢**یە کە تێیدا ملیۆنان گوندی ناچار کران بچنە ناو کێڵگە ئیشتراکییەکانەوە. وەزرێڕەکان، بە خۆشی یان بە زۆری بۆ ئەوەی رقی خۆیانی پێ بڕێژن، بەر لەوەی بچنە نێو کێڵگە ئیشتراکییەکانەوە، ملیۆنان سەر مەڕ و ماڵاتی خۆیان قڕکردن. ئەوان نەیانهێشت ران و مێگەلەکانیان ببرێنە کێڵگەکان. ئەورۆ، سەپانی کێڵگە ئیشتراکییەکان ماڵ و سامانی کێڵگەکان دەدزن، بۆ؟ ئاشکرایە، چونکە بە زۆر ناچاریان کردوون ببنە ئیشتراکی و ئێستاش ماڵی خۆیان و ماڵی *ئەوان* واتە ماڵی *حکوومەت* لێك جیا دەکەنەوە. گوندییەکان لە کێڵگەی ئیشتراکیدان، بەڵام رۆحی کاری ئیشتراکی، ونە. لە کێڵگەی ئیشتراکیی جوولەکەکانی فەلەستیندا کە بەراستی ئیشتراکین (چونکە خۆبەخشانەیە)، دزینی ماڵ و پارەی ئیشتراکی نە باسی هەیە و نە بە بیری کەسیشدا دێ. لەوێدا سیستەمی هەقدەستی بێ مانایە. هەموو کەس تا ئەوپەڕی توانای خۆی کار دەکا و بە قەد ئەوانی دیکەش بەرهەمی دەست دەکەوێ.

ستەمکاری دەتوانێ دەست بداتە کاری گەورە و راپەڕێنێ - ستالین سەد ملیۆن لادێیی لێخوڕییە کێڵگە ئیشتراکییەکان - بەڵام ناتوانێ وردەکارییەکان چارەسەر بکا. ستەمکاری نەیتوانیوە دەروونناسیی وەرزێڕەکان دابڕێژێتەوە. شێوازەکانی هەڵەن.

ستالین دەسەڵاتی راستەقینە و داهێنانی خۆی لە ترۆپکی قووچەکەکەدا بەند کردووە. سروشتییە کە دەسەڵاتی ستەمکار دەبێ(!) ئەم کارە بکا، چونکە ستەمکارە و لە زاتیدایە، بۆیە دەبینی هیچ شتێك لە رووسیادا بۆخۆی بە شێوەی ئۆتۆماتیکی کار ناکا. هەموو شتێك **هەڵمەتێکە**. پلاندانان بۆ چاندنی گەنم هەڵمەتە و بڕینەوەی

مووڕەدار هەڵمەتە، بۆیە وزەیەکی ترسناك لە ناوەند - واتە مۆسکۆ- بۆ دەستپێکردن و وەڕێ خستنی ئەو هەڵمەتانە خەرج دەکرێ.

ماهیەتی رژێمێك تەنیا بە پێی هەڵوێستی وی لەمەڕ بەنیشتمانیکردنی کارگاکان یان زەوییەکان دیاری ناکرێ. چونکە دەکرێ پشتیوانی ئەو شتانە بێ و لە هەمان کاتدا فاشیستیش بێ. ئەوەی گرنکە پەیوەندیی رژێمەکەیە لەگەڵ حیزبە سیاسییەکان و سەندیکاکان و بەرپرسە هەڵبژێراوە ناوچەییەکان (شۆرا، ئەنجومەن، سەندیکا.) ئەگەر حکوومەتێك وا بیر بکاتەوە کە: ئێستا کە ئەو دەسەڵاتدارە، حیزبە سیاسییەکان، سەندیکاکان و خۆبەڕێوەبەریی شار و گوندەکان ئیدی پێویست نییە، ئەمە خودی دیکتاتۆرییەتە. جا، رژێم لەبارەی بە نیشتمانیکردنی کارگا و زەویوزار چی کردبێ ئیتر گرنگ نییە.

کەسێتی و ناوەڕۆکی دەسەڵاتێك بەپێی هەڵسوکەتی وی لەگەڵ سامانی بێگیان دیاری ناکرێ، بەڵکو بە گوێرەی رەفتاری لەگەڵ مرۆڤە زیندووەکان دەنرخێنرێ. سیستەمێکی سۆسیالیستی لەوانەیە زەویوزار لە چنگی خاوەندارێتی تایبەت دەربێنێ و لە بەرامبەردا سرفەکان ناچار بکا کاری لەسەر بکەن. لەوانەیە کارگاکان لە خاوەندارێتیی تایبەت رزگار بکا و لەجیاتیان، لە هەمان کارگایاندا کرێکارەکان بکاتە کۆیلە.

چاکسازیی زەویوزار، بە نیشتمانیکردن و پلاندانان دەبێ بە گوێرەی کاریگەرییان بە سەر مرۆڤەکانەوە هەڵبسەنگێنرێ، نەك لەبەر چەندایەتی و رواڵەتیان. دڵتەزێنترن شکستی رووسیای ستالینی، توانەوەی بەرە بەرە و ئێستا لەناوچوونی یەکجارەکی بەشداریی گشتی لە کاروبارە پێناسەکراوە رەسمی و راگەیەنراوەکانی کۆنترۆڵی سیاسییە، لەوە بگەڕێین کە واقیع لەوەش دڵتەزێنترە.

فرۆشگا هەرەوەزییە (تعاونی)کانیش، راست وەك کێڵگە ئیشتراکییەکان کراونەتە حکوومی. فرۆشگای حکوومی. بەم جۆرە، گرێبەستی بەکۆمەڵی یەکێتییەکانی کارمەندانی سۆڤیەت، لەساڵی ١٩٣٥دا هەڵوەشێنرایەوە. لەو کاتە بەدواوە، سەرۆکی



کارگە و سەرۆکی دایرە، یەك لایەنە دادەمەزرێنن، یەك لایەنە دەردەکەن و یەك لایەنە مووچە دەبڕنەوە.

ئەمانە گشتی، بە مانای رەتکردنەوەی دیموکراسیی ئابوورییە، واتە دیکتاتۆریەتی ئابووری.

سوویەتەکان، یان ئەنجومەنە دەسەڵاتدار و چاودێرەکانی سەر گوند و شاران، کە بۆ ماوەیەکی کورت، واسیتە و ئامرازی دەوڵەتی دیاریکراوی خەڵکانی رێسامەندی شارۆچکەکان بوون، ئێستا دایرەگەلێکی بۆرۆکراسی و کاغەزبازن کە کاربەدەستە مووچەخۆرە کۆمۆنیستەکان، بەڕێوەیان دەبەن. دەنگی گەل ئیتر نابیسترێ.

ئەمە رەتکردنەوەی دیموکراسیی سیاسییە، دیکتاتۆریی سیاسی بە دیکتاتۆرێکەوە بە ناوی ستالین.

ستالین هەر بەم شێوەیە، ئەنجامدەری گەشەکردنی خێرا و هەمەلایەنەی پەروەردە و فێرکردنی سۆڤیەتە، هەر لە باخچەی ساوایانەوە تا زانکۆ و دامەزراوە فێرکارییە تایبەت و باڵاکان. من وەك پەیامنێرێکی بیانی کە ماوەی ١٤ساڵ لە رووسیا بووم و وەك بولبول فێرە زمانی رووسی بووم، سەردانی گەلێ شوێنی ئەو وڵاتەم کردووە. لە هەر شوێنێکدا لەگەڵ گۆڕانکاریی ئیجابیی ئیمکانیاتی نوێی خوێندن و پێشکەوتن بەرەوڕوو بووم. کرێکار و گوندی و چیاییە هەژارەکان هەستیان دەکرد کە لە ژێر دەسەڵاتی حکوومەتی تزاردا تا ئێستاش دەبوایە نەخوێندەوار بان. بەڵام ئێستا زۆر دایکی لادێیی بە شانازییەوە دەڵێن: "کوڕێکم مامۆستایە، ئەوی دیکەم ئەفسەری لەشکری سوورە و کچەکەم سەرکرێکاری کارگەیە. من بۆخۆم دەتوانم رۆژنامە بخوێنمەوە و..."

ئامانجی فێرکاریی سۆڤیەت، بردنە سەری ئاستی لێوەشاوەیی تەکنیکی، خزمەتکردن بە حکوومەت و گوێڕایەڵیی بێ ئەملا و ئەولای سەرۆکە. ملیۆنان کەس فێر بوونە بنووسن و بخوێننەوە، بەڵام ناتوان ئەوەی ستالین حەزی لێناکا بیخوێننەوە یان بینووسن. هێنانی رۆژنامە و گۆڤاری بێگانان قەدەغەیە.

سانسۆرچییە تۆقیوەکان، ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی سۆڤیەت بە وردی دەدۆزن و تەتەڵەی دەکەن. تەنیا ئەو کتێبەی بێگانان وەردەگێڕدرێن کە بە چاکە باسی یەکێتی سۆڤیەتیان کردبێ، یان لایەنە خراپەکانی ژیانی میللەتێکی دیموکراتیان دەرخستبێ و ڕەخنەیان لێگرتبێ. نووسەرانی سۆڤیەت داکۆکی لە گوتاری دەسەڵات دەکەن، دەنا بایەخیان پێنادرێ یان لە کوشتوبڕێکدا سەریان تێدادەچێ. هەر نووسراوێکی ترۆتسکی، بوخارین، رادك و مەزنانی سۆڤیەت کە لەناو بران و هەروەها ئاماژەکردنی ئیجابیانە بە نووسینەکانیان، بە دیقەتەوە لە کتێبە مێژوویی و زانستی و پەروەدەییەکانی سۆڤیەت دەرهاویژراون. هەندێ کتێبخانەی دەگمەن، کتێبی دژ بە ستالینیان تێدان، بەڵام بە بێ ئیزنی تایبەت لە کاربەدەستە هەرە باڵاکان، نادرێنە کەس.

کەسانێك ئەمەش ناو دەنێن دیموکراسی!

ستالین ئێجگار ئۆگری ئەدەب، شانۆ، مۆسیقا، پەیکەرسازی، ئاڤاکاری و نیگارکێشیی سۆڤیەتە. ئەو دەیەوێ دڵنیا بێ کە نووسەر و هونەرمەندان، لە هیچیان کەم نەبێ. لە ڕاستیدا  پێدەچێ ئەوان دەوڵەمەندترین خەڵکانی یەکێتی سۆڤیەت بن. زۆر جار، ستالین خۆی وای کردووە باڵەخانە یان حەسانەوەیان لە هاوینەهەواری سازگار بۆ دابین بکرێ.

شەوێك ستالین چووە تەماشاکردنی ئۆپێرای *خاتوو مەکبێس مەزنسك* دانراوی *شۆستاکۆڤیچ*، بەناوبانگترین ئاوازدانەری سۆڤیەت. ئۆپێراکە گاڵتەی بە چینی ناوەنجیی بێئەدەبی سەردەمی تزار کردبوو. تا ئەو شەوە، لە ڕۆژنامە گەورەکانی  وەك *پراودا* و *ئیزوستیا* بە ئابوتابەوە پێشوازیی لێکرابوو. ڕۆژنامە و هەفتەنامە و بڵاوکراوە شانۆییەکانیش بە شەوقێکی زۆرەوە لە سەریان نووسیبوو. کاربەدەستانی ڕووسیا کارئاسانیان کردبوو ئۆپێراکە لە دەرەوەش نمایش بکرێ و لەوێش سەرکەوتن بەدەست بێنێ. کاتێ کە بەڕێوەبەرانی فیستیڤاڵی نێونەتەوەیی شانۆ سەردانی مۆسکۆیان کرد ، نووسینگەی جیهانگەڕیی سۆڤیەت بەپەلە سەرنجی بێگانەکانی بۆ *خاتوو مەکبێس* ڕاکێشا. ئەم ئۆپێرایە چەندین ساڵ بوو لە مۆسکۆ و شارەکانی دیکەدا بە ئامادەبوونی



جەماوەرێکی زۆر نمایش دەکرا. لەگەڵ هەموو ئەوانەدا، ستالین ئۆپێراکەی بە دڵ نەبوو. بۆ بەیانییەکەی *دەیڤید زاسلاڤسکی* لە ڕۆژنامەی *پراودا*دا، بۆچوونی ستالینی لە وتارێکدا بڵاو کردەوە. ڕۆژنامەکانی دیکەش کە تا دوێنێ *خاتوومەکبێس* یان بردبووە پەڕپەڕۆچکەی ئاسمان، هەر زوو قسەکەی *پراودا*یان دووپاتکردەوە. ئۆپێراکە لە سەرانسەری ڕووسیادا ڕاگیرا.

**شۆستاکۆڤیچ بوو بە مۆسیقاڕێکی خراپ و، پەلاماریان دا.** تاچەندین مانگ دواتریش هیچ بەرهەمێکی نمایش نەکرا. تا دواجار ستالین دڵی نەرم بوو و بایکۆتی لەسەر هەڵگرت. ستالین چەند شەو دوای بینینی *خاتوومەکبێس*، چووە سەیری نمایشی ئۆپێرایەکی *دزرژینسکی*، ئاوازدانەری لاوی سۆڤیەت. مۆسیقاکەی بەدڵ بوو. دزرژینسکی بە جارێ کەوتە بەر پەسن و پێهەڵگوتنی هەموان.

بەدڵبوونەکانی ستالین یاسان. ئەو مۆسیقازان نییە، چ کۆرسی ڕەخنەی مۆسیقای تێپەڕ نەکردوون، بەڵام ملهوڕی وڵاتە و خاکەڕاش نییە. هیتلەریش لە باری نیگارکێشییەوە ڕەفتاری وەها بوو.

ملهوڕ، بیرمەند و زانای گشتییە، ئەو دەبێ باشترین نەخشەکێشی سەربازی، لێزانترین ئابووریناس، یەکەم شارەزای هونەری و گەورەترین نیشتمانپەروەری وڵات بێ! دەبێ سەری لە هەموو کارێك دەربچێ!

*بووریس پیلنیاك*، ڕۆماننووسێکی گەورەی سۆڤیەت بوو. ڕۆمانەکەی بە ناوی *ڤۆلگا دەڕژێتە دەریای خەزەرەوە* لە ڕووسیا زۆری لێ فرۆشرا. زۆربەی کتێبەکانی پڕفرۆش بوون. جارێکیان بۆ سەفەرێکی دەرەوە داوای پەساپۆرتی کرد. داواکەی ڕەت کرایەوە. چەندین کتێبی لە وڵاتانی دەرەوە بڵاو ببوونەوە و لە بەر ئەوە بەشی خۆی ئەرز (پارەی خاریجی) پێبوو خەرجی بکا. کەواتە هۆکاری ڕەتکردنەوەی داواکەی ناشێ نەبوونی ئەزر بووبێ. جارێکی دیکە داوای کرد و دیسان داواکەی ڕەت کرایەوە. دوای ئەوە، یادداشتێکی کورتی بۆ ستالین نارد. هەر ئەو ڕۆژە چەپەرێك لە لایەن ستالینەوە نامەیەکی شەخسی بۆ هێنا کە بەڵێنی دابۆیە، لەلایەن پیلنیاك - ەوە لەگەڵ

کاربەدەستە سەلاحییەتدارەکان (!) قسە بکات. لە ماوەی چەند رۆژدا پیلنیاك پەساپۆرتی وەرگرت و سەفەرەکەی کرد.

چەندین پەیامنێری ئەمریکی دەیانویست سەردانی ناوچەی ئۆڕال و سیبریا بکەن. مۆلۆتۆف وەزیری دەرەوە داواکەیانی رەت کردەوە. ستالین بەسەر مۆلۆتۆفدا بازی دا و ئیزننامەکەی دەرکرد.

ئەم کارانە بەشێك لە فرتوفێڵەکانی ستەمکارین. سەرۆك دەبێ دەسەڵاتداری موتڵەق و خێرخواز بێ. هەروەك لە ئەڵمانیای نازیش دەگوترا کە هیتلەر ئاگای لەو کارە ترسناکانە نییە کە روویان داوە، سیستەم دەیەوێ وێنەیەك لە کەسی ستەمکار چێبکا کە لە هەموو کەس باشتر بێ. کەس جورئەت ناکا لە ستەمکار باشتر بێ.

حکوومەتی سۆڤیەت بایەخێکی تایبەتی بە منداڵان داوە. گەرچی دەستی بۆ ئەو کارە ئاوەڵا نییە، ئاخر وڵاتەکە هەژارە. بەڵام باشترین شتەکان دەداتە نەسلی نوێ. *پێشگاڤان* - نوسخەی کۆپیی *پێشەنگان*[۲۱]ی ئەمریکی لە سۆڤیەتدا - دروشمێکیان هەیە کە لافیتە و تابلۆکانی خۆیانی پێ دەڕازێننەوە: "هاوڕێ ستالین سوپاس! بۆ ئەو ژیانە خۆشە."

هەموو جووڵە و ئاماژەیەکی ستالین، هەر وتە و زەردەیەکی بە دیقەت وەك ئامانجی کاریگەری سیاسی لێکدەدرێتەوە. کاتێ وەزیری دەرەوەی ئەڵمانیای نازی، *فۆن ریبن ترۆپ* و وەزیری دەرەوەی یەکێتی سۆڤیەت، *مۆلۆتۆف*، پەیمانی *روسیا - ئەڵمانیا*یان لە ئووتی **١٩٣٩**دا لە مۆسکۆ ئیمزا کرد، ستالین لە دانیشتنەکەدا ئامادە بوو. ستالین بەر

(۲۱)Scout Association ئەنجومەنی پێشەنگان، رێکخراوێکە کە پێشتر بە *کوڕانی پێشەنگ* یان Boy scouts ناو دەبرا و ساڵی ١٩٠٨ لە لایەن *لۆرد بادن پاول* بۆ یارمەتیدانی گەشەی کەسایەتیی کوڕان (و دواتر کچانیش) لە رێگەی فێرکردنی **باوەڕ بەخۆبوون، رێکوپێکی** و **خزمەتکردن بە خەڵك** و بەشداریکردن لە چالاکییەکانی دەرەوەی قوتابخانە و بە تایبەت کاری مرۆڤدۆستانە و کاروباری ئیداری دامەزرا. لە ئێرانی بەر لە شۆڕشی (١٩٧٩) کۆپییەکی کاڵ لەو رێکخراوە لە پەروەردە و فێرکردندا دەستی بە چالاکی کرد کە لە کۆتاییەکانی تەمەنی رژێمدا زۆر کاڵتریش ببۆوە.



لەوە قەت لە رێوڕەسمی ئیمزاکردنی پەیمانێکدا ئامادە نەدەبوو. وێنەیەکیان بە پێکەنینەوە لێگرت. ئەم وێنەیە بۆ راگەیاندنی رازیبوونی ستالین بە رووسیا و دنیا بەکار هێنرا. واتە: پەیمانی مۆسکۆ، خۆی رەزامەندیی لە سەر بووە.

رۆژێك لە ئۆکتۆبەری**١٩٣٥**دا رۆژنامەی *پراودای* مۆسکۆ بە حەماسەتەوە رایگەیاند کە "هاوڕێ جۆزێف ستالین بۆ سەردانی دایکی گەیشتە تفلیس (ناوەندی گورجستان). هاوڕێ ستالین دوای ئەوەی رۆژێکی تەواو لەگەڵ دایکی بوو، تفلیسی... بەرەو مۆسکۆ بەجێهێشت." دوای ئەوە دایکی ستالین کە تا ئەو کاتە کەس نەیدەناسی، لەلایەن رۆژنامەکانەوە چەندین چاوپێکەوتنی لەگەڵ کرا. هەواڵی سەردانەکەی ستالین لە سەروتار و رۆژنامەکاندا گەلێك پەسن درا. لە کۆبوونەوە رەسمییەکاندا، ئەو کۆمۆنیستانەی لە فکری پیرە دایکیاندا نەبوون، سەرکۆنە کران. *پراودای* یازدەی سپتەمبەری **١٩٣٥**، چیرۆکێکی لەبارەی خراپەکردن لەگەڵ پیرەدایکێك نووسی.

پڕوپاگەندەی شەخسیی وا بۆ سەرکردەکانی سۆڤیەت بە دەگمەن کراوە. پێدەچێ ستالین گەیشتبێتە ئەو ئەنجامە کە رەفتاری لاوەکان لەگەڵ دایك و بابیان پێویستی بە پێداچوونەوەیە. هاوکات هاووڵاتییانی سۆڤیەتیان وا فێر دەکردن کە لە تراموادا بەئەدەب بن. قسەیان بۆ پیاوە کۆمۆنیستەکان دەکرد کە بۆچی لە بیری منداڵانی تەڵاقدا نین کە لای هاوسەرانی پێشوویان بەجێ ماون؟ لە پڕێکا، ئەندامانی حیزب لە مۆسکۆ تەلەفۆنیان بۆ ژنە تەڵاقدراوەکانیان دەکرد کە چەندین ساڵ بوو نەیاندیتبوون، لێیان دەپرسین ئاخۆ دەتوانن سەردانێکی *لئوچکا بچکۆلە* یان *ڤاسکا ژیکەڵە* بکەن؟ گۆڕانکارییەکی گەورە خەریك بوو روو دەدا، بەڵام لە رووی ناچارییەوە. دیکتاتۆرییە نوێیەکان، خۆیان دەخزێننە میوانخانان و ژووری خەڵك و وەرشەی هونەرمەندان، هەروەها ناو کارگە و دایرە و کێڵگەکانەوە.

لەو دواییەدا ئەمرێك لە سۆڤیەت دەرچووە کە لەمەولا هاوسەرگیریی خەڵکی سۆڤیەت لەگەڵ بێگانان قەدەغەیە. هەموو رژێمە ستەمکارەکان بەڵێن دەدەن کە ژمارەی مناڵانی هەر ماڵباتێك زیاد بکەن. حکوومەتی رووسی دایکی ١٠ منداڵ و

زیاتر، خەڵات دەکا و مەدالیای دەداتێ. ستالین داهێنەری ئەو سیاسەتەیە. کاتێ لە ساڵی **١٩٣٦** لەگەڵ *کامینسکی* وەزیری تەندروستی( یان لە راستیدا ژەنەراڵی تەندروستی) چاوپێکەوتنم کرد و لێم پرسی چۆنە حکوومەت یاسای دژی لەباربردن پەسند دەکا و لە هەمان کاتدا زانیاری و ئیمکانیاتی کۆنترۆڵی زاوزێکردن، تەختی نەخۆشخانە، خانووبەرە و جلوبەرگ و... دەست ناکەون؟ لە وەڵامدا گوتی: "سەرۆك منداڵی زۆری دەوێ."

– لە رووسیا وشەی **سەرۆك** هەموو گفتوگۆیەك دەبڕێتەوە. هەمیشە **سەرۆك** راست دەکا.

– بەڵام گاندی دەڵێ: "من هەرگیز دڵنیا نیم ئەوەی دەیڵێم راستە." چونکە بەراستی لەوە دڵنیا نییە ئەوەی دەیڵێت راستە.[٢٢]

– گاندی ئامادەیە گوێ بگرێ و رای خۆی بگۆڕێ.

– ستەمکار دەبێ کەللەرەق، بێبەزەیی و توندوتیژ بێ.

– گاندی زۆربەی کات، خۆی (نەك خەڵکی تر) سەرکۆنە دەکات.

– ستالین خەڵك تاوانبار دەکات.

– گاندی لەگەڵ نەیارانی بە لێبوردوویی دەجووڵێتەوە و هەوڵ دەدا لەسەر خواستی خۆیان راکانیان بگۆڕێ (قەناعەتیان پێ بێنێ).

– ستالین دەمکوتیان دەکا.

– ستالین خوازیاری ملکەچییە.

– گاندی خوازیاری خۆشەویستی و ئەمەگدارییە.

(٢٢) گاندی دەڵێ من دایم لە حاڵی دۆزینەوە و ئەزموونکردنی هەقیقەت و فێربوون و قەرەبووکردنەوەی هەڵەکانی خۆمدام. بۆیە پێویستیم بە یارمەتیی هەموو لایەکە بۆ ئەوەی لە هەڵەکانم ئاگادار بکرێمەوە. (خەڵکی هەموویان بران، مەحموود تەفەزولی، ئینتشاراتی ئەمیر کەبیر).



## بەشی چوارەم

### ئاخۆ لە رووسیا ئازادی هەیە؟

ناوەڕۆکی سیستەمی دیموکراسی بەسراوەتەوە بە وەفاداریی تاك بەرامبەر تاکەکان، بەبێ خۆتێهەڵقورتاندنی حکوومەت.. بەڵام لە سیستەمی ستەمکاریدا پەیوەندییە تاکەکەسییەکان، دەرخەری ئەوپەڕی سیاسەت و لانیکەمی ئەخلاقە. هاووڵاتیی سیستەمی ستەمکاری، ملی ئەستوور دەبێ، چونکە دەبێ نیگای بە دوای کاربەدەستانی باڵادا هەمیشە روو لە سەرەوە بێ. هەموو پەیوەندییە تاکەکەسییەکان لە سیستەمی ستەمکاریدا بە کردەوە و راستەوخۆ دەکەونە ژێر رکێفی دەسەڵاتەوە. قەڵاچۆکردنەکانی سۆڤیەت، خەڵکێکی زۆریان لە ناو بردووە و گیان و ئازادییان لێ ستاندوون. بەڵام خراپترین کاریگەریی ئەو کوشتوبڕە، لەناوبردنی دۆستایەتی بووە. دۆستایەتی لە رێگەی هاموشۆ و گفتوگۆوە دروست دەبێ. لە رووسیادا **گوتن** ئێجگار زۆرە، بەڵام **گفتوگۆ** دەگمەنە. لە رووسیا، ئەمەگداریی بنەڕەتی و یەکجارەکی دەبێ بەرامبەر بە حکوومەت و بنەماکانی بێ. ئەگەر دۆستێك قسەیەك لای تۆ بکا و گومانەکانی بەرامبەر بە رژێم یا دژایەتیی خۆی بەرامبەر سەرۆکایەتی بدرکێنێ، ئەرکی تۆیە کە راپۆرتی لێبدەی. ئەگەر دەربکەوێ ئاگادار بووی و خەبەرت لێنەداوە، تووشی سەرئێشە دەبی. ئەگەر هاوڕێیەکت دەستگیر بکرێ - لەوێوە کە تەقریبەن هەمووان بۆ حکوومەتێکی ئاگراوی و لە شکست نەهاتوو کار دەکەن و کەواتە رێی تێدەچێ هەموو کەس بکەوێتە نێو تۆڕی یەکێکیان و دەستگیر بکرێ - دەبێ خۆبەخشانە ئەوی لەسەری دەیزانی بیڵێی. لەوەها بارودۆخێکدا متمانە و راشکاوی نامێنن. ئیتر ناتوانی قسەی دڵی خۆت لای هاوڕێکەت یان هاوسەرەکەت یان کوڕی خۆت بکەی.

کۆمۆنیستەکان وەکو فاشیستەکان، باشترین خووخدەکانی مرۆڤ بە خراپ بەکاردێنن. وشەکانیش بە قازانجی ئامانجەکانی خۆیان دەقرتێنن و دەگۆڕن:

لە کۆبونەوەیەکی گشتیدا داوایان لە گاندی کرد رای خۆی لە بارەی کۆمۆنیستانەوە[٢٣] دەرببڕێ. گاندی گوتی: پێم وایە ئەوان جیاوازی لە نێوان شەرافەت و دڕندەیی، لە نێوان راستی و درۆدا ناکەن. خۆیان ئەم تاوانە رەت دەکەنەوە، بەڵام ویژدانەن، ئەو رەفتارانەی لێیان دەگێڕنەوە راستیی ئەم بۆچوونە دەسەلمێنێ.

لە خشتەبردنی مرۆڤ، بە مانای بە کۆیلەکردنی مرۆڤە. خراپ بە کارهێنانی وشەکان، بە کۆیلەکردنی فیکری و فەرهەنگییە.

ئەمانە هەردووکیان رەتکەرەوەی ئازادین. کاتێ سیستەمێکی دیموکراسی، ئازادی مرۆڤ، ئازادیی بیرکردنەوە و ئازادیی رادەربڕین بەرتەسك دەکاتەوە، وەك سیستەمی ستەمکاری لێدی و لەوە بەدواوە بەشێك لە تواناکانی خۆی بۆ بەرگریکردن لە خۆی بەرامبەر بە ستەمکاری لە دەست دەدا.

سیستەمی دیموکراسی هەرچەندی گاندیگەراتر بێ، هێندە کەمتر ستالینگەرا و هیتلەرگەراتر دەبێ. کەواتە سیستەمە دیموکراسییەکان دەبێ لەسەر تابلۆی بەردین، پێڕستێك لە تایبەتمەندییەکانی ستەمکاری هەڵکەنن و وەك دە فەرمانەکەی کتێبی پیرۆز (ئینجیل) لە کۆتاییدا ئەوەشی لێ زیاد بکەن: **تۆ نابێ ملکەچیان بی.**

پێڕستێکی وا:

(٢٣) بەسەرنجدان بە سەرۆکایەتی و خۆسەپاندنی رەهای سۆڤیەتی ستالین بەسەر جووڵانەوە نێونەتەوەییە کۆمۆنیستییەکان و تەنانەت جووڵانەوە سۆسیالیستییە جۆراو جۆرەکان لە سەرانسەری جیهان، ئاشکرایە کە مەبەست لە کۆمۆنیست لەو پرسیار و وەڵامەدا، کۆمۆنیستی *راستەی* ژێر سێبەری سۆڤیەتە، نەك ئەو کۆمۆنیستە سەربەخۆ و ئازادبیرانەی کە ئەخلاقی مرۆییان بۆ بەرگریکردن لە کۆمۆنیزمی نێونەتەوەیی ژێر پێ نەدەنا.



١- پێهەڵگوتن و پەسندانی رەسمیی سەرۆکی هەڵەهەڵنەگر (بە دروشمی وەك هایل هیتلەر، ستالینی مەزن، دووچە، دووچە، دووچە[٢٤]، فرانکۆ فرانکۆ فرانکۆ[٢٥]، تیتۆ، تیتۆ،تیتۆ).[٢٦]

٢- وێهەڵنەکردن و رەتاندنی نەیارانی سیاسی.

٣- کەڵك وەرگرتنی بەردەوام لە زەبروزەنگ بۆ تەمبێکردن و تۆقاندن(تیرۆر).

٤- رێگەگرتن لە بیرکردنەوەی سەربەخۆ یان کردەوەی سەربەخۆ، هاندانی یەك بیچمی و چونیەکی.

٥- سپڵەیی بەرامبەر کەسانی هەقیقی.

٦- پێداگری لەسەر ئەمەگداریی سەرشۆڕانە بەرامبەر بە حکوومەت.

٧- موتڵەقگەرایی لە بیرکردنەوەدا، وێڕای ملکەچیی زیهنی بەرامبەر بە دەسەڵات: (سیستەمی فیکریی **من** هەرگیز ناشێ هەڵە بێ، سیستەمی فیکریی **ئەویدی** قەت راست نییە).

٨- کەمتەرخەمیی رژێم بەرامبەر بە بایەخدان بە گیان و ژیانی مرۆڤان، دڵخۆشی و ئەخلاقیان و بێویژدانی بۆ گەیشتن بە ئامانج.

٩- رەشبینی کەلبی[٢٧]ئاسا.

١٠- دەستکاریی مێژوو.

١١- پڕوپاگەندە و بانگەشەی بەردەوام لەمەڕ خێروبێرەکانی سیستەم بۆ بەردەنگانی ناوخۆ و دەرەوە.

١٢- پەلاماردانی هەوسارپساوانە بەرامبەر بە غەیری و بێبڕوا و جودابیران.

١٣- دڕدۆنگی بەرامیەر بە رەخنەی بێگانان.

(٢٤) نازناوی مۆسۆلینی، دیکتاتۆری فاشیستی ئیتاڵیا.

(٢٥) ناوی دیکتاتۆری فالانژیستی ئیسپانیا.

(٢٦) ناوی دیکتاتۆری ستالینستی یۆگسلاڤیای پێشوو.

(٢٧) رێچکەیەکی فیکری - فەلسەفی لە یۆنانی کۆن کە رقی لە ئاسوودەیی و رەفاهیەت دەبۆوە و بەرامبەر بە چاوگەی چاکەی رەفتاری مرۆڤ رەشبین بوو.

١٤- رەخنەی رەسمی و وشك لە بوودەڵە و مەئموورە بچووكەكانی حكومەت، بە بێ رەخنە گرتن لە دەسەڵات و حكوومەت، بە بێ رەخنەگرتن لە دەسەڵاتداری ستەمكار یان دۆست و خۆشەویستانی وی لە نێو تەلارنشین و پاسەوان و دەست و پێوەندانی سەرۆكایەتی، مەگەر رەخنەگرتن لەوانەی كە پێشتر بەر قەڵاچۆی دەسەڵات كەوتوون و بە شێوەی رەسمی یان رانەگەیەنراو لە دەزگای سەرۆكایەتی دوور خراونەتەوە.

١٥- نهێنیكاری و نەبوونی شەفافیەت و بەرچاوروونی.

١٦- دوورەپەرێزیی سەركردەكان لە پرایی خەڵك.

١٧- هاندانی منداڵبوونی زۆر.

١٨- هێزی سەربازیی زەبەلاح.

١٩- حەزكردن لە داگیركاری و فراوانكردنی خاك.

٢٠- ترسی سەرۆك و حكوومەت لە لاواز هاتنە بەر چاوی پرایی خەڵك.

٢١- گەورەكردنەوەی دوژمنی بێگانە بۆ بەهێزكردنی نیشتمانپەروەریی ناوخۆ و یەكێتیی نەتەوەیی.

٢٢- ملنەدان بۆ ئاڵوگۆڕی سیستەمی سیاسی.

٢٣- جێگۆڕكێ پێكردنی بەردەوامی كاربەدەستان و نائارامیی پۆستە حكومییەكان.

٢٤- بەرتەسك كردنەوەی روو لە گەشەی ئازادیی تاك.

٢٥- كۆنترۆڵكردنی سەندیكا و رێكخراوە كرێكاری و پیشەییەكان لە لایەن دەسەڵاتەوە.

٢٦- بێ توانایی سیاسیی جەماوەری جگە لە دەسەڵاتدار و پۆلیسی نهێنی، نائارامیی تاكەكەسی.

٢٧- خۆبەدەستەوەدان و ملكەچیی دەسەڵاتی دادپەروەری و یاسادانان بۆ دەسەڵاتدارانی بەڕێوەبردن.

٢٨- پشتگوێ خستنی دەستوور و یاساكان.



٢٩- سوود وەرگرتن لە رێژەی سەربازی، رێوڕەسم، لەشكركێشیی سێركئاسا و كەرنەڤاڵی و نمایشی بۆ هەڵخەڵەتاندنی بیروڕای گشتی.

٣٠- وابەستەیی و پاشكۆیەتیی زیهنی و كرداریی تاك بە حكوومەتەوە.

٣١- ئامادەیی تاك بۆ راكێشانی پشتگیری و لوتفی دەسەڵات لە رێگەی زمانلووسییەوە، تەنانەت بە نرخی ژێر پێ خستنی ویژدانیش.

٣٢- دارمانی تەواو عەیاری ویژدان.

گشت ئەو تایبەتمەندییانەی ستەمكاری، لە زل و قەبە نواندنی حكوومەت و بێئەنوایی و كلۆڵیی تاك زیاد دەكرێ، راست بە پێچەوانەی رێوشوێنەكانی گاندی!

لەلای دیكەوە، ئامانجی سەرەكیی دیموكراسی، گەشە و پێگەیشتنی تاكە بە هاوكاریی دەسەڵات، بەڵام چۆن؟ بە لغاوكردنی حكوومەت، بۆ ئەوەی تاك دانەكرۆژێ یان لە ژێر پێی خۆیدا نەیپلیشێنێتەوە.

دیموكراسی دەشێ لە بەرامبەر كەمینەی دەسەڵاتداردا داكۆكی لە زۆرینەی هەڵبژێر بكا.

هەروەها دەبێ كەمینەكان لە ستەمی زۆرینەی دەسەڵاتدار بپارێزێ و خودی كەمینەكانیش لە زوڵمی یەكتر بپارێزێ.

دیموكراسی مافی قسەكردن، خواپەرستی، كۆبوونەوە و دەنگدانە. دیموكراسی جگە لەمانە دەبێ مافی كاركردن، فێركردنی ئازادانە، ئاسایشی كۆمەڵایەتی و ئیمتیازی خانەنشینی بە رەسمی بناسێ.

دیموكراسی بەمانای ئەو مافانەیە كە لە چاوچێوەی یاسادان و قابیلی بەخشین و لێسەندنەوە نین. لە روسیا، خەڵكی ئیمتیاز و خێروبێری تایبەتیان دەدرێتێ، بەڵام هەمووی هی پیاوەتی و بەخشش و كەرەمی حكوومەتە، كەواتە دەكرێ بستێنرێنەوە. بەو مانایە كە لە سایەی سۆڤیەتدا مافێك بوونی نییە. ماف ئەو كاتە مافە كە نەشێ بستێنرێتەوە. لەوێ یاساش بوونی نییە. دەسەڵاتی بەهێزی بێسنوور، بە هەڵوەشاندنەوەی هەموو سەرچاوەكانی نەیاری دەسەڵات، شتێكە لە سەرووی یاسا –

یاسایەك بە قەد بەژنی دیکتاتۆری. یاسا کاتێك یاسایە کە بە یەکسانی حکوومەت و هەروەها هاووڵاتیی ئاسایی بگرێتەوە. سیستەمی ستەمکاری، بەم پێودانگە، رژێمێکی بێ یاسایە کە لەوێدا تاك بەرامبەر بە دەسەڵات کلۆڵ و دەستەوەستانە.

مرۆڤی ئەشکەوتنشین بە گۆپاڵەکەی دەستی دەیتوانی ستەم لە کەسێك یان دە کەس بکا. بەڵام دەسەڵاتداری ستەمکاری ئەمڕۆ بە کۆنترۆڵکردنی رۆژنامەکان، رادیۆ، سیستەمی پەروەردە، پۆلیسی نهێنی، دەزگا حکوومی و پیشەییەکان، دەتوانێ سەد ملیۆن کەس بخاتە ژێر رکێفی دەسەڵاتی خۆیەوە. سنعاتکاری سەدەکانی ناوەڕاست دوو شاگردی رادەگرتن. بەرهەمهێنەری ئەمڕۆی ئۆتۆمبێل سەدان هەزار کرێکار دادەمەزرێنێ. ئەورۆکە سەرمایەدارێك، بە بەراورد لەگەڵ حکوومەتێکی سەدەکانی ناوەڕاست دەتوانێ بە سەر مرۆڤی زیاتردا زاڵ بێ.

لەگەڵ پێشکەوتنی شارستانیەت، تاکی ئاسایی پێویستی بە پارێزگاری و ئاسایشی زیاتر هەیە. ئەو بەبێ بوونی دەسەڵات و دامەزراوی گەورەی ئابووری، بەدبەخت دەبێ. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، هاوکات لەوانەیە لە لایەن هەمان ئەو دامەزراوانەوە بەدبەخت بێ. ئەوە گەورەترین قەیران و تەنگژەی چارەسەرنەکراوی سەردەمی مۆدێرنە.

سیستەمی ستەمکاری **خراپە** لە دەسەڵاتی تەواو کەڵەکەبووی حکوومیدا نیشاندەدا.

دیموکراسی واتە مافی رەخنەگرتن و لادانی حکوومەت یان هەرکام لە ئەندامانی. هیچ ستەمکارێکی ئەورووپی یان ئاسیایی تا ئێستا بە دەنگی خەڵك لە کار لانەدراوە. لە سیستەمی یەك حیزبی یان پاوانخوازدا، ئەو خۆی هەر لە خۆوە ناتوانێ لە حوکم لابکەوێ.

لە حکوومەتی دیموکراسیدا، خولی بە نۆرەی نوخبەکان و هاتنە سەر کاری حیزبێك لە جیاتی حیزبێکی تر، تەنانەت ئەگەر حیزبەکان لە بەرنامە و بنەماکانیاندا زۆریش لێکدی جیاواز نەبن، دیسانیش کردارێکی تەندروستە، چونکە **دەست**



**بەسەرداگرتنی دەسەڵات بۆ ماوەیەکی زۆر بەکارهێنەرانی دەسەڵاتەکە گەندەڵ دەکات.** کەچی ستەمکار، کە دەسەڵاتەکەی دەسەڵاتێکی تەواوە، سەرۆکێکی تاهەتاییە. ئەو تەنیا توانای گوێگرتن لە **بەڵێ قوربانەکانی** دەوروبەری هەیە. لە ئاکامدا دووڕوویی و ماستاوچێتی گەشە دەکا، کەسایەتیی سەربەخۆ لە کزی دەدا و ئازادی دەمرێ. سیستەمی ستەمکاری بۆ ئەوەی بە رەعیەتەکانی و بە دنیاش بسەلمێنی جەماوەرییە، بەردەوام هەڵبژاردن وەڕێ دەخا. بەڵام ١٠ یا ٢٠ یان ٣٠ لە سەدی دەنگی دژی حکوومەت لە هەڵبژاردندا، بە مانای بوونی هێزێکی دژبەر (ئۆپۆزیسیون)ە و نیشانەی شکانەوەیە بە لای حیزبێکی نەیاردا. بۆیە هەڵبژاردن دەبێ لە سەداسەد هی خۆی بێ. بۆیە لە ئەڵمانیای هیتلەریدا، هەموو دەنگەکان (١٠٠٪) بەڵێ بوون. لە یەکێتی سۆڤیەت، بە پێی راپۆرتەکان، زیاتر لە ٩٩ لە سەدی دەنگەکان بە قازانجی حکوومەت بووە. سەد ملیۆن کەس لە سەر هیچ شتێك هاوڕانین جگە لە سەر ستالین! ئەوان نالێن تەلەفۆن شتێکی پێویستە، حەمام کردن کارێکی تەندروستییە، نان شتی چاکە! ئاخر هەموویان لە وەزعەکە رازین و خۆ بڕیار نییە ئۆپۆزیسیۆنێك هەبێ! ئەگەر لە دەنگنەدان بە ستالین نەترسابان، بە دڵنیاییەوە هیچ کەس دەنگی نەدەدایێ. ترس، راستییەکی بێ ئەملاوئەولای سیستەمی ستەمکارییە. لەو ناوەدا ترس و تۆقاندن (تیرۆر)ی سۆڤیەت ساڵ بە ساڵ توندتر بووە. دەستووری پاوانخوازی ئەمەیە: سیستەم پاوانخوازتر دەبێ.

وەزیری ناوخۆی بەریتانیا، *جیمز. سی. ئاد* دەیگوت: "ئێمە دیموکراسییەکی زۆر کۆنین و زۆر شۆخیبازین. بەڵام حکوومەتی ستەمکار قەت خۆی ناخاتە دەست شۆخی و پێکەنینەوە. هەمیشە مڕومۆچە. ئەم حکوومەتە پێویستی بە دوژمنە، چونکە دوژمن بیانوویەکە بۆ ئاژاوە و ترس و تۆقاندن. ئەگەر دوژمنێکیش لە ئارادا نەبێ، حکوومەت دروستی دەکا و شاخ و باڵی لێدەنێ.

خانمی *فرانکلین دی رۆزڤێلت* کە لە ناو سەرکردە سیاسییەکانی ئەمریکادا، گاندیگەراترین کەسێتییە، لەگەڵ وەزیری دەرەوەی سۆڤیەت *ئاندرێ ویشنیسکی* لە

دانیشتنی ڕێکخراوی نەتەوەکان لە ساڵی **١٩٤٦** لە بارەی مافی مرۆڤەوە دەدوا. پرسی: "ئایا ئێمە وەك نەتەوە تاق کەوتووەکان ئەوەندە لاوازین کە دەمانەوێ ڕێگە لە مرۆڤان بگرین ئەوی بیری لێدەکەنەوە دەریبڕن؟... من لە هەموو بوارەکاندا دڵنیا نیم حکوومەت یان نەتەوەکەم کارەکەیان دروست بێ، هیوادارم وا بێ، ئەوپەڕی هەوڵی خۆشم دەخەمە گەڕ حکوومەت لە سەر کاری ڕاست بڕوات." ڕۆزڤێڵت داوای لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان کرد تا ئەوەی دەبێتە هۆی ئازادیی مرۆڤ - **مرۆڤ نەك حکوومەت!** - لەبەر چاوی بگرێ.

ویشینسکی لە وەڵامی خاتوو ڕۆزڤێلت -دا گوتی:" ئێمە نامانەوێ تەحەمول و لێبوردەیی قەبووڵ بکەین." ئەمە خاڵی جەوهەریی لۆژیکی پاوانخوازییە. ستەمکار هەمیشە دەتوانێ پاساو بۆ تەحەمول نەکردنی بەرامبەرەکەی بهێنێتەوە. خەبات و لەخۆبوردوویی خەڵك، کە بۆتە هۆی بەدەستهێنانی دەسکەوتەکانی ئێستایان بیر دەخاتەوە و داوایان لێدەکا جودابیران تەحەمول نەکەن. ئاخر ئەمانە، دەسکەوتەکانی ئێستا دەخەنە مەترسییەوە. بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ستەمکار نایەوێ لێبوردە بێ، هەر لەجێدا ناتوانێ ئەهلی لێبوردەیی بێ. ئەوی دی هەمووی بڕوبیانووە!

ئاخۆ هیچ نیشانەیەك لە هەڵاتنی خۆری دیموکراسی لە ئاسۆی ڕووسیای سۆڤیەتدا دەبینرێ؟ ئایا هیچ گفتوگۆیەکی **ئازاد** لە نێوخۆی حیزبی کۆمۆنیستدا لە ئارادایە؟ تا دەوری ساڵی **١٩٢٩** هێشتا هەندێ باسوخواس لە ڕۆژنامەکانی سۆڤیەتدا بڵاو دەبوونەوە، بەڵام ئەمڕۆ بە جارێ ویشکاویان هاتووە. هیچ ئازادیی ڕادەربڕین، ڕەخنەگرتنێك لە حکوومەتی سۆڤیەت، لە ستالین یان سیاسەتی دەرەوەی سۆڤیەت بوونی هەیە؟ بڕای بڕ! جا کێ ناڵێ ستالین" مرۆڤێکی کامڵ و یۆتۆپییە کە هیچ هەڵە هەڵناگرێ! کێ ناڵێ حکوومەتی سۆڤیەت هەمیشە لە کردەوەکانیدا سەرکەوتووە، بۆیە هیچ گازندەیەك ڕوونادات!

نەخێر، ستالین و تاقمێکی کەم لە کاربەدەستانی سەروو، چەندین جار سیاسەتەکانیان ئاوەژوو کردۆتەوە و دانیان پێدا ناوە کە کاروبارەکان بە خراپی



چوونەتە پێش. (بۆ نموونە لە ئیشتراکیکردنی ساڵی **١٩٣٢**دا.) پاشان کاربەدەستە پلەنزمەکانیان - کە سەرەڕای بۆچوون و ڕای ڕاستتری خۆیان، فەرمانە هەڵەکانی ئەوانیان بەڕێوە بردووە - تاوانبار کردوون و لافاوی گلە و گازندەیان وەسەر گێڕاون. بەڵام هەر ئەو لافاوە بەر لەوەی سەرۆك پێشی بەردات، شتێکی یاساغ و بڤە بووە. ئەو - تەنیا ئەو - بۆی هەیە پەلامارەکە دەست پێبکا نەك کەسێکی تر!

ئایا سەندیکاکانی کرێکاری و کارمەندی دەسەڵاتێکی زیاتریان بە دەست هێناوە؟ دەتوانن مان بگرن یان گرێبەستی بەکۆمەڵ ببەستن؟ هیچ نیشانەیەکی، نابینرێ. ئایا هیچ پەیوەندییەکی زیاتر لە نێوان ڕووسیا و دنیای دەرەوەدا دروست بووە؟ هیچ نامە گۆڕینەوەیەکی ئازاد لەگەڵ بێگانان دەشێ ئەنجام بدرێ؟ یان چاپەمەنیی بێگانە ئازادانەتر دەگەنە ناو ڕووسیاوە؟ دیارە بە پێچەوانەوە. ئەمڕۆ ئەمانە گشتی لە سۆڤیەتدا کەمتر بوونە.

مرۆڤی پاساوەدەر و لایەنگری سیستەمی سۆڤیەت تەنیا دەتوانێ پەنجە لەسەر لایەنێکی کەمبوونەوەی ئەو بەرتەسکییانە دابنێ: بەڵێ، قەشەکان لە جاران کەمتر لە ژێر زەخت و ڕاوەدووناندان. کەنیسە ئێستا دەتوانێ قوتابخانەی ئایینی بکاتەوە و بابەتەکانی خۆی لە چاپ بدا. ڕژێمی خوانەناسی بۆلشەڤیك داکۆکی لە کەنیسەی کۆن و دەست تێوەرنەدراوی ئۆرتۆدۆکسی یۆنانی دەکا. ئایا ئەمە نیشانەی دیموکراسییە؟ نا، بەڵکو ڕاست پێچەوانەکەیەتی. تا چەند ساڵ لەمەوبەر پشتگوێ خستنی ڕەسمی، نەیدەهێشت کەنیسەی ڕووسی بچێتە پاڵ دامودەزگای حکومییەوە. ئێستا کرملین، کەنیسە بۆ ئامانجە پڕوپاگەندەییە نەتەوەخوازییەکانی لە ناوەوە و دەرەوەدا بەکار دێنێ. تزاریش هەر وای دەکرد. کەنیسەی ڕووس کراوەتە حکوومی. دەسەڵاتی سۆڤیەت دوامین دامەزراوی سەربەخۆی وڵاتیشی هەڵلووشیوە.

ئێستا زاڵبوونی حکوومەت بەسەر ژیاندا، کامڵ بووە.

مارکس و لێنین دەیانگوت دوای لەناوچوونی چینی خاوەندار و بە دەسەڵات گەیشتنی چینی کرێکار، حکوومەت سیس هەڵدەگەڕێ و بەرەبەرە لە ناو دەچێ.

بەڵام دەسەڵاتی رووسی، تەواو بە پێچەوانەی ژاکان و هەڵوەرین، بە شێوەی دەسەڵاتێکی هەمەلایەنە گەشەی کرد. ئەمڕۆ، چینی سەرەوەی نوێ کە دەسەڵاتی بە دەستە و ئامرازی بەرهەمهێنانی قۆرخ کردووە، چینی کرێکار دەچەوسێنێتەوە. مەودای نێوان زۆرترین و کەمترین داهاتەکان لە ژیانی رۆژانەی یەکێتی سۆڤیەتدا، لە هی هەموو وڵاتە سەرمایەدارییەکانی دیکە زیاترە.

ستالین ئەریستۆکراتیەتێك بەخێو دەکا کە لە خزمەتی بۆرۆکراسی ئیدارەکەیدایە و لە سەر حیسابی جەماوەر زۆر خۆش دەژی، بەڵام هیچ دەسەڵاتی نییە. **دەسەڵات هی سەرۆکە** و ئەمە ئەوە کە لەگەڵ پۆلیسی نهێنیدا دابەشی دەکات.

یەکێتی سۆڤیەت نموونەی هەرە بەرزی دیکتاتۆریەتە.

ئەوانەی ئاشقی ئازادین، لە **دەسەڵاتی قادری موتەعال** دەترسن.

لە روانگەی ئەوانەوە، دەسەڵات، دوا ئامانج و خەونی کۆتایی و هەموو شتێك نییە. دەسەڵات تەنیا ئامرازێکە. دوا ئامانج، مرۆڤە.

زۆربەی خەڵك هیوادارن مردنی ستالین، گۆڕانێك لە بارودۆخەکەدا پێك بهێنێ و بەشکەم لە رووسیادا ببێتە هۆی هاتنە ئارای دیموکراسی. بەڵام نازانن کە ستالین بۆیە ستەمکار کە ستەمکاری پێویستی بە پیاوانی وەك ستالین هەیە.

هەموو راوێژکار و دەستوپێوەند و جێگرە شیمانەییەکانی ستالین، تا سەر ئێسقان ستالینیستن. کەسێك ئەگەر وا نەبێ ناتوانێ لەلای سەرووی دیوەخانی بەزمی ستەمکاریدا پاڵی لێبداتەوە. هەموو جێگرە شیمانەییەکانی ستالین تا ئێستا، خۆیان لە دوامین و کەمترین بۆچوونە گاندیگەراکان داتەکاندووە، سیستەمی بە قووڵی پێنج داکوتاوی سۆڤیەت، ئاساییە ناتوانێ لەگەڵ گاندیگەرایی هەڵبکا.

ئایا رێی تێناچێ کە باشبوونی ستانداردی ژیان لە رووسیادا، ببێتە سەرچاوەی دیموکراسیی زیاتر؟ گەشەکردنی ستانداردی ژیان، لەلایەن سەرکردەکانەوە وەك بەڵگەیەك بۆ چاکتربوون و شەرعیەتدان بە سیستەمی ئێستا لێکدەدرێتەوە و ئەوان ئەم خاڵە فێری خەڵك دەکەن و لە مێشکیانی دەئاخنن.



گەلێ جار هەندێ لێکچوون لە نێوان شۆڕشی سۆڤیەت و شۆڕشی فەڕەنسا هێنراوەتە بەر باس: "شۆڕشی فەڕەنساش، ترس و تۆقاندن و تیرۆریزمی لە سەردەمی خۆیدا بە دواوە بوو و دوای ئەوە بوو کە دەستپێکی سەردەمی دوور و درێژی ئازادیی راگەیاند، بەم پێودانگە، رووسیاش هەروا دەبێ." بەڵام ئەم بەراوردە دەشێ بە هەڵەماندا ببات. بەراوردە مێژووییەکان زۆر جار خۆ لە سەرنجدان بە ئاڵوگۆڕی پێکهاتوو بە پێی رابردنی زەمان، دەبوێرن. بەڵام هزری دیالێکتیکی و جەدەلی لەمەڕ گۆڕانی بە شێنەیی، لەبیری بەراوردکردن عەمەلیترە. شۆڕشەکانی فەڕەنسا و ئەمریکا سەرهەڵدانی بۆرژوازی و چینی تازەی پیشەسازی و بازرگانییان - کە خوازیاری رزگاری لە دەست کۆت و بەندی ئاغا فیۆداڵەکانیان بوون - راگەیاند.

ئەوان (دەرەبەگەکان) چینی خاوەن زەوی بوون و دەسەڵاتیان بە سەر خەڵك و حکوومەتدا دەشکا. ئەمانە (بۆرژواکان) خۆیان حکوومەت بوون.

بەڵام ئێستا سەردەمی دەسەڵاتی ئێجگار کەڵەکە بوو و پاوانخوازە کە لە نموونەکانی ئەڵمانیای نازی و رووسیای سۆڤیەتدا هێندە کەڵەگایە کە دەتوانێ هەندێ لە چینەکان تێکبشکێنێ و ئەوانی دیکەش بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە.

شۆڕشی فەڕەنسا بە دروشمی **ئازادی، یەکسانی و برایەتی** بەرپا کرا. بەڵام سەرکردەکانی رووسیا، ستەمکاریی حاکم ناو دەنێن ئازادی، ئاخر لەوێدا شانسێکی کەمی هەیە. وتەبێژی کرملین بە گاڵتەجارییەوە، یەکسانی بە **دەمارگرژیی بۆرژوازی** ناو دەبا و **برایەتی** وەك پەیوەندیی نێوان رووسیا و فینلەند[٢٨]، نێوان ستالین و ملیۆنان بەندکراوی ئۆردووگاکانی مەرگ[٢٩]، نێوان ژەنەراڵە مەدالیاپۆش و سەربازە خاکیپۆشەکان پێناسە دەکا.

(٢٨) دەبێ بزانین کە رووسیا لەگەڵ هەموو دراوسێکانی کێشەی خاکی بووە و بەم هۆیەوە هەندێ لە ناوچە و وڵاتەکانی دەوروبەری خۆی داگیر کردوون. فینلەندیش یەك لەو وڵاتانە بووە لە شەڕی یەکەم و دووەمی جیهانیدا کەوتە بەر هێرشی ئەم وڵاتە. خۆڕاگری و بەرەنگاریی خەڵکی فینلەند نموونەی بەرگریی ئازایانەیە بەرامبەر بە داگیرکاری.

(٢٩) بەندکراوی ئۆردووگاکانی کاری زۆرەملی (یان لە راستیدا ئۆردوگاکانی مەرگ و فەرامۆشی).

دڵخۆش کردن بە وێکچوون و لەبەر یەك رانانی دەیەی١٩٤٠ و ١٧٠٠ ئارەزوومەندانەیە. ئەو هیوایە لە سەر بیرکردنەوەیەکی هەڵە و سەفسەتەیەك دامەزراوە کە: هەموو ولاتێك، تەنانەت گەورە بە قەد رووسیاش، بە دوورگەیەك دادەنرێ. بەڵام ئەگەر ئەوروپا و ئاسیا تەسلیمی ستەمکاری بن، ئەگەر لە ناوچوونی ستەمکاری لە رووسیادا شیمانەی کەم بێتەوە، ئەودەم دەبێ سەدەی بیستەم ناو بنێین سەدەی ستەمکاران. بەڵام بە بارەکەی تردا، ئەگەر دیموکراسی بتوانێ لە سەرانسەری دنیای غەیرە سۆڤیەتدا بە باشی بچەسپێ، ئەودەمەیە کە سۆڤیەت رەنگە، لە ماوەی ساڵیانی ساڵدا، وردە وردە دیموکراتیتر بێ.

ئەم چاوەڕوانی و ئاواتە کە مەرگی کەسێك یان راپەڕین، حکوومەتی سۆڤیەت هەڵدەگێڕێتەوە، رەنگدانەوەی بڕوایەکە کە دەڵێ ئەوانی تر (لێرەدا سۆڤیەت) دەبێ دواجار سیستەمی دیموکراسیی خودی ئێمە قەبووڵ بکەن. تەنیا پێویستە دانیشین، دان بە خۆدا بگرین و دوعا بکەین. بەڵام دەبێ قەبووڵ بکەین کە سیستەمی دیموکراسیی ئێمە (رۆژئاواییەکان) شتێکی تەواو نییە. ئەگەر ناوەرۆکەکەی دەوڵەمەند کرابوایە، دەکرا زەمانەتی مانەوەی بکرێ. ئەوکات بوو کە خێرو بێر و چاکییەکانی لەکردەوەدا، پەرەی دەگرت و بڵاو دەبۆوە. لەراستیدا، داهاتووی دیموکراسی لە رووسیادا بەسراوەتەوە بە داهاتووی دیموکراسی لە دەرەوەی رووسیا.



# بەشی پێنجەم

## ئێمە هەموومان قوربانین

هەرچەندە ئیمپریالیزم، جۆرێکە لە ستەمکاری کە لەودا، حاکمی بێگانە، کۆڵۆنییەکی ناڕازی لە کۆت و زنجیردا رادەگرێ، لەگەڵ ئەوەشدا، رژێمی دیموکراسی دەتوانێ لە کۆڵۆنییەکانی خۆیدا، حکوومەتێکی دێموکراسیی هەبێ. ئەم دیموکراسیەتە سنوورداره، بەڵام تەنیا کەسێك کە قەت تامی پاوانخوازیی نەچێشتبێ لەوانەیە ئیدیعا بکا کە ئینگلیزەکان ئازادیی بێئەژماریان بە هیندستان نەبەخشیوە.

نەتەوەیی، حیزبی، سەرکردە و رۆژنامەکانی هیند - تەنانەت لە کاتی جەنگدا - بەردەوام رەخنەیان لە حکوومەتی ئینگلیز گرتووە، هێرشیان کردۆتە سەر و ئەو دەسەڵاتەیان بە توندی تووشی کێشە کردووە. هەر هێندە بەس بوو بەشێکی کەم لەو چالاکییانە لە رژێمێکی پاوانخوازدا ئەنجام درابان تا سەریان تێداچووبایە.

حکومەتی بەریتانیا هەزاران هیندیی زیندانی کردوون کە هیچ کردەوەیەکی توندوتیژ و هیچ تاوانێکیان ئەنجام نەداوە، جگە لە هاوارکردن بە دژی سیاسەتەکانی بەریتانیا. بەندکردن بەهۆی دەربڕینی بیروباوەڕی سیاسی گوناهێکە بۆ لێخۆشبوون نابێ. سەرەڕای ئەوە، جگە لە چەند نموونەی ریزپەڕ، هەموو گیراوەکان ئیزن دران لە بەندیخانە بێنەدەرێ و گەمەکردن بە کلکی شێر دەست پێبکەنەوە. شەڕکردن لەگەڵ دەسەڵاتێکی دێموکراسی و نەکوژران دوای ئەوە، شتێکە **دەکرێ**. بەڵام ئەم خاڵە لە حکوومەتی ستەمکاریدا وەڕاست ناگەڕێ و **مەحاڵە**.

من ئەو رایە لە بارەی لێدوانەکانی گاندی لەبارەی جوولەکەکانی ئەڵمانیای هیتلەرییەوە دەردەبڕم:

کەمێك پێش ئەوەی لە ساڵی ١٩٤٦دا لە نیویۆرکەوە بەرەو هیند هەڵفڕم، دکتۆر یەهوودا.ئێلێ. مەگێنز، سەرۆکی زانکۆی بەیتولموقەددەس سەرنجی منی بۆ لای نامەیەك راکێشا کە ساڵی ١٩٣٨ بۆ گاندیی نووسیبوو، بەڵام هیچ وەڵامی بە دەست نەگەیشتبۆوە.

لەو نامەیەدا، مەگێنز، کە خۆی بە رێبواری رێگەی گاندی ناساندبوو، ئاماژەی بە وتارێکی گۆڤاری هاریجان کردبوو کە تێیدا گاندی پێشنیاری بە جوولەکەکانی ئەڵمانیا دەکرد: "بەرامبەر بە تووڕەیی لامەزهەبانەی ستەمکارانی دژە مرۆی هیتلەری، ساتیاگراها، یان نارەزایەتیی ناتوندوتیژی ئەنجام بدەن."

گاندی لە وتارەکەیدا نووسیبووی: "من بە پێداگرییەوە داوام لە هیتلەر دەکرد بمکوژێ یان لە کونجی بەندیخانەم بکا، چاوەڕوانی هاودینە جوولەکەکانم نەدەبووم کە لە خەباتی مەدەنیدا بێنە پاڵ منەوە، بەڵام لەوە دڵنیا دەبووم کە لە ئاکامدا، جوولەکەکانی دیکەش ناچار دەبن شێوازەکەی من بگرنە بەر... خۆڕاگرتنی خۆویستانە لەبەر ئازار، توانا و شادییەکی دەروونییان پێدەبەخشێ." مەگێنز لەگەڵ رایەکەی گاندیدا نەبوو. ئەو نووسی: "بچووکترین نیشانەی بەرخودان واتە کوژران، راپێچکران بۆ ئۆردوگاکانی مەرگ یان تیاچوون بە شێوازی تر. زۆربەی کات لە شەوەزەنگی بێدەنگ و کپدایە کە جوولەکەکان دەتوانن لە چنگی نازییەکان قوتار بن". مەگێنز بەبیری دەخستەوە کە:

"هیچ کەس لە بنەماڵەی جوولەکە تۆقیوەکان ئاقڵتر نییە و ئەوان لە هەموو کەس زیاتر لە بیری ئاسایشی خۆیاندان. بەڵام ئازار و ئەشکەنجەی ئەمانە تەنانەت لەسەر ئاستی ژیانی خەڵکی ئەڵمانیادا، بچووکترین شەپۆل وەرێناخا. شەقامەکان هەمان شەقامی جارانن، کار و کاسبی وەکو جاران بەردەوامە، سەردانکەری ئاساییش هیچ شتێك نابینێ و ئاگاداری ئەو تاوانە نابێ. ئێستا ئەمانە لەگەڵ مانگرتنێکی سادە لە خواردن لە زیندانێکی ئەمریکا یان بەریتانیا بەراورد بکەن و هەروەها لەگەڵ ئەو بەزم و هەرا گشتییەی رووداوی لەو جۆرە دەینێتەوە."



مەگێنز پەنجەی لەسەر جیاوازیی سەرەکیی نێوان دێموکراسی و ستەمکاری دانابوو و هیوادار بوو دەرفەتێك بڕەخسێ و بتوانم ئەم خاڵە بە گوێی گاندی بگەیەنم.

یەکەم رۆژ بوو کە لە عیادەی چارەسەری سروشتیی دکتۆر *مەهتا* لە شاری *پوونا*، دەگەیشتمە لای گاندی. ئەو ئاماژەی بە تێکهەڵچوونی نێوان هیندوو - مسوڵمانان کرد کە لە *ئەحمەدئاباد* لە ئارادا بوو و گوتی: "کێشەکە ئەوەیە لایەنێك دەست دەداتە چەقۆوەشێنی و کوشتن و دواتر لایەنەکەی دیکەش هەر بەو جۆرە رەفتار دەکا. ئەگەر لایەنێك لێگەڕابا بکوژرێ، کێشەکە هەر لەوێ دەبڕایەوە. بەڵام من بە تەنیا ناتوانم وایان لێبکەم ناتوندوتیژی بگرنەبەر. لە فەلەستینیش بەو جۆرەیە. جوولەکەکان نمونەیەکی باشیان بە دەستەوەیە. بە *سیدنی سیلڤێرمەن* (نوێنەری حیزبی کرێکاریی بەریتانیا)م گوت کە جوولەکەکان لە فەلەستین نموونەیەکی باشیان بە دەستەوەیە. ئەگەر عەرەبەکان فەلەستین بە هی خۆیان دەزانن، جوولەکەکان لە زووترەوە بە هی خۆیانی دەزانن. مەسیح خۆی جوولەکە بووە، (ئەویش سەرتۆپی جوولەکان) دەکرێ ئەم خاڵە لە گێڕانەوەی چوار کەسەکەی حیواریون کە بەدەستمان گەیشتووە، هەڵبێنجین. ئەوان زەینێکی نەخوێندەواریان هەبوو. ئەوان راستیەکەیان لە بارەی مەسیحەوە گوتووە. بەڵام *پۆلسی پیرۆز* جوولەکە نەبوو. ئەو یۆنانی بوو. ئەو زەینێکی خەتیبانە و گفتوگۆکارانەی هەبوو و مەسیحی بادا و دایە دەست خەڵکی. مەسیح خاوەن هێزێکی گەورە، هێزی خۆشەویستی بوو. بەڵام مەسیحیەت لە سەردەمی (*کۆنستانتین*)دا کە کرایە مەزهەبی پادشایان، بوو بە شتێکی تر. دوای ئەوە بوو کە سەردەمی خاچپەرستان و *پیتری گۆشەگیر* دەستی پێکرد کە مەسیحییەکانیان وا لێکردن بکەونە کوشتوبڕی مسوڵمانان. دەستە دەستە مەغریبییەکان، بە بێ زێدەڕۆیی، لە دەریا خران. مەسیحیەت بوو بە وەحشیگەری و بەربەریەت. لە گشت سەدەکانی ناوەڕاستدا مەسیحیەت بەو شێوەیە مایەوە."

پرسیم: "ئەدی ئێستا چۆنە؟"

لە وەڵامدا گوتی: "ئێستا مەسیحیەت لە تەشقی ئەو هەورانەدا جێگیر بووە کە بۆمبی ئەتۆمی دروستی کردوون. بەو حاڵەوە یەهوودیەت بە بەراورد لەگەڵ مەسیحیەت کەللەرەق و رەشۆکترە. من لە لەندەن لە پای مینبەری خاخام[٣٠] هێرتز دانیشتووم. وتاربێژێکی بەرجەستە بوو. بەڵام بەردەوام پاساوی بۆ رەفتاری جوولەکەکان دەهێنایەوە و بڕوبیانووی دەهێنانەوە. من لە ئەفریقیای باشوور و شوێنەکانی دی، زۆر لە کەنیسەی جوولەکەکان زیاتر، هاتوچۆی کڵێسەی مەسیحیەکانم کردووە. باشتر لە مەسیحیەت دەگەم بەڵام هەر وەك گوتم جوولەکەکان نموونەیەکی باشیان لە فەلەستین بە دەستەوەیە." لێم پرسی هیچ نامەیەکت ساڵی ١٩٣٩ بەدەست گەیشتووە کە دکتۆر مەگێنز سەرۆکی زانکۆی عیبریی ئورشەلیم بۆتی ناردبێ؟ ئەو نامەکەی ئەوکاتە بۆ ناردی کە لە بەیاننامەیەکدا روو لە جوولەکەکانی ئەڵمانیا نووسیبووت کە بە دژی هیتلەر **بەرگریی مەنفی بکەن**.

گاندی گوتی: "نامەکەم بەبیر نییە، بەڵام بۆچوون و رایەکەی خۆمم وەبیر دێ. من داوام لێنەکردن **بەرگریی مەنفی**[٣١] بکەن. ئەمە دەربڕینێکی هەڵەیە. چەندین ساڵ لەمەوبەر لە ئەفریقای باشوور، لە کۆبوونەوەیەکی گشتیی گەورەدا بە سەرۆکایەتی *هێرمان کالنباخ*، جوولەکەیەکی دەوڵەمەندی ژوهسانبورگی هەندێ قسەم کرد. من زۆربەی کات لە ماڵەکەی دەمامەوە و ببووینە یەك ماڵەکی . ئەو، کاتی ناساندن، منی وەك قارەمانی بەرگریی مەنفی ناساند. هەستام و گوتم من

(٣٠) نازناوی رۆحانییەکان لە ئایینی جوولەکەدا.

(٣١) بەرگریی مەنفی دەربڕینێکە کە گاندی حەزی نەدەکرد شێوەی کارکردنی ئەو بەوەوە ناو ببرێ. ئەو دەربڕینی ساتیاگراها (خۆڕاگری لە رێگەی هەقیقەتدا) و ئاهیمسا (ناتوندوتیژی) و یاسای عەشق و خۆشەویستی وەك شێوازی خۆی دەناساند و دەیگوت ئەو کردەوانە مەنفی نین و لە ناهومێدی بۆ گۆڕینی مرۆڤ و بارودۆخەوە سەرچاوە ناگرێ. **دوژمن** ناناسێ و ئامانجی گورزلێدان لە بەرامبەرەکەی نییە، بەڵکو لێك نزیككردنەوەی خۆی و بەرامبەرەکەیەتی.



بڕوام بە بەرگریی مەنفی نییە. ساتیاگراها شتێکە ئێجگار کردەیی و چالاك و راست پێچەوانەی رەفتاری دەستەوەستانی و داماوانە. خۆبەدەستەوەدان مایەی شەرمەزارییە و من لێی بێزارم. جوولەکەکانی ئەڵمانیا بە خۆبەدەستەوەدانی داماوانە بە هیتلەر بە هەڵەدا چوون."

گوتم: "مەگێنز لە نامەکەیدا باسی ئەوە دەکا کە جوولەکەکان کارێکی تریان لە دەست نەدەهات." گاندی بە جددییەتەوە گوتی:" هیتلەر پێنج ملیۆن جوولەکەی کوشت. ئەمە گەورەترین تاوانی سەردەمی ئێمەیە. بەڵام جوولەکەکان، دەبوایە بۆخۆیان، خۆیان بە چەقۆی قەسابی سپاردبا. ئەوان دەبوایە لەسەر تاشە بەردەکانەوە خۆیان هەڵداشتبا دەریاوە، من بڕوام بە هاراگیری[٣٢] ژاپۆنییە. من کارم بە مانا ناڕاستەوخۆکانی سەربازیگەری و سامۆراییەکەی نییە. بەڵام ئەم شێوازە شێوازێکی قارەمانانەیە."

پرسیم: "پێت وایە جوولەکەکان دەبوایە بە کۆمەڵ خۆیان کوشتبا؟"

گاندی لە پشتڕاست کردنەوەی قسەکەیدا گوتی: "بەڵێ، ئەم کارە دەکرێ قارەمانێتی بێ. خۆکوشتنەکە، دنیا و خەڵکی ئەڵمانیای لەبارەی بەڵای توندتیژیی هیتلەر رادەچڵەکاند، بەتایبەت لە ساڵی ١٩٣٨دا کە هێشتا شەڕ دەستی پێنەکردبوو. بەڵام وەك دیتمان ئەوان دواجاریش ملیۆن ملیۆن، خۆیان بە دەستەوەدا."

دواتر کاتێ ئەو گفتوگۆیەم بۆ دکتۆر مەگێنز گێڕایەوە، گوتی: لەوانەیە بۆچوونی گاندی راست بێ کە دەڵێ دەبوایە جوولەکەکان خۆیان بکوشتایە، رەنگبوو بەو کارە، زۆر زیاتر و قووڵتر لە کاریگەریی قەڵاچۆی ٦ ملیۆن کەس دنیایان هەژاندبا، بەڵام ئەو کارە نازانم چلۆن دەکرا ئەنجامبدرێ. بەڵێ، لە قەڵای *ماسادا* چەند سەد کەس، دەیانتوانی دەست بدەنە خۆکوشتن؟ یان ئەگەر ئەو کارەیان کردبا،

(٣٢) خۆکوشتن بە شێوازی ژاپۆنی بە هەڵدڕینی زگ بە شیر کە زیاتر بە مەبەستی رزگاری لە ئازاری ویژدان لە بەر کەمتەرخەمی لە ئەنجامدانی ئەرك دەکرێ.

ئاخۆ کاریگەریی ئەم کردەوەیە لە سەر دنیا زیاتر دەمایەوە یان کاریگەریی لە ناوچوونی دواتری ٦ ملیۆن کەس؟"

مەهاتما گاندی هیچکات ئەزموونی ژیان لە سایەی دەسەڵاتی رژێمێکی تەواو پاوانخوازیدا نەبووە. لێبوردەیی و مرۆڤایەتی ئەو رێگە نادا لەوە تێبگا کە رژێمێکی ستەمکاری تا چ رادەیەك دەتوانێ دلڕەق بێ. لە هیند، فەلەستین و شوێنەکانی دی، توندوتیژی یان ناتوندوتیژیی رێکخراو، بیچمێکە لە **پەیوەندییە گشتییەکان**. کاتێ ئەمریکییەکان، ئینگلیزەکان، فەڕەنسییەکان یا سوێدییەکان دەیانەوێ کاریگەریی لە سەر سیاسەتی رۆژ دابنێن، مشتومڕ دەکەن، نفووز پەیدا دەکەن، تەلەگراف لێدەدەن، دەنووسن، دەنگ دەدەن، رێپێوان و مانگرتن دەکەن، بەڵام لە کۆلۆنییەکانی ئاسیاییدا، ئەو نارازییانەی کە دەبینن رای ئەوان کاریگەریی لە سەر سیاسەتەکان نییە، رادەپەڕن، چەقۆ دەوەشێنن، تەقە دەکەن یان دەست دەدەنە تالان و راوڕووت. ئامانجی نارازییەکان گۆڕانی سیاسەتی ئینگلیزە کە جار و بارەش توانیویانە بەو ئامانجەیان بگەن. نائارامییەکان کە لە رۆژهەڵات روودەدەن، هەندێ دژکردەوەی لە لەندەن، لە رۆژنامەکان، لە حیزبە سیاسییەکان و لە کەنیسە لێدەکەونەوە.

حکومەت وەها دەکەوێتە ژێر گوشاری قورس کە دەبێ لە بەرچاوی گشت خەڵکدا وەڵامی رەخنەگرەکانی بداتەوە و هەندێ جار دەست بداتە گۆڕینی پلان و کردەوەکانی خۆی.

بۆیە ناتوندوتیژیی گاندییانە و هەروەها خاڵی بەرامبەر و دژیوی وی - ترس و تۆقاندن و تیرۆریزمی سەهیۆنیستی - هەر دووکیان، بوونی کۆمەڵگەیەکی دیموکراتی لە ئینگلیز (و هەروەها لە ئەمریکا) دەردەخەن. بەرگریکارانی هیندی و مرۆڤ رفێنە سەهیۆنییەکانی لە فەلەستین دەکەونە بەردەم هەمان دادگای بیروڕای گشتی.

بەڵام با وای دابنێین کە لە وڵاتە رۆژئاواییەکاندا دیموکراسی نەبوایە؟



سەرۆك وەزیرێکی بەریتانیایی نەیدەتوانی بڕیار بدا یەك ملیۆن کەس لە ماڵ و بازاڕ کۆبکرێنەوە و لە کوورەی ئاگردا قاڵ بکرێنەوە و بکرێنە سابوون. هیتلەر دەیتوانی و - کردیشی.

*ژێنێ*، پەیامنێری ناوداری دەرەوە لە بڵاوکراوەی *نیو یورکێر* دەنووسێ:

"بەر لە جەنگی نازی، سەد هەزار جوولەکە لە ئامستردامی هۆڵەندا دەژیان. ئەمڕۆ تەنیا پێنج هەزار کەسن. دەستگیرکردنی جوولەکان لەوێ زۆر ئاسان بوو. *گەشتاپۆ* تەنیا پردی سەرە گەڕەکی جوولەکانی دەگرتن. زیندانییەکانی لە خانووە بچووکە سەدە هەژدەمەکانیان هێنایە دەرەوە، ئەوانەی دەیانویست لە گەڕەکەکە رابکەن، کە بە جارێ ببووە دوورگەی نیژادێکی ترسناك، بە گوللە کوشتیانن، ئەوانەی مانەوە بە ئەستێرەی زەردی داود، نیشانەیان کردن و بە عارەبانەکانیان بەرەو ئۆردوگاکانی مەرگ بەرەو وڵاتی بابوباپیرانیان ناردن.

لەسەد و چل هەزار جوولەکەی هۆڵەندا، سەد و چاردە هەزار لە کاتی دەسەڵاتداریێتیی ئەڵمانەکاندا قڕ کران..."

قوربانییانی ئەم جۆرە وەحشیگەرییانە، چۆن دەیانتوانی بە دژی ئەوە رابوەستن؟ نەك هەر قوربانییە راستەوخۆ و ئازاردراوەکان، بەڵکو هەموو مرۆڤایەتی دەبوایە بەرامبەر بە ستەمکاری دەستیان دابایە بەرگریی چالاکانە، چونکە ئێمە هەموومان قوربانین. ستەمکاری دەستی دەگاتە ئێمەش، تەنانەت ئەو کاتەی بە رواڵەت بەرامبەر ئێمە دەستی کورتە.

بۆچوونەکانی گاندی لەبارەی دیموکراسی و هەروەها خودی گاندیش لە رژێمێکی ستەمکاریدا زیندوو نەدەمان. ستەمکار، بێ ئەملاوئەولا بڕیاری دەدا گاندی لە ناو ببرێ. هیچ کەس ئیدی بە سۆراخی نەدەزانی. وای دابنێین نیو ملیۆن کەس بۆ پشتگیری لە گاندی، بەرامبەر بە ستەمکاری سەرپێچییان کردبایە، هەموویان سەریان تێدا دەچوو. وای دابنێن سێ ملیۆن کەس لە ستەمکاری هەڵدەگەڕانەوە، ئەوانیش لە ناو دەبران.

ئێستا وای دابنێین ٢٠ ملیۆن هیندی لە قەبووڵکردنی دیکتاتۆری هەڵگەڕێنەوە. بە بوونی ٢٠ ملیۆن تێکۆشەری گاندیگەرا - **لە هەر ولاتێك بێ** - ستەمکاری قەت ناتوانێ گوڵمیخی خۆی لە بەرزترین شوێن داکوتێ. ئەو نەتەوانەی کە بە پێی بۆچوونەکانی گاندی رەفتار دەکەن و پێی وەفادار دەبن، لە ئەشکەنجەی ستەمکاریان رزگار دەبن.

گاندی گەرایی لەگەڵ هیتلەریزم یان ستالینیزم ئاوێتە نابێ.



# بەشی شەشەم

## بەیانیی یەکشەممە لە دوسلدۆرف

پرسیاری جددیی رۆژگاری ئێمە ئەوەیە: خەڵکێك کە بە جارێك کەوتوونە ژێر کاریگەیی جادوو و گوشاری پۆستاڵەکانی رژێمێکی ستەمکار، ئاخۆ کاتێ کە رزگار دەبن، بەرامبەر بە گەڕانەوەی رژێمێکی لەو بابەتە دەوەستنەوە یا دووبارە بەرامبەر جۆرێکی نوێی، مل کەچ دەکەن. ئایا ئەڵمانەکان، ئیتالییەکان و ژاپۆنییەکان بە ئێجگاری لە نەخۆشیی ستەمکار پەرەستی چاك بوونەتەوە؟ یا ئاخۆ ئەو هەست و سۆز و باوەڕ و بارودۆخەی کە ئەوانی بەرەو لایەنگری کردن و ملکەچ کردن بۆ رژێمێکی ستەمکار لێخوڕی، جارێکی دیکە دەیانکاتەوە قوربانییە سادە و ئاسانەکانی زۆردارێکی تر؟

هەتاو لە پشت ماڵێکی وێران لە شاری دوسلدۆرفی ئەڵمانیا لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی ئینگلیزدا هەڵدەهات. من لە پەنجەرەی ژوورەکەمەوە لە *پارکی هوتێل* لە شارەکەوە رامابووم. زۆر لە بیناکان لە ئاسۆدا، بە بۆردومان، وەك کۆدە گڵێ یا دیواری نیوە رووخاو، یان لادیواری خشت لێ دەڕپەیو، بە پەنجەرەی لێك هەڵوەشاوی بێ چواچێوە، هەڵتەکابوون. لە نهۆمی خوارەوەی هۆتێلدا ئۆتۆمبێلەکە چاوەڕوانم بوو. شوفێرە ئەڵمانییەکەی خەڵکی شتاین، کەسێکی ئیشکەر و کەمدوێ بوو. تا پرسیارم لێنەکردبا چی نەدەگوت. چەند نانی ئەستووری قاوەیی رەنگی پێبوو: واتە خواردن! ئەو لە سوپای رایشدا لە هۆڵەندا، فەرەنسا، رووسیا، کەریمە، قەفقاز، یونان و لە بەرەی رۆژئاوای ئەڵمانیا شەڕی کردبوو.

بە گوتەی ئەو، بارودۆخی ژیانی خەڵکی رووسیا، سەرەتایی و سەخت بووە، پەنجا ساڵی پێدەچوو تا بگەنەوە ئەوروپا. هۆڵەندییەکانی خۆش دەویستن: **پاك و خاوێنن.**

کاتێ رووسەکان هاتنە ناو شتاینەوە، هەوڵیان داوە دەستدرێژی بکەنە سەر خوشکە هەژدە ساڵەکەی، ئەویش خۆی کوشتووە. دواتر دایکیشی هەر وای کردووە. بەسەرهاتەکەی بە ساردوسڕی و بە شێوەی راپۆرت بۆ گێڕامەوە. هەر بەو جۆرەی کە لە لەندەن ژنێکی جوولەکە دەیگێڕایەوە: "دایك و بابم؟ بەڵێ لە ئاشۆتیس لە کوورەیان هاویشتن."

ئەوروپا لە رادەبەدر بە بەزەیی بوو. ئێستا ئیدی خەڵك فرمێسکی لە چاوان براوە. تۆ ناتوانی لە شارێکی تێك تەپیو و کاولدا بژیت و دڵناسك و سۆزدار بی.

چوومە وێستگەی ناوەندیی شەمەندەفەر. چەندین جار بۆردومان کرابوو. سەقفێکی دارینی کاتی، لە ژێر سەقفە دارماوەکەی هۆڵی چاوەڕوانیدا دروستکرابۆوە. لە بنەبانی چەپی هۆڵەکەدا، سەردابێکی بیرەخواردنەوەی لێبوو. کاتێ ویستم بچمە ژوورەوە، پیاوێك بە پاڵتۆی تایبەتی و تەپلەی خورییەوە، پێشی پێگرتم. دەبوایە بلێت ببڕم. بڕیار وابوو کۆبوونەوەی هەڵبژاردنی حیزبی کۆمۆنیست لەوێ بەڕێوە بچێ. بلێتەکە دانەی بە مارکێك بوو. من تەنیا ئەسکیناسێکی ٥٠ مارکیم پێبوو. ئەویش خوردەی پێنەبوو. لە جیاتی یەك مارك پاکەتە جگەرەیەکی *چاترفیلدم* بۆ راگرت. پیاوەکە گوتی: "باشتر، بەو جۆرە ٥ مارك قازانج دەکەم." پاکەتە جگەرەیەکی ئەمریکی بە ٦ تا ٩ مارك لە بازاڕ دەفرۆشرێ. سەردابەکە نزیکەی ٥٤ مەتر درێژایی و ١٨ مەتر بەرینایی بوو. چوار گلۆپ، ئەو شوێنە تاریکەیان کەمێك رووناك کردبۆوە. ئامادەبووان ٢٠٠ پیاو و ١٠ ژن بوون کە دەوری مێزی خڕیان دابوون. هیچ کامیان لە چل ساڵ کەمتر نەبوون و زۆربەیان بەناو ساڵ کەوتبوون. خزمەتکارێکی لاواز، بێ تووك، سەر ماشوبرینج، بە چاکەتێکی سپییەوە لەسەر نووکی پەنجە لە مێزێکەوە دەچووە مێزێکی دیکە و کەشەفی پڕ گلاسە بیرەی دەگێڕا.

وتاربێژێکی رێکپۆش - کە دوکتۆرێك بوو - دەیگوت: "بیست و پێنج لە سەدی گشت پزیشکانی ئەڵمانی چوونە ناو حیزبی نازییەوە." ئەو فایلەی شتم لەسەر یادداشت دەکرد وەرمگێڕا. کۆبوونەوەی ئەمڕۆ بەیانی بە کۆبوونەوەی **چینی ناونجیی**



**دوسلدۆرف** ناو دەبرد. لە بەر دەرگا بڕۆشورێکی تەنکیان دابوومێ کە لەبارەی هەڵمەتی هەڵبژاردنی حیزبی کۆمۆنیستەوە بوو، عیبارەتێکی وای تێدا نووسرابوو: **نازییە چکۆلەکان! ئێستا چی؟** نووسیبووی: "دوازدە ملیۆن کەس ئەندامی حیزبی نازیی ئەڵمانیا بوون، پیاو و ژن و لاو، سەدان هەزاریان لە ژێر زەخت و فشاری رۆحیدا یان لە ترسی لە دەستدانی کارەکانیان ناچار کران بچنە ریزی حیزبی نازییەوە... ئایا ئەمڕۆکە، هەموو ئەو ١٢ ملیۆن کەسە بە قەمچییەك لێدەخوردرێن؟ بڕۆشورەکە داوای لە **نازییە چکۆلەکان** دەکرد بچنە ریزی حیزبی کۆمۆنیستەوە.

دکتۆر درێژەی دایێ: "دەکرێ بە روونی پێشبینی بکەین کە نەهامەتی و ناخۆشیمان دێتە رێ، مەگەر وەدوای رێنماییەکانی مارکسیزم بکەوین. گرنگ ئەوەیە سیاسەتوانی ئەمریکی *بایرنز* لە وتاری ئەم دواییەی خۆیدا گوتی: ئەگەر ئەڵمانەکان پێشینارەکانی *کارل لیبکنشتی کۆمۆنیستیان* لە گوێ گرتبا، دەکرا بەر بە نەهامەتیی دوای ساڵی ١٩١٩ لە ئەڵمانیا بگیرێ."

دکتۆر دوای کەمێك گوتی: "کۆمۆنیستەکان زانستی پلان بۆ داڕێژراویان دەوێ. ئەمە واتە سۆسیالیزم. نازییەکانیش، پلان و رێکخراوی بۆوێنە لە بواری ئاسمانگەڕی یان پزیشکییان هەبوو. ئەدی جیاوازیی نێوان سۆسیالیزم و نازیزم لە چیدایە؟ ئامانجی نازی، لەناوبردن و رووخاندنی پێکهاتەکان بوو. بەڵام لە لایەکی دی، سۆسیالیزم لە رووسیا خەریکی ئەنجامدانی پرۆژەگەلێك لە بواری مێژوو، پزیشکی و گشت زانستەکانی دیکەیە. لەو دواییەدا کتێبێکی ئەمریکیم لە بارەی ئەتۆمەوە خوێندەوە. نووسەرەکانی دژی بەکارهێنانی وزەی ئەتۆم بۆ ئامانجە ناسەربازییەکان بوون. ئەمریکا وزەی ئەتۆمی تەنیا بۆ کاروباری سەربازی و گوشاری دیپلۆماتیك دەوێ. لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، وزەی ئەتۆم بە مانای پاشڤەڕۆیی، وەستان و بەرتەسکییە، بەڵام لە سۆڤیەت بە مانای پێشکەوتنی زانست و بۆ سوود وەرگرتنی مرۆڤایەتییە."

باسی باری لاوان و پەروەردەی لە ئەڵمانیا کرد. هۆشداری دا کە: "دنیای پزیشکانی ئەڵمانیا دەبێ دیموکراتییانە بێ، ئەگینا کۆنەپەرستی سەرلەنوێ سەرهەڵدەداتەوە. رۆشنبیران دەبێ لە پەنا کرێکاران بن. بەبێ ئەوەی چینی کرێکار لە روفاهیەتدا بێ، مەگەر پزیشك دەتوانن ژیانی باشیان ببێ؟

گەلێك لە سەرکردە رۆشنبیرییەکانی ئەڵمانیا، بۆنموونە *شارن هۆرست*، *کلاوس ویتنر*، *فیختە* و کەسانی دی دژی یونکرس بوون. ساڵی ١٨٤٨، گەلێك لە رۆشنبیران پشتیوانییان لە شۆڕش دەکرد. لە شەڕی ناوخۆی ئەمریکا، زیاتر لە ٨٠٠ هەزار ئەڵمانیی **چل و هەشتی** کە ٣٧ ژەنەراڵیشیان لە نێودا بوون، بۆ بەرەی پێشکەوتن (لە بەرامبەر کۆنەپەرستیی کۆیلەداریی باشوورییەکاندا) چوونە یارمەتیی باکوورییەکان و شەڕیان بۆ کردن."

"سۆسیالیزم ئاشتیی دەوێ. لە ژێر چاودێریی سۆسیالیزمدا، ژنان کە هەر ئێستا بۆ پەروەردەی پزیشکی کێشەیان هەیە، کێشەیەکیان نابێ."

"من دەبێ کۆتایی بە قسەکانم بێنم. ئێمە یان بەرەو گەشە و پێشکەوتن هەنگاو دەنێین یان لە ژێر بۆردومانی ئەتۆمیدا دەنێژرێین."

کاتێ وتاربێژەکە لە نێو چەپڵەڕێزانی ئامادەبوواندا بە پەلە بەرەو دەرگاکە دەڕۆیی، سەرم لە دوو نا و لە هۆڵی چاوەڕوانی پێشم پێگرت. ناوەکەیم پرسی: *دکتۆر کارل هاگی دورن*.

گوتم: "من رۆژنامەنووسێکی ئەمریکیم و هاتوومە ئەڵمانیا تا کاریگەریی نازیزم لە سەر خەڵکی ببینم." ئینجا لێم زیاد کرد: "تۆ قسەی *بایرنز* وەزیری دەرەوەی ئەمریکات گێڕایەوە کە گوتوویە ئەڵمانیا دەیتوانی بە پەیڕەویکردن لە *لیبکنشت* رێگە لە رووخانی خۆی بگرێ. لە کاتێکدا ئەگەر ببیستم کە بایرنز، تەنانەت ناوی کارل لیبکنشتی بەر گوێ کەوتبێ، واقم وڕدەمێنێ. بەڵام ئەگەر بەراستی ئەو قسەیەی کردبێ، بە دڵنیاییەوە بڕوای وا نەبووە کە ئەڵمانیا دەبێ قسەی سەرکردەیەکی کۆمۆنیست لە گوێ بگرێ. باشتر وایە بزانین بایرنز کۆنەپارێزە."



دکتۆر بە ئاخ هەڵکێشانەوە گوتی: ئەدی کێ دەشێ گوتبێتی؟ من ئەو بابەتەم لە رۆژنامەکاندا خوێندەوە."

وەبیرم خستەوە کە: "بایرنز لەم دواییەدا لە ئەڵمانیا وتاری پێشکەش کردووە، ئەویش لە شاری شتوتگارت، بەڵام تۆ بابەتەکەت لە قسەکانیدا نادۆزییەوە. من پێم شك نایە لە وتەکانیدا شتی وای گوتبێ. لە جێگایەکی دیکەدا گوتت ئەمریکا وزەی ئەتۆم بۆ ئامانجی پیشەسازی بەکار ناهێنێ، لە حاڵێکدا رووسیا ئەم کارە دەکا. ئەم ئیدیعایە، راست پێچەوانەی کردەوەی ئەمریکییەکانە کە وزەی ئەتۆم لە پیشەسازیدا بەکار نەهێنن. بەڵام لە بارەی رووسیاوە، تۆ چووزانی ئەم شتە وایە؟ ئەم بابەتە نهێنییەکی ئێجگار شاراوەی سۆڤیەتە و ئێوە بە هیچ شێوەیەك ئاگاداری چالاکییە ئەتۆمییەکانی رووسیا نین. هیچ بێگانەیەکی دیکەش ئاگاداری ئەو بابەتە نییە."

دکتۆر بێدەنگ بەرامبەرم راوەستا.

گوتم: "ئەڵمانیا ١٢ ساڵە گوێی پڕ بووە لە پڕوپاگەندە درۆیینەکانی گۆبلێز. پێم وایە ئەڵمانییەکان ئەو حەمکە درۆیەیان لە عومر و ماڵی زیاد بێ. کەچی ئەمڕۆ ئێوەش هەر ئەو کارە دەکەن کە گۆبلێز کردی." هیچی نەگوت، بەڵام سەخڵەت ببوو. گەڕامەوە و چوومەوە شوێنی کۆبوونەوەکە. پاشان کەمێك بە شەقامەکاندا پیاسەم کرد. دیوارە لارووخاوەکان بە پۆستەری سیاسی داپۆشرابوون. چەندین حیزبی ئەڵمانی بیروڕای خۆیان دەربڕیبوو. پۆستەری یەکێتیی دیموکرات مەسیحیCDU لێیان نووسرابوو: "مەسیحییەکان دەنگ بە CDU دەدەن." راست لە پەنا هەر پۆستەرێکی *سی دی یوو*، حیزبی سۆسیال دیموکرات، پۆستەرێکی نەیارانەی پێوە نووساندبوو: "مەسیحیی راستەقینە، سۆسیالیستە. دەنگ بدەنە SPD."

سۆسیالیستەکان داوا لە ژنانی ئەڵمانیا دەکەن ورەی لاوان بەرز بکەنەوە. *سی دی یوو* هاوار دەکا: "شەڕ بەسە، ئیتر." بەڵام لەو ناوەدا تەنیا کۆمۆنیستەکانن کە بەڵێنانیش دەدەن: "زیاترتان خەڵووز دەوێ؟ دەنگ بدەن بە کۆمۆنیستان." بەڵام وەك دەزانین کە خەڵووز و دابەشکردنی بە تەواوی لە دەستی هێزە داگیرکەرەکانی

ئەڵمانیای پاش نازیدایە و هیچ حیزبێکی ئەڵمانی، چ سۆسیالیست یان کۆمۆنیست و شتی لەو بابەتە دەسەڵاتی ئەوەیان نییە خەڵووزی زیاتر بدەنە دەنگدەرە ئەڵمانەکان. "دەتانەوێ هەرزانی دابێ؟ دەنگ بدەنە کۆمۆنیستان." بەڵام کە هێزە داگیرکەرەکان هاتنە ئەڵمانیاوە، هەقدەست و نرخی شتومەك لە لایەن ئەوانەوە لە ئاستی جێگیری سەردەمی شەڕدا دیاری و جێگیر کران. ئەڵمانەکان دەسەڵاتی ئەوەیان نەبوو نرخان خوار و ژوور پێبکەن!

پزیشکە ساختە و سیاسەتمەدارە ساختەکان، نانی ساویلکەیی خەڵك دەخۆن.

خەڵکانی ساویلکە نە دەبینن و نە دەبیستن، تەنیا دەتوانن بخۆن. فالگر و شێخ و فیرقەی عیرفانی و کەسانی ساختەچی و گوێبڕ و هەروەها کۆمۆنیست و فاشیستیش، لە سەردەمی ئاژاوە و ئالۆزیی، ناسەقامگیری و نەهامەتی و ڕۆژەڕەشیدا، وەك کوارگ لە زەوی هەڵدەتۆقن.

**کوشندەترین چەکی ستەمکار تۆقاندن و تیرۆرە. تۆقاندن، ترس دروست دەکا و تەمەننای ئاسایش زیاتر دەکا و تاك بۆ لە ژێر پێنانی ویژدان و کەرامەتی خۆی لە پێناویدا، ئامادەتر دەکا. خودایانی ڕژێمی ستەمکاری، دەیانەوێ قوربانی لە مرۆڤان بستێنن و گەورەترین قوربانیش شوناس و کەسێتییانە. تۆقاندن، مرۆڤ دەکاتە دووڕوو و ماستاوچی کە درۆ دەکا، دان پێدا دەنێ و خۆی زەلیل دەکا بۆ ئەوەی بژیت.**

تۆقاندن و تیرۆر، چڵکاوخۆر و هەلپەرست و زمانشڕ و ماستاوچی و موریدان پەروەردە دەکات.

**ڕژێمی ستەمکاری خۆی وەك مێردەزمەیەکی پۆلایین و یەکپارچە و ترسناکی تەمەن هەزار ساڵ پێشان دەدا کە هیچ کەس توانای ئەوەی نییە دەستی تێبدا یان لاوازی بکا. باشە ئەدی مرۆڤ چی بکا؟ هەوڵدان بۆ لەناوبردنی، سەرباری هەبوونی ئەو هەموو چاوە سیخوڕە و هەروەها ترسی ڕوو لە زیاد و بەرچاو، کارێکی گەمژانەیە. لێرەوەیە کە خوخدە و کولتووری بێدەماری، دەستەوەستانی و "دەست بە کڵاوی خۆتەوە بگرە" ڕەواج پەیدا دەکا.** هەر ئەو قارەمانەی لە بەرەی شەڕدا، لە



پێناوی وڵاتەکەیدا سینگی بە گوللەوە دەنا، لە شار دەبێتە هاوولاتییەکی ترسنۆك. **ئەو کەسە هیچ ترووسکەیەکی سەرکەوتن لە ئاسۆدا بەدی ناکا، تەنیا لەوە دڵنیایە کە بەگژداچوونی قەڵای پاوانخوازی، سەری خۆی و بنەماڵە و هاوڕێکانی بە با دەدات، جگە لە هارووژانی زیاتری سەرکوتکەر شتێکی دیکەی دەسکەوت نابێ.**

ستەمکاری هێزی ئیرادە لاواز دەکا، تەنگ بە بیرکردنەوە هەڵدەچنێ، چونکە بیرکردنەوە مەترسیدارە، پاشەکشە بە داهێنانی سیاسی دەکا، ئاخر هەموو عەقڵ و توانا ڕاستەقینەکان تەنیا دەبێ لە مێشکی ستەمکارەوە هەڵبقوڵێن. لەم بارودۆخەدا، تاك ڕەنگی خۆڵەمێشیی کەنارگیری هەڵدەبژێرێ و هەوڵ دەدا ببێتە بەشێك لە خەڵکەکە و خۆی نەکاتە گای بەش. ئاوات و بەرزەفڕی، بلێتی مردنن. ژەنەراڵێك ئەگەر خۆشەویست بێ، مەترسی لە سەر دەبێ. کەسێك کە جیاواز بێ بەرەوڕووی مەترسی دەبێتەوە. لە دەسەڵاتی ستەمکاریدا، نرخی سەرەکیی باو، لە گوێڕایەڵی، خۆ بەدەستەوەدانی بە نابەدڵی، خۆ لەبیرکردن و ملکەچیی پەتیدایە.

**ئەمانە باشترین زەمانەتی ئاسایشی تاکەکەسین.**

گەنج زۆر زوو ئەو وانانە فێر دەبێ. پڕوپاگەندەی بەردەوام و پڕ هاتوهاوار و پەروەردەی قوتابخانە، بە ناوی پێشکەوتنی گەل و سەرکەوتنی شۆڕش و بەختەوەریی نەسلەکانی داهاتوو، هەموو ئەو تایبەتمەندییانە وەك خزمەتی پێویست و جێی شانازی بە سیستەم دەقەبڵێنرێن. پێداگری و خۆماندووکردنی خۆیی (دایکی نیشتمان) پەسن دەدرێ و ئەم تایبەتمەندییە لەگەڵ سیستەمە دیموکراتییە **لەرزۆك و هەردەم لە حاڵی ڕووخانەکاندا** پێك دەگیرێ. دیارە بە ئەنجامێکی پێشوەختە ئامادە و ئاشکراوە، واتە چاکتری، لەسەر هەق بوون و تەندروستیی سیستەمی خۆیی. دەستڕاگەیشتن بە سەرچاوەی زانیاری لەسەر سیستەمە دیموکراتییەکان بە توندی بەرتەسك دەکرێتەوە، نەکا فوودانەی درۆ ڕەسمییەکانی حکوومەت بتەقێ.

**کاتێ فشاری دەرەکی، ستەمکاری ئەڵمانیا و ئیتاڵیا و ژاپۆنی بەچۆکدا هێنا، دنیا پڕ بوو لە وردەپارچەی کەسایەتیی وردوخاشکراو. مرۆڤە بوودەڵەکان بە کەسێتی**

**و کەرامەتی سیس هەڵگەڕاوەوه له نێو کەلاوەکاندا کەوتبوونه داو. سەرکەوتوانی تازە، بەرەوڕووی بەرگریکردن نەبوونەوه. ستەمکاریان توانا و پتانسیەلی بەرگرییان کوشتبوو. تەنیا تاقمێکی کەم له کەسانی دەمارگرژ له پەنا و پەسیوی دوورەدەستدا مابوون و قوونەشەڕێکیان دەکرد.**

ڕەنگه خەڵکی ئەو وڵاتانه هەمیشه و به سروشت گوێڕایەڵ و ڕێکوپێك بووبن و لەسەر ئەو بنەمایه خۆیان به دەست ستەمکارییەوه دابێ که له جاران زیاتریان گوێ لەمست کردوون. لەگەڵ رووخانی ستەمکاریدا، مێگەلی ڕەتێنراو، یان لانیکەم بەشێکیان، به ئاسانی دەشێ بۆ ئاغەڵی ستەمکارێکی تر لێبخوڕدرێن. له ئەڵمانیا، ئیتاڵیا، هەنگاریا و زۆر وڵاتی دیکەی ئەوروپیدا، گەلێ فاشیست چوونەته ریزی حیزبه کۆمۆنیستەکانەوه.

پرۆسەی پاکبوونەوه له ستەمکاری بەر له هەموو شت، پرۆسەی گەڕانەوەی کەسایەتی و کەرامەتی ئینسانییه. لەراستیدا، مەسەلەی بەهێزیی بڕوای گاندییانه له ئیحتیاتکردن له هەڵبژاردنی ئامراز و ئامرازەکانی گەیشتنه ئامانج، ڕێزگرتنی زیاتری مرۆڤ و، ئازادیی داهێنانی تاکەکەسی و بەکۆمەڵ (جیا له راگەیەنراوه حکومییەکان) دایه. فۆرمۆلی نێگەتیڤی رامالێنی نازی و فاشیستان پێویسته، بەڵام بەس نییه. ئەوان دەتوانن به پەله نان به نرخی پاواوخوازییەکی دیکه بخۆن، که هەندێکیان خواردووشیانه. بەهەرحاڵ رامالێنی نازی تەنیا ئەوانه دەگرێتەوه که هێنده قاوەیی[٣٣] بوونه که له ناو خەڵکدا وەك گای بەش وا بوون. بەڵام ئەدی لەمەڕ بیرکردنەوەی قاوەیی یان رەش یان سوور که تا رادەیەك رژاوەته نێو خوێن و رۆحی زۆربەی خەڵکەوه چی بکەین؟ ئەمەیان ئیتر پێویستی به دژه ژەهرێکی گاندییانه هەیه. **دروشمی "با به گاندی، نازیزم بسڕینەوه" ڕەنگه پێشنیارێکی بێجێ نەبێ.**

(٣٣) رەنگی یۆنیفۆرمی نازییەکان.



جلی شڕی کەسێتی مرۆڤ به دەرزییەك له جۆری سەرنێزه پینه ناکرێتەوه. هەر بەم پێیه، دیموکراسیش ناکرێ به فەرمانی تەوراتی **چاو له جیاتی چاو** سارێژ بکرێتەوه. چونکه دواجار، حوکمەکه هەموان کوێر دەکا.

هەموو هەوڵێك بۆ دەستپێکی دیموکراسی یان رێگەگرتن له پاوانخوازی، دەبێ بەردەوام جەخت لەسەر بنیاتنانەوەی کەرامەت و کەسایەتی بکاتەوه. ئازادی و وەئەستۆگرتنی ئەرك یارمەتیی ئەو هەوڵه دەدا، کەچی کردەوەی سەختگیرانه، پێشی پێدەگرێ.

دیموکراسی تەنیا به یارمەتیی خەڵکانی دیموکرات و به شێوازێکی دیموکراتی دەتوانێ بەدی بێ و پەلوپۆ باوێت. من ئەگەر توانیبام هەوڵم دەدا لەگەڵ دوژمنانی پێشوو و هەموو دژه دیموکراتەکان وەکو نەخۆش بجووڵێمەوه، له باتی ئەوەی به جینایەتکاریان بزانم. کەسانێکی زۆر جینایەتکارن. ئەوانه نەخۆشن بۆیه جینایەتکارن. له دنیای ئێمەدا رق و زەبروزەنگ لەرادەبەدەر بەکار هێنراوه. ئێمه دەتوانین میهرەبانی تاقی بکەینەوه. ئێمه دەتوانین دیموکراسی تاقی بکەینەوه.

*لۆرد پۆکنهام* وەزیری کاروباری ئەڵمانیا له حکوومەتی بەریتانیادا، دەیگوت: "هەر کارێکی نیازپاکانەمان دەرهەق به ئەڵمانەکان کردبێ، به هەمان راده وەڵامیان داوینەتەوه." ئەم جۆره رەفتاره، لەسەر بنەمای پەروەردەی دروست و به پێی ئامانجەکانی مەسیح و گاندییه. دنیای ئێمه که هەڕەشەی ئەوەمان لێدەکا بخلیسکێینه باوەشی پاوانخوازییەوه زیاتر له لایەن ئەو هەوڵەی دەیەوێ کۆیلەتی له وڵاتانی جاران دوژمن و کۆلۆنییەکان و وڵاتانی دیموکراتیدا بکاته تاهەتایی، له ژێر مەترسیدایه تا ئەزموونی ئازایانه له رێگەی ئازادیدا.

ئەوانەی رێبواری ئەم ئەزموونەن، بۆ سەرکەوتن دەبێ مرۆڤی ئازاد بن و پڕ بن له کەرامەتی ئینسانی و له رووی کردەوه و کەسێتییەوه دەوڵەمەند بن.

## بەشی حەوتەم

## هیتلەر و ستالین

مۆسولینی بۆ خزمەتکردنی ئامانجە خەڵك هەڵخەڵەتێنەکانی، رژێمەکەی خۆی بە پرۆلیتاریایی ناو دەبرد. سیستەمی سۆڤیەت بە رەسمی *ستەمکاری پرۆلیتاریاییە*. وتەبێژەکانی، وشەی بۆلشەڤیك، کۆمۆنیست و سۆسیالیست - یش لە جیاتی سۆڤیەت بەکار دێنن. ستەمکاری هیتلەری *سۆسیالیست ناسیۆنالیست* یان هەمان کورتکراوەکەی *نازی* بوو. بەڵام ستالین لە چەند شوێنی گشتیدا گوتوویەتی کە هیتلەرییەکان - ناوێك کە ئەو پێی باشترە - نەتەوەیی نەبوون، ئەوان دنیاخۆر بوون، سۆسیالیستیش نەبوون، بەڵکو پاشڤەرۆ بوون. هەر بۆیە، باڵیۆزی سۆڤیەت لە لەندەن، لە کاتی شەڕدا هەوڵی دا نەهێڵێ *بی.بی.سی* وشەی *نازی* بەکار بێنێ و ساڵی **١٩٤٧** دیپلۆماتەکانی سۆڤیەت بەرامبەر بەکاربردنی *سۆسیالیست ناسیۆنالیست* نارەزایەتییان دەربڕی. ئاخر ستالین رایگەیاندبوو فەرهەنگی سۆڤیەت **"**بە فۆرم نەتەوەیی و بە ناوەرۆك سۆسیالیستییە**"**. هەروەها ستالین ئیدیعا دەکا خۆی **رەنگدانەوەی سۆسیالیزم لە وڵاتێکدا** یان **سۆسیالیستی نەتەوەخوازی** دامەزراندووە.

لێکچوونەکە هەر بۆ ناو ناگەڕێتەوە. سیستەمە ستەمکاریەکان لە شێوازە توندوتیژ و بێبەزەییەکانیاندا لە یەکتر دەچن، لە دڵڕەقی بەرامبەر مرۆڤان و لە ئەتککردنی ژیاندا. هیتلەر بەر لەوەی بگاتە دەسەڵات بەڵێنی دا **سەران بپەڕێنی** و... کاتێ دەسەڵاتی گرتە دەست زۆر سەری پەڕاندن. کرملین بە درێژایی و بەرینایی رووسیادا جۆگەلەی خوێنی هەڵبەستن.

کۆمۆنیستانی بێگانە بە شەوق و حەماسەتێکی زۆر و بە فسکەفسك لە کەسانێ دەدوێن کە کاتێ گەیشتنە دەسەڵات، بیانکوژن. (با حکوومەت بکەوێتە دەستمان،

هەنگینیٚ مشووریان دەخۆین!) ئەم جۆرە ئاواتانە ئۆخژنێکیان بە دڵدا دێنیٚ کە سروشتی نییە.

ترۆتسکی کاتیٚ بۆلشەڤیکی ژمارە ٢ بوو کتێبێکی بۆ پاساو هێنانەوەی تۆقاندن و تیرۆر نووسی. بەڵام ئەمە ستالین بوو کە پەڕ بە پەڕی ئەو کتێبەی بە کردەوە ئەنجام دا.

**توندوتیژی، شێوەی کاری کەمینەیەکە کە ناتوانیٚ قەناعەت بە زۆرینە بێنیٚ. تەور، رەشاش و رۆنی گەرچەك" دین و ئیمانی ئەو کەسانەیە کە بڕوایان بە ئایدیا و ئەخلاق و خۆشەویستیی مرۆڤ نییە، با هەر زوڕنای خۆشبژیویی مرۆڤایەتیش بژەنن.**

توندوتیژی سەرەتا وەك ئامرازی ئامانجێك، کاری خۆی دەست پێدەکا، لە قۆناغەکانی دواتردا ئامانجە سەرەتاییەکە لە ناو دەبا و پاشان دەبێتە شێوازێك کە بە هۆی ئەوەوە دەسەڵات بێبەزەییانە دەتوانیٚ خۆی بپارێزیٚ.

لە ساڵانی سەرەتای شۆڕشی بۆلشەڤیکیدا، پۆلیسی نهێنی، چەکێك بوو لە دژی دوژمنانی رژێم. دوای ئەوەی سەرمایەدار و کوولاك و دژە شۆڕشەکان لە ناو بران، پۆلیسی نهێنی کەوتە وێزەی ئەو کەسانەی کە شۆڕشیان کردبوو و هێشتا پێی وەفادار بوون. تاوانی ئەمانە ئەمەگداری بە بنەماکانی شۆڕش بوو کە حکوومەت وردە وردە خەریك بوو ژێر پێی دەخستن.

بۆلشەڤیزم لە سەرەتادا زۆر لە فاشیزم جیاواز بوو. بۆلشەڤیکە کۆن و بەراییەکان، رۆشنبیران، کرێکاران یان شۆڕشگێڕانی کارامەی وەك لێنین، ترۆتسکی و ستالین بوون کە لە هەموو شت زیاتر هۆگری لایەنگری لە چینی کرێکار بوون. بەڵام زۆربەی نازییەکان، کەسانی سەر بە گێچەڵی چینی ناونجی و خەڵکانی سەنگەرگۆڕیو لە روانگەی سیاسییەوە بوون کە بە دژی چینی کرێکار پاڵیان وەپیشەساز و سەرمایەدارانەوە دابوو.

بۆلشەڤیکەکان لە کانیاوی شۆڕشی فەڕەنسا و فەلسەفە لیبراڵەکانی ئەورووپای رۆژئاوا بە باشی پاراو ببوون. دەسەڵاتخوازیی تزار لێیان دەپرینگایەوە. کەنیسەش هەروەتر، ئاخر لە خزمەتی پادشایەتیی موتڵەقدا بوون. کەواتە دیموکراسی و ئازادی،



بە لای لێنین و ترۆتسکییەوە ئایدیای نامۆ نەبوون. ئەوان بەڵێنی ئەوەیان دەدا کە حکوومەت بەرە بەرە لە ناو دەچیٚ و ئینجا خەڵك بۆخۆیان رزگار دەبن. هیچ فاشیستێك قەت خەونێکی وا جوانی لە سەریدا نەبووە. بە پێی پێشبینیی هیتلەر، ستەمکاریی فاشیستی، دەبوایە هەزار ساڵ تەمەنی بیٚ.

جگە لەمە، بۆلشەڤیکەکان جیهانوەتەن بوون. جیهانوەتەنی و دوژمنایەتیکردنی نەتەوەخوازی و ئیمپرایالیزم و رەگەزپەرستی، تانوپۆی کۆمۆنیزمی لێنینی-یان پێکدەهێنا. لەوێوە کە کۆمۆنیزم دەیویست **کرێکارانی دنیا یەك گرن**، چلۆن دەکرا بە پێی خوێن و شوێنی لە دایکبوون و رەنگ یان رەفتاری دایك و باوکی کەسەکان، لایەنگری لە کەسێك و دوژمنایەتیی ئەوی تر بکریٚ؟ بڕیار وا بوو کۆمۆنیزم بە گوێرەی چالاکیی ئابووری و کۆمەڵایەتیی کەسەکان هەڵیانبسەنگێنیٚ.

لە خالّی بەرامبەردا، نازییەکان جەختیان لەسەر بیرۆکەی باڵادەستیی رەچەڵەکی و نەتەوەیی دەکردەوە: **"ئەڵمانیا لە سەرووی هەمووانەوە"**، **"باڵادەستیی نیژادی ئاریا"**، **"یەك حکوومەت یەك نەتەوە، یەك سەرۆك"** و ئەوەش کە هەموو ئەڵمانەکان دەبوایە بچنە ژێر ئالاّی یەك ستەمکاری نەتەوەییەوە. ئەمانە گەرای شەڕی دووەمی جیهانی بوون.

مۆسۆلینی وەك سۆسیالیستێك دەستی بە کار کرد، سۆسیالیستێکی باڵی چەپ. ئینجا بوو بە نەتەوەخواز و سیستەمێکی ستەمکاری بەرپا کرد. ئالێرەدا، بوو بە فاشیست.

کۆنترۆڵی سەرمایەکان لە لایەن حکوومەتەوە، لە تەنیشت ستەمکاری پۆلیسی نهێنی و لە پاڵ نەتەوەخوازیدا، سۆسیالیزمی نەتەوەییە، با سەرکردەکانیشی بە ناوی رەنجدەرانەوە قسە بکەن. سۆسیالیزم گەلیٚ جۆری هەن. کارل مارکس، دژە جوولەکەیی بە **سۆسیالیزمی گەمژان** ناو دەبا. بەڵام سۆسیالیزمی نەتەوەخواز، سۆسیالیزمی جینایەتکارانە.

ئەمڕۆ لە رووسیا وشە کۆنەکان لە جێی خۆیانن: بۆلشەڤیزم، کۆمۆنیزم و سۆسیالیزم. بەڵام دەست هەڵگرتن لە ئامانجە دیموکراتییەکان، نەهامەتییە روو لە

زیادەکانی سیستەمی ستەمکاری و سەرهەڵدانی نەتەوەخوازی، ستالین دەکاتە برای بیروباوەڕیی هیتلەر و مۆسۆلینی.

گۆڕانی ڕێبازەکان لە رووسیادا، پێدەچێ لە ساڵانی **١٩٣٤** و **١٩٣٥**ەوە دەستی پێکردبێ. ستالین دەیزانی کە ئابووریی سۆڤیەت هێشتا بەڵێنەکەی خۆی لەمەڕ زگی تێر و خۆشبژیوی نەبردۆتە سەر و ساڵانی دواتریش بۆی جێبەجێ نابێ. شتێك دەبوایە تەزریق بکرێتە جەستەی کۆمەڵگاوە تا ورە و بڕوای تێدا بورووژێنێ. ئەو دەیتوانی دیموکراسی بە ئابوورییە سەرمایەداری - حکوومییەکەی خۆیەوە زیاد بکا و سۆسیالیزمی راستەقینە دابهێنێ، یان لە جیاتی ئەوە دەیتوانی نەتەوەخوازی وەك شرینقەیەك لە جەستەی مرۆڤ بدا. ئەو بە شێوازێکی تایبەتەوە هەر دووی تاقی کردنەوە. دیموکراسی لە سەر کاغەز و لە دەستووریکدا گونجاند. بەڵام هاوکات و لە کردەوەدا، دەستی بە نەتەوەخوازی (هاندانی نیشتمانپەرستیی خۆپەسندەرانە) کرد.

بەڵام سیستەمی ستەمکاری لە شانی گرانە لە قسەی خۆی بێتە خوارێ. جەنابی ستالینیش نەیدەتوانی لە کاتێکدا کە ناڕەزایەتی لە رەوشی ئابووری پەرەی دەسەند، بەرتەسکییەکانی ئازادیی تاکەکەسی کەم بکاتەوە. بە پێچەوانەوە، ناچار بوو بەرتەسکییەکان زیاتر بکا و بۆ پاساودانی شکستەکانی رژێم بەدوای هەندێ بەلاگێڕەوەدا بگەڕێ. لە دادگاییکردنەکانی مۆسکۆ کۆمەڵێك کەس تۆمەتبار بوون. دادگاییکردن و قەلاچۆکانی **١٩٣٥** تا **١٩٣٨**، دەستووریان ناردەوە پشوودان و هەموو شوێنەوارێکی دیموکراسییان لە حیزب و یەکێتیەکانی کرێکاری و سەرانسەری وڵاتدا سڕییەوە. ئەوەی ئەمڕۆ لە رووسیا ماوەتەوە، حکومەتێکە کە خاوەنی هەموو سەرمایە و تاکە بەکارهێنەرەکانیەتی، حکوومەتێك کە ستەمکارانە حوکم دەکا، نەتەوەخوازی پەرە پێدەدا و جێبەجێی دەکا. لێکدراوێکی شووم و خەتەرناك!

سۆڤیەت نیشتمانی نەتەوەی جۆراوجۆرە. خەڵکی رووسیای گەورە **٥٤** لە سەدی حەشیمەتەکەی پێکدێنن. دەوری چل ملیۆن ئۆکراینی لێ دەژین. جگە لەوە ئەرمەنی، گورجی، کالۆك، ئۆزبەك، تاجیك، جوولەکە، بوریات، ئۆسەتی، کاباردی، رووسی سپی، ئازەری، ئەڵمانی، مۆلداڤی، تاتار، ئاجاری، ئەبخازی، چەرکەس، هی



تر و هی تریشی لێ دەژین، کە بەسەریەکەوە ١٢٠ نەتەوە دەبن. حکوومەتی تزار، حکوومەتی رووسە قژکاڵ و چاوشینەکان بوو کە رقیان لە غەیرەرووسەکان هەڵدەستا. حکومەت هەوڵی دەدا لە رووی زمان و جلوبەرگ و دابونەریت و ئایینەوە بیانکاتە رووسی. تا **١٩١٧** رووسیا زیندانی کەمایەتییە نەتەوەییەکان بوو. شۆڕشی بۆلشەڤیك عۆدەدار بوو کە وڵاتەکە بکاتە یەکێتییەك لە نەتەوەگەلی ئازاد و یەکسان. هەموو کەمایەتییەکان هان دران بە زمانی زگماکی خۆیان بدوێن و ئەگەر ئەو زمانە رێنووس یان دەقی نووسراوی نەبوایە، مۆسکۆ هەندێ شارەزای دەناردن تا ئەم ئیمکانە دابهێنن. لەو ناوچانەی کە دانیشتوانی لە کەمایەتییەکان بوون، کۆمار و کۆمارە لاوەکییەکان (وەك کۆمەڵە دوورگەیەك)یان دامەزراند کە کاربەدەستەکانیان ئەندامی هەمان کەمایەتی بوون. ئەم سیاسەتە بە مانای ئۆتۆنۆمی ستانی یان ناوچەیی بوو.

بەر لە شۆڕش و تەنانەت دوایەش، هەندێ کۆمۆنیست دژی ئەو بیرە بوون. ئەوان ئەم جۆرە هەڵسوکەوتەیان بە سیاسەتی نەتەوەخوازی دادەنا و دەیانگوت کە جیاوازییە نەتەوەییەکان زەق دەکاتەوە، بۆیە رێگە لە سەرهەڵدان و دەرکەوتنی مرۆڤی ئاست نوێ واتە بەرهەمی شۆڕش دەگرێ کە نە رووسییە و نە ئەرمەنی، خاوەنی هۆشیاریی چینایەتییە، هاووڵاتییەکی لە خۆبردووە و جیهانوەتەنێکە.

بەڵام کرملین لە سەر ئەوە سوور بوو کە پێش هەموو شتێك دەبێ سیاسەتی تزار لە رووسیادا بەراوەژوو بکاتەوە. دەبوایە جۆرێك هەستی خۆ بە خاوەن زانین و دەسەڵاتدارێتی بە نیوەکەی تری یەکێتی سۆڤیەت ببەخشێ. گورجییەکی وەك ستالین و ئورژونکیدزێ، ئەرمەنییەکی وەك میگویان و قەرەخان، جوولەکەیەکی وەك زینۆڤیۆف، کامێنۆف، لیتۆنییۆف و کاگانێڤیچ گەیشتنە پلە و پایەی هەرە ژووروەی دەسەڵاتدارێتیی سۆڤیەت کە ئەمە خۆی هۆیەکی مەحکەم بوو بۆ کۆتاییهاتن بە ستەم و چەوساندنەوەی غەیرە رووسەکان. ئەو جوولەکانەی سەردەمێك قوربانیی جینۆسایدی دڕندانە و ئەشکەنجە و ئازاری دژە جوولەکەیی بوون، وەك نەتەوەکانی تر، پارێزران. هەموو بۆلشەڤیکەکان و تەنانەت زۆربەی چاودێرانی دەرەوەی دژی سۆڤیەت گوتیان

شۆڕشی کۆمۆنیستی گرفتی کەمایەتییە نەتەوەییەکانی چارەسەر کردووە. نەمانی ستەمی نەتەوایەتی وەك دەسکەوتێکی هەرە گەورەی سیستەمی سۆڤیەت پەسن درا.

هەر کە تەپۆتۆز و دووکەڵی باڕووت - و هەروەها پڕوپاگەندە- ی جەنگی دووەمی جیهانی لەسەر ئاسمانی رووسیا رەویەوە، درز و قەڵشتی زۆر لە بەهەشتی ئاشتی و ئارامیی نێوان نەتەوەکان لە رووسیا وەدەرکەوت. بەڵگە و زانیارییەکانی کرملین رایانگەیاند کە لە کاتی شەڕدا، ستالین - بە ژێرپێنانی دەستووری پەسندکراوی ١٩٣٦ی خۆی - کۆمارە ئۆتۆنۆمییەکانی کالموك ( لە نێوان ستالینگراد و ئاستراخان)، تاتارستان (لە کەریمە) و چیچان ئینگوشی (لە قەفقازی باکوور)ی سەرکوت کردووە. ئەمانە هەموویان مسوڵمان بوون. لەشکری نازی پەلاماری ئەو ناوچانەی دابوو. پاشان، گوایە ئینتیمایان بۆ سۆڤیەت نەماوە، هاوکاریی هیتلەریان کردووە. زۆربەیان، لە قسان، بۆ ئەڵمانیا لە بەرەی رۆژئاوا شەڕیان کردووە و هەندێکیشیان لە لایەن سوپای ئەمریکاوە بە دیل گیراون. هەزاران کالموك و هەڵاتووی دیکە هەر ئێستا لە ئۆردوگاکانی ژێر دەسەڵاتی ئەمریکا و ئینگلیز لە ئەڵمانیادان و لەوانەیە لە داهاتوودا لە وڵاتە عەرەبییەکانی رۆژهەڵات نیشتەجێ بکرێن.

ریشەی ناکۆکیی نێوان نەتەوەیی لە روسیای سۆڤیەتدا، لە بڵاوکراوەی *بۆلشەڤیك* ئۆرگانی رەسمیی تیۆری و سیاسیی حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتی سۆڤیەتدا بەرچاو دەکەوێ. ژمارەی جوولای ١٩٤٥ وتارێکی جەی. ئەلیکساندرۆف، سەرۆکی یەکێتی فێرکاریی سیاسی حیزبی تێدایە کە: "مێژوونووسەکانمان وەك پێویست مێژووی ناوخۆی نەتەوە جۆراوجۆرەکانی یەکێتی سۆڤیەت شی ناکەنەوە. هەر بۆیە شەڕی نێوان نەتەوەکان پووش بەسەر دەکرێ و ژمارەیەکی کەم لە شازادە و سەرکردە خاوەن زەوییەکان دەکرێنە قارەمانی نەتەوەیی. بۆ نموونە دەکرێ چاو لە کتێبێك بکەین کە لە قازان لە بارەی داستانی پاڵەوانێتیی *عیدگای* بڵاو کراوەتەوە. لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٠ دا، لە بڵاڤۆکی تاتاری *ئەدەبی "سۆڤیەت"*دا، کورتەیەك لە شانۆنامەی پاڵەوانێتیی *عیدگای* لە چاپ دراوە کە دەقە سەرەکییەکەی، لە نووسینی نووسەری تاتار، *ئان ئیزان بتەوە* ئامادەی چاپ بووە. قارەمانی داستانی پاڵەوانێتیی عیدگای بەرەبەرە کرایە



قارەمانی جەماوەریی تاتارەکان. عیدگای مڵکدارێکی گەورەی *قۆشەنی زێڕین*، فەرماندە و سەرکردەی ئازای لەشکریی پەیڕەوی *تەختەمیش* و *تەیموری لەنگ* بوو. دوای ماوەیەك بوو بە ئەمیری *قۆشەنی زێڕین*. چەند جارێ پەلاماری رووخێنەرانەی شار و گوندەکانی رووسیای دا. ساڵی ١٤٠٨ عیدگای بوو بە فەرماندەی هێرشی مەغۆلی - تاتاری لە دژی مۆسکۆ. *نیژنی نۆڤ، گۆرود، پریاس لاول، روستۆف، ست پۆخۆف* و گەلێ شاری دیکەی دەوروبەری مۆسکۆی سووتاندن. باجی خستە سەر مۆسکۆ، لە گەڕانەوەدا *ریازانی* تالان کرد و هەزاران رووسیی کردنە کۆیلەی خۆی و لە وڵاتی دوورخستنەوە. بە وتەیەکی دی، عیدگای راست وەك خانێکی تاتاری سەدەی پازدە جوولایەوە کە شەڕی رووسە گەورە مۆسکۆنشینەکانیان دەکرد. عیدگای بە دڵنیاییەوە ناشێ وەك هاوولاتییەکی باشی هیچ وڵاتێك لە قەڵەم بدرێ. هەر وەك *ئەلیکساندر نێڤسکی* شاسواری سەدەی ١٣، *ئیڤان مخۆف، پیتێری مەزن، کاترینی مەزن، ژەنەراڵ سووارۆف* کە لە شەڕەکانی سەدەی هەژدەمدا بەشدار بوو و لە سەرانسەری ئەورووپا شۆڕشەکانی سەرکوت دەکردن، هیچکام ناتوانن ئەو دەورە ببینن. لەگەڵ ئەوەشدا، کرملین، لە ساڵی ١٩٣٦ بەملاوە، ئەو ستەمکار و تالانچییە خۆماڵییانەی لە زبڵدانی مێژوو هێنانەوە دەرێ (زبڵدانێك کە بۆلشەڤیکە سەرەتاییەکان، بە دروستی لەوێیان خستبوون) و رەنگە تۆخەکەی سۆڤیەتی تێهەڵسوون و وەك قارەمانە نوێیەکانی یەکێتی سۆڤیەت قەبڵاندنی.[٣٤] دوای ئەوە بوو کە تاتارەکان لەبەر خۆیانەوە گوتیان باشە ئێمە

(٣٤) مەگەر مێژووی سوڵتانە دەسەڵاتدارەکان، زۆربەی جار شتێ بووە جگە لە چیرۆکی تاقمێك رێگر یان هەقخوازی لە ناکاو پەیدابوو کە بە سەر دز و رێگر یان میراتگرانی جووڵانەوە رزگاریخوازەکاندا زاڵ بوونە و چیرۆکەکەی بە دڵی خۆیان دەنووسنەوە و بۆ وەچەی دوای خۆشیانی هەڵدەگرن. چیرۆکی تێکهەڵچوونی وردە دزەکان کە(بەیهەقی گوتەنی) بە هەڵکەوت بەسەر وردە دزی دیکەدا زاڵ دەبن و وردە وردە شەجەرەنامەیەکش بۆخۆیان هەڵدەبەستن، تا وای نیشان بدەن، هەر لە ئەزەلەوە، هەڵبژاردە و میرو خوونکار بوونە و بڵێن ئێمە هەڵبژاردەی خواین. خوا هەمیشە لەپشتمان بووە و کەس بۆی نییە پەنجەمان بۆ رابکێشێ. حیکایەتێك کە نەك لە ئێرانی پێش - ئیسلام و دوای ئیسلامدا، بەڵکو لە مێژووی وڵاتانی دیکەی دنیاشدا نموونەی زۆرە. هەر جارە و بەشێوەیەکی تر.

بۆ لە **١٩٤٠**دا ئەو کارە لەگەڵ قارەمانە نەتەوەییەکانی خۆمان نەکەین؟ مۆسکۆ وەڵامی دایەوە: "نا، عیدگای رووسی شکست داون."عیدگای بوو بە قارەمانی قەدەغە.

بەم جۆرە نەتەوەخوازیی رووسی بوو بە هۆی وروژانی هەستی نەتەوەخوازیی تاتارەکان و ستەمی رووس لە تاتاران.

حاڵەکە لە ئۆکراین، لەوەش شڕترە. لە نێو کۆمۆنیست و ناکۆمۆنیستە ئۆکرانییەکان، هەردەم حەزی نەتەوەخوازی و تەنانەت سەربەخۆییخوازی هەبوو.

لە ساڵانی بیستەکان و سییەکاندا، کرملین چەندین جار هەواڵی قەڵاچۆکردن و سزادانی ئۆکرانییە سەربەخۆییخوازەکانی راگەیاند. کاتێ مۆسکۆ دەستی بە پەرەپێدانی نەتەوەخوازیی رووسی کرد، ئەنجامەکەی بەهێزکردنی هەستی نەتەوەیی ئۆکرانییەکان بوو. نازییەکان ئەو کاتەی ئۆکراینیان داگیر کردبوو هەرچی لە دەستیان هات بۆ دڵگەرم کردنی ئۆکراینیەکان بۆ جیابوونەوە لە مۆسکۆ ئەنجامیان دا.

مۆسکۆ بۆ بیمەکردنی وەفاداریی خەڵکی ئۆکراین بەرامبەر بە خۆی، لافی ئەوەی لێداوە کە هەموو ئەو ناوچانەی کە ئۆکراینییەکان لە پۆڵۆنیا، چێکوسلۆڤاکی و رۆمانی لێی نیشتەجێن خستۆتەوە سەر ئۆکراین و بەم جۆرە خەونی هەزار ساڵەی ئۆکراینی وەدی هێناوە. ستالین لە راستیدا هەموو سەرزەوییە ئۆکراین نشینەکانی ئەوروپای خستنە ژێر ئاڵای رووسیاوە؛ جا ئۆکراینییەکان چلۆن دەیانتوانی ئاواتی جیابوونەوە لە یەکێتی سۆڤیەت بخوازن؟

رژێمی سۆڤیەت بە مەبەستی پتەوترکردنی کۆت و پێوەندی نێوان مۆسکۆ و ئۆکراین لەو ساڵانەی دواییدا، دەستی بە رێزگرتن لە *بوگدان خمل نیتسکی* قارەمانی نەتەوەیی ئۆکراین و هێتمان کردووە. لە سەردەمی شەڕدا،تاقێکی یادمان و مینۆمێنتێکی گرنگی سەربازیی بە ناوی بوگدان خمل نیتسکی دروست کرا و شاری *پرێ یاسلاڤ* ناوی گۆڕا بۆ *پرێ یاسلاڤ خمل نیتسکی*.

خاڵی شاراوەی ئەم رێزلێنان و بیرئانینە ئەوەیە کە خمل نیتسکی لە ژانویەی ١٦٥٤دا ئۆکرانیای بە رووسیا بەستەوە و مۆسکۆ دەیەوێ جەخت لە سەر ئەو راستییە



بکاتەوە. ئەوە لە حاڵێکدایە ئەگەر لای جوولەکەیەك کە لە سەردەمی تزاردا ژیاوە ناوی خمل نیتسکی ببەی یەکسەر پێت دەڵێ: **جووکوژ** بووە. بوگدان بە قەتڵوعامی جوولەکان بەناوبانگە.

نەتەوەخوازیی ئۆکراینییەکان کە ئەمڕۆکە لەوە بەهێزترە سەرکوت بکرێ، بەر لە هەموو شتێك، هەمیشە بە مانای دژەجوویی بووە.

جگە لەوە، بۆ یەکەم جار دوای شۆڕشی بۆلشەڤیکی **١٩١٧**، هەندێ نیشانە وەدیار کەوتوون کە دژەجوو بوون بە شێوەی رەسمی دەسەلمێنێ. لابردنی خێرای جوولەکەکان لە دامودەزگاکانی دەرەوەی سۆڤیەت، کەم کردنەوەی ژمارەیان لە هەندێ دامودەزگای پەروەردەیی، بەتایبەت ئەوانەی رەنگە لە قوتابخانەی دیپلۆماتیکی مۆسکۆ خۆیان ناونووس بکەن، نموونەگەلێکن لەو سیاسەتە. پێشتر سەدان جوولەکە لە وەزارەتی دەرەوەی سۆڤیەتدا  لە مۆسکۆ کاربەدەست بوون، بەڵام ئێستا تاقمێکی پەنجەژمێر لەوێ ماون. هەر ئەو شێوازە لە دامودەزگاکانی دیکەش دەبینرێ. جگە لەوە، بەشی هەرە زۆری ئەندامە جوولەکەکانی حیزبی کۆمۆنیست، بە پێی راپۆرتی باوەڕ پێکراو، ئەو رێکخراوەیان جێ هێشتووە.

کاتێ کرملین بوو بە پەرەپێدەری نەتەوەخوازی لە رووسیای گەورەدا و ستالین لە **٢٤**ی مانگی مەی **١٩٤٥** لە میواندارییەك لە مۆسکۆ توانی دەربڕێ کە: "روسەکان نەتەوەی پێشەنگی یەکێتی سۆڤیەتن" ئەم گۆڕانکارییانەی بە دوادا هاتن. ئەمەیە تیۆرە کۆنەکەی **رووس بەرزترن**، تیۆری باڵادەستیی نیژادیی نەتەوەیەکی تایبەت کە ئاکامەکەی، سروشتییە، سووکایەتیکردن و بە کەم زانینی نەتەوەکانی دیکەیە. بیرۆکەی **تەنیا سلاڤەکان، تەنیا ئەڵمانی، تەنیا ژاپۆنی، تەنیا ئۆکراینی** و **تەنیا تورك** هەموویان لە یەك سەرچاوە ئاو دەخۆنەوە. ئەم بۆچوونە بە مانای ستەم و فەرق و جیاوازی لە ناوخۆدا و تەماح برینە خاکی وڵاتانی ترە.

سەرهەڵدانی بارگرژیی نەتەوەخوازانە لە رووسیا ئاڵوگۆڕێکی نوێیە و هێشتا نەکەوتۆتە بەر چاوی گەلێ لە بێگانان. بەڵام کەمایەتییەکانی ناوی یەکێتی سۆڤیەت و بە تایبەت گرووپە مسوڵمان و ئۆکراینیەکان، بە دژی نەتەوەخوازیی رووسیای گەورە لە

کاتی شەڕدا دژکردەوەیان لە خۆیان نیشان دا. بە لای سەد و چەند کەمایەتیی نەتەوەیی غەیرە رووسی و غەیرە سلاڤی، نەتەوەخوازیی رووسی کە ستالینی گورجی لە ساڵی **١٩٣٥** دا شێلگیرانە بنیاتی نا، لە خزمەتی توند و بەهێزکردنی دڵڕەنجانێکدا بوو کە ستەمکاری مۆسکۆیی بەردەوام ورووژاندوویە و زیندووی کردۆتەوە. کەمایەتییەکان خاوەنی ئۆتۆنۆمیی فەرهەنگیی بەربڵاو بوون، بەڵام لە کاروباری سیاسی و ئابووریدا، ئۆتۆنۆمییە کاغەزییەکەیان، بە ناوەندگەراییە وشك و رەق و تەقەکەی کرملین دەبۆوە خشە خش. لە سەرانسەری دنیادا هیچ حکومەت و دەوڵەتێکی ناوەندگەراتر لە یەکێتی سۆڤیەت بوونی نییە. کاربەدەستانی فیدراڵ بەرپرسی راستەوخۆی ئابووریی هەموو وڵاتەکەن. کۆمارە بەناو ئۆتۆنۆمییەکان، گوێڕایەڵی مۆسکۆن. ئەم شێوازە باشیی خۆشی هەن، چونکە دەرفەتی پلاندانانی نیشتمانی و هەماهەنگیی هەوڵەکان بەدی دێنێ، بەڵام ئازادیی ناوچەیی و سەربەخۆییان دەکوژێ. حکوومەتێکی فیدراڵی تا ئەوپەڕ دەسەڵاتدار، گاڵتەجارێکە لە فیدراڵیزمی بانگەشەیی دەستکردی سۆڤیەت.

لە داهاتوودا، لەم یان ئەو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەورووپا یان هیندی فیدراڵ یان ئاسیای یەکگرتوو، دانوستانی نێوان دەوڵەتی ناوەندی و دەوڵەتی ویلایەت و ستانەکان و قەوارە نەتەوەییەکان دەبێتە کارێکی پێویست. بەڵام سیستەمی ستەمکاری، چ لە جۆرە هیتلەرییەکەی یان ستالینییەکەی، چ لە جۆرە فاشیستی یان کۆمۆنیستییەکەی، رێگە لە دانوستانێکی وەها دەگرێ. ئەم حکوومەتە، دەسەڵات لە ناوەنددا و بە زیانی پەراوێزەکان، قۆرخ دەکات.

ئاوێتەکردنی ستەمکاری و نەتەوەخوازی، تایبەتمەندیی جیهانوەتەنیی سیاسەتە ناوخۆ و دەرەکییەکانی یەکێتی سۆڤیەتی لەناو برد. نوێنەرانی سۆڤیەت ئێستا لە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و لە کۆنفرانسەکانی دی جەخت لەسەر **سەروەریی نەتەوەیی** دەکەنەوە. هەر ئاوهاشە کە دژایەتی پرۆژە بڕیاری ئەمریکیی کۆنترۆڵکردنی بۆمبی ئەتۆم و هەروەها دژایەتیی هاوکاریی نێودەوڵەتی بۆ نۆژەنکردنەوەی ئەورووپا دەکەن. هەر ئاوایە کە مۆسکۆ دژایەتی لابردنی مافی ڤیتۆ لە پەیماننامەی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان دەکا. ڤیتۆ سەروەریی نەتەوەییە و بۆیە سۆڤیەتەکان دژی



حکوومەتی جیهانین. حکوومەتێك کە گوشارە چاوەڕوانکراوەکانی بۆ سەر مۆسکۆ، لە روانگەی ئەوانەوە بە پاشڤەڕۆیی دادەنرێ.

نەتەوەخوازی، پەرە بە ستەمکاری دەدا و ستەمکاری، نەتەوەخوازی دەگەیەنێتە لووتکە. بەڵام نەتەوەخوازیی پەتی کە زۆربەی کات بە بەراورد لەگەڵ تێکەڵاوکردنی نەتەوەخوازی و ستەمکاریدا کەمتر زیان و تەقینەوەی لێدەکەونەوە، لە ناو هەموو دیموکراسییەکاندا هەیە. ئەمە خاڵی لاوازیانە. خاڵی لاوازی گشت دنیای دیموکراتیشە، چونکە رق و جیایی دەخولقێنێ. نەتەوەخوازیی ئابووری و سیاسی، هۆکاری هەبوونی جیهانخۆریی ئیمپریالیستی و هەڵگیرسانی جەنگەکانە. ئەمانە میلەی زیندانی رەنگی پێست و چەوساندنەوەی نەتەوەیی دەخولقێنن. دژە مەسیحایی، دژە دیموکراسی و دژە ئەخلاقین. نەتەوەخوازی، بەڵا و کارەساتی دنیای نوێیە.

مامۆستا ئەلبێرت ئەنشتاین دەڵێ: ئەمە نەتەوەخوازی بوو کە فاتیحای ئەورووپای خوێند. ئەگەر نەتەوخوازی درێژە بە گەشەکردنی خۆی بدا، شارستانییەت جێگەی خۆی دەداتە پاوانخوازی. نەتەوەخوازی لە حاڵی گەشەکردندایە. زەلیلی و نەهامەتی ئەنجامی دەسەڵاتی درێژخایەنی بێگانە، ژمارەیەکی زۆر لە هیندییەکانی کردوونە **هیند پەرست** و نەتەوەخوازییەکی ئاگراوییانە **"خۆشەویستیی تەواو سروشتی بۆ ئازادی"** زیاد کردووە. لاوە تیرۆریستە جوولەکەکان لە فەلەستین، لە تۆوی نازین. سیناتۆرێکی کۆنەپارێزی ئەمریکا، کە قارەمانی سیستەمێکی سیاسیی سەرتاپا گەندەڵ و رەمزی هەموو ئەو شتانەیە کە لە ئایالەتەکانی باشوور، رزیو و دژی ئازادییە، بە راشکاوی دەڵێ کە ئەم یان ئەو **هاووڵاتییە بەشەرەف و یاساپارێزە ئەمریکییە** کە بە هەوڵی خۆی شایستەیی کارکردن لە دایرە حکوومییەکانی بەدەست هێناوە، لە ئەمریکاییەکی راستەقینە و بە ناو رەسەن کەم بایەخترە، چونکە دایك و بابی پتر لە ٧٠ ساڵ لەمەوبەر، لە وڵاتی نەمسا - هەنگاریاوە هاتوونە دنیا، بۆیە ئەو ئەمریکاییەکی رەسەن نییە.

سیاسەتوانانی باشوور، بە ئاشکرا باڵۆڕەی **باڵادەستیی سپییەکان** لێدەدەن و بە دژی کاتۆلیك و قولەڕەش و جوولەکان رێکخراو دادەمەزرێنن. میسر سوورە لەسەر

ئەوەی کە بێگانەکان کاتی هاتن و چوون بۆ وڵاتەکە، **ئایینی** خۆیان لە پرسیارنامەکاندا بنووسن. مسوڵمان و هیندووەکان لە نیمچە قارەی هیند بەربوونەتە گیانی یەکتر. هیندووەکان خراپ لەگەڵ گلاوەکان دەجووڵێنەوە. جوولەکە و عەرەب بەردەوام شەڕیانە. مەسیحی و جوولەکە وەك برا پێکەوە رەفتار ناکەن. چێکوسلۆڤاکیا، کە سەردەمێك پێشکەوتووترین دیموکراسیەتی ئەوروپای ناوەندی بوو، لە سایەی حکوومەتی کۆمۆنیستیدا، کاری نابەجێ بەرامبەر بە هەنگار و ئەڵمانەکان ئەنجام دەدا، پێدەچێ بەو مەبەستەی کە لە رووی نیژادییەوە بە تەواوی پاك ببنەوە و ببنە سلاڤ.( کە هیچ کەس نازانێ پاك بوونەوە یانی چی؟)

بەم جۆرەیە کە دیموکراسی دەمرێ. نەتەوەخوازی، خانە بە خانە، کر بە کر، دیموکراسیی ساخلەم دەکاتە پاوانخوازی دزێو. دوژمنکاریی روو لە زیادی نەتەوەخوازیی دوای شەڕ پەلاماری دیموکراسی دەدا کە خۆی پێشتر لە ژێر زەختی بارودۆخێکدا لاواز ببوو و هەڵبەت ئاکامەکانی ئەو پەلامارە کارەساتبارن.

دیموکراسی لە سەر ئەو بنەمایە وەستاوە کە **هەموو مرۆڤەکان بە یەکسانی لە دایك دەبن**. کاتێ مرۆڤ لەبەر بیچمی لووتی، شوێنی لەدایکبوونی، رەنگی پێستی، جۆری ئایینی، دەمودووی قسەکردنی، ئاوازی بێگانەی ناوەکەی! یان بیرو باوەڕ و کرداری خزمەکانی، لەگەڵ خەڵکی تر یەکسان دانانرێ، ئەم بنەمایە لەرزۆك دەبێ. تەنیا ئەو کەسانە بۆیان هەیە بەو هۆکارانە خەڵکی تر هەڵپێچن یان ئازاریان بدەن و راوەدوویان بنێن کە خۆیان دایك و باب و باپیری خۆیان هەڵبژاردبێ!

تەنیا یەك جۆرە سیستەمی نوخبەگەرا هەیە کە گەیشتنە پلەو پایە لەودا، بۆ ئەو کەسایەتییە پاك و رەوشتبەرزانەیە کە خزمەتی هاوڕەگەزەکانی خۆیان دەکەن. لەو سیستەمەدا بۆ سیاسەتوان و دیپلۆماتەکان جێگا زۆرە. بە راستی چەند کەس لەمانە دەچنە ریزی سیستەمێکی ئەوتۆ؟



# بەشی هەشتەم

## سەرپشك بوون

جێگری پێشووی سەرۆك کۆمار، والاس گوتوویەتی: "لە نێوان فاشیزم و کۆمۆنیزم، من کۆمۆنیزم هەڵدەبژێرم." بەڵام هەردووکیان بکوژی ئازادین. ئەگەر بڕیار بوایە دنیا کەوتبایە سەر دووڕیانی هەڵبژاردنی فاشیزم یان کۆمۆنیزم، دیموکراسی تێدا دەچوو.

هیتلەر و گوبلێتز ئەم دووڕیانەیان تەسکتر کردەوە بۆ دووڕیانی نازیزم یان بۆلشەڤیزم. هەموو دژە نازییەك، کۆمۆنیست بوو. هیتلەر، بە پرێزیدێنت بێهـ- نێزی دەگوت کۆمۆنیست. بۆ؟ چونکە بێهـ- نێز دەیویست چێکوسلۆڤاکی سەربەخۆ بمێنێتەوە.

فرانکۆ دەیگوت: "ئیسپانیا هێمای هەڵبژاردنی یەك لە فاشیزم و کۆمۆنیزمە." لە کاتی شەڕی ناوخۆی ئیسپانیادا (٣٩- ١٩٣٦) ، زۆر لە کۆنەپەرستەکان، هەر ئەو پاساوەیان بۆ پشتیوانیکردن لە فاشیزم دەهێنایەوە.

کۆنەپەرستی، هەندێکیان بۆ ئۆردووگای کۆمۆنیستان پاڵدەنێ و کۆمۆنیست هەندێکی دی بۆ ئۆردوگای راست دەڕەتێنێ. هەموو روانگەیەکی توندڕۆییانە، هۆکاری چوونە ریزی روانگەی بەرامبەرە. لەو ناوەدا ئەوە دیموکراسییە کە گورزی بەر دەکەوێ.

یونان لەو ناوەدا نموونەیەکی سامناك و تاقانەیە.

پادشای یۆنان، لە هیچ و خۆڕا، دەرفەتی کەوتۆتە دەست کە لە ئەسینا بگەڕێتەوە سەر تاج و تەختەکەی خۆی. شاپەرستە دەستە راستەکان لە دەوری گرد بوونەتەوە. کۆمۆنیستەکانیش وەك هەمیشە لە پێشەوەی هەمواندا و توندتر لە نەیارەکانیان، لە کەڕەنای هۆشدارییان تووڕاند و میانەڕەوەکانیان بانگهێشت کردن تا بچنە ژێر

ئالآی دژە پاشایەتی ئەوانەوە. لەوێوە کە مەترسیی کۆنەپەرستی جیددی بوو، ژمارەیەکی زۆریان ڕەگەڵ کەوتن. بۆیە، دۆستانی پادشاش کە بینیان کۆمۆنیست خەریکە بەهێز دەبن، داوایان لە میانەڕۆ **کۆنەپارێزترەکان** کرد پشتی شا بگرن. هەندێکیان قەبووڵیان کرد. ئەم دۆخە بیانووی زیاتری بۆ ڕاکێشانی خەڵك دایە دەستە کۆمۆنیستان و لەو لاشەوە بوو بە هاندەرێك بۆ شاپەرستان کە ژمارەیەکی دیکە لە میانەڕۆیان پەلکێشی ئۆردوگای ڕاست بکەن.

ئەگەر ئەو پرۆسەیە هەندێکی دی درێژەی هەبا، میانەڕۆ بەتەواوی لە ناو دەچوون و تەنیا دوو لایەنی توندڕۆ دەمانەوە. ئەودەم هیچ بۆشاییی یان پردێکیان لە نێواندا نەدەما و بێگومان ملیان لەبەر ملی یەك دەنا.

ئەم رق بە رقەیە، فەڕەنسا، ئیتالیا، چین و گەلێ وڵاتی تر و تەنانەت کەمێکیش ویلایەتە یەکگرتووەکانی خستۆتە مەترسییەوە. لە دنیای دیموکراتیدا، ئەمە گەورەترین مەترسییە لە سەر ئاشتی. تێکهەڵچوونێکی نێوان توندڕۆ قەبە و هەڵفزاوەکانی وڵاتانی جۆراوجۆر، بە مانای مەترسیی هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆی، کەمتاکورت هاوکات، لە دانە دانەی ئەو وڵاتانەیە. مەترسییەك کە دەتوانێ سێهەمین جەنگی جیهانی بە دواوە بێ. پێشگیری لە شەڕ و رزگاریی دیموکراسی، بە بەهێزیی میانەڕۆکان و لاوازیی توندڕۆ کۆنەپەرست و کۆمۆنیستەکانەوە بەندە.

هەر دووك جەمسەری لایەنە توندڕۆکان، بەردەوام لە هەوڵدان کە نەیارە نەرمونیانەکانیان لە گۆڕەپانەکە وەدەر بنێن. لە وڵاتێکی وەك ئەمریکادا، کۆنەپەرستەکان هەست دەکەن ئەگەر توانیبایان قەناعەت بە خەڵکی بهێنن کە کۆمۆنیستەکان خەتەرن و تەنیا ئەمان دەتوانن لە کۆڵ خەڵکیان بکەنەوە، ئەودەم دەستیان دەگەیشتە دەسەڵات. لە وڵاتێکی وەك فەڕەنسادا، کۆمۆنیستەکان لەوە دڵنیان لە ململانێیەکی دەستەویەخە لەگەڵ کۆنەپەرستاندا شکستیان دەدەن. کۆمۆنیستی فەڕەنساش بانگەشەی ئەوە دەکەن کە تەنیا یەك شەڕ لە ئارادایە و ئەویش بە دژی کۆنەپەرستانە و هەموو ئەوانەی دژی کۆنەپەرستین دەبێ بچنە ریزی



کۆمۆنیستانەوە. هەردووك جەمسەری ئەو توندڕۆییە، هیوادارن بە لە ناوبردنی میانەڕۆیی، شەڕەکە ببەنەوە و جەغزی هەڵبژاردن لە نێوان خۆیان و نەیارەکەیان تەسکتر بکەنەوە. (دۆڵێکی قووڵی رق و نەفرەت کە کۆمۆنیستەکان باسی دەکەن). هەندێ جار، بۆوێنە لە چین، کۆمۆنیستەکان خۆیان وەك میانەڕۆ و دیموکرات پیشان دەدەن. دۆستە بێگانەکانیان بە لایەنێکی ساویلکانەی وەك **چاکسازیخوازی جووتیاری** دەزانن.

ڕاستیەکەشی هەر وایە. چین ئێجگار پێویستی بە چاکسازیی زەویوزارە، بەڵام کۆمۆنیستەکانی چین خوازیاری حکوومەتێکی تاك حیزبین و هەردەم چاوەڕوانی ئەوەن کردەوەکانیان لە لایەن مۆسکۆوە پەسند بکرێ. ئەگەر کۆمۆنیستەکانی چین بە میانەڕۆ دانرابان، ئیدی هیچ میانەڕۆیەکی دی بەختی سەرهەڵدانی نەدەبوو.

لە ئەڵمانیا، بەر لە هیتلەر، کۆمۆنیستەکان بۆ لاوازکردنی کۆمار پشتگیرییان لە پێشنیاری نازییەکان دەکرد. دەیانگوت ئەگەر کۆمار برووخێ، نازییەکان دێنە سەر کار، پاشان شکست دەخۆن و تەسلیمی کۆمۆنیستان دەبن. توندڕۆکان وا بیر لە شەقامی دەسەڵات دەکەنەوە کە دەبێ بە سەر تەرمی میانەڕۆ نەرمونیانەکاندا تێپەڕێ.

ڕۆژانی بەر لە پەیدابوونی هیتلەر، کۆمۆنیستەکان تەقەکردن لە سوسیال دێموکراتەکانیان خەست کردبوو. سۆسیال دیموکراتەکان بڕوایان بە سۆسیالیزمێك لە پەنا ئازادیدا هەبوو؛ کۆمۆنیستەکان پشتگیرییان لە سۆسیالیزمی هاوڕێ لەگەڵ ستەمکاری دەکرد.

سۆسیال دێموکراتەکانی ئەڵمانیا، وەك کەسانی دیموکرات، دژە نازی بوون و بە هەمان هۆش دژە کۆمۆنیست. کەواتە کۆمۆنیستەکان پێیان دەگوتن **سۆسیال فاشیست**. کۆمۆنیستەکان بۆ جنێوفرۆشی و خەڵك هەڵخەڵەتاندن کەس تۆزی نەدەشکاندن. دوژمنایەتیی ئەوان و سۆسیال دیموکراتەکان یارمەتیی هیتلەری دا بگاتە دەسەڵات.

ئەم دەرسە سامناکە و مەترسیی فاشیزم لە سەرانسەری ئەوروپادا، بەرەیەکی یەکگرتوو، یان بەرەیەکی جەماوەریی لە ئیسپانیا، فەرەنسا و کۆمارەکانی تردا پێکهێنا. لیبراڵ و سۆسیالیست و کۆمۆنیست بە دژی فاشیزم یەکیان گرت. مۆسکۆ ئەو مەسەلەیەی ورووژاند و پشتی گرت.

لە ناو گشت ئەو گرووپانەدا، کۆمۆنیستەکان لە هەموان زیاتر هەوڵ و قوربانییان دا.[٣٥] بەڵام هەمیشە جارێ، سەرکردەکانیان بە دوای کۆنترۆڵکردنی گشت بەرە یەکگرتوو یان جەماوەرییەکەوە بوون و لەو پێناوەدا هەندێ جار وەها سەردەکەوتن کە گرووپە ناکۆمۆنیستەکانیان تاهەتایە لە کردەوەی خۆیان پەشیمان دەکردنەوە و بەرەکەشیان لە بەریەك هەڵدەوەشاند.

ناکۆمۆنیستەکان وردە وردە تێگەیشتن ئەمان، تینووی دەسەڵاتن و بۆ گەیشتن بەو ئامانجە هەموو شتێك ژێر پێ دەنێن، درۆ دەکەن و کوێرکوێرانە گوێڕایەڵی مۆسکۆن.

بە ئیمزاکردنی پەیمانی ستالین - هیتلەر لە ئووتی **١٩٣٩**دا، بەرە یەکگرتووە جەماوەرییەکەی نیوەی دووەمی سییەکان، لە ناکاو جوانەمەرگ بوو. لە کاتێکدا ستالین لە نزیکەوە پەیوەندی لەگەڵ نازییەکان هەبوو، دژە نازییەکان چۆن دەیانتوانی هاوکاریی لایەنگرانی ستالین بکەن؟ کۆمۆنیستەکان تا بەر لە پەلاماری هیتلەر بۆ سەر سۆڤیەت، چۆن دەیانتوانی باسی دژایەتیکردنی فاشیزم بکەن؛ لە کاتێکدا خۆیان لە بەریتانیا و فەرەنسا و ئەمریکا لە بەرەی دژە هیتلەریدا، کاری تێکدەرانەیان دەکرد؟ چەمکی **دژە فاشیست** لە هرزی کۆمۆنیستەکاندا، پێدەچێ بە مانای پەتیی هاوڕێیەتیکردنی رووسیا بێ. جا با رووسیاش هاوکاری فاشیستان بێ، یان ئەم دۆستایەتیکردنە لە سەر حیسابی لەناوچوونی دیموکراسیش بێ!

(٣٥) ئەم راپۆرتە رادەی هەوڵ و فیداکاریی ئەو خەڵکانە دەردەخا کە ئۆگری بیروباوەڕی خۆیان بوون و بۆنموونە سەنگەرگۆڕکێیان نەدەکرد. بە شێوەیەکی گشتی سەرکردەکان، جەماوەریان لە ئامانج و پلانەکانی خۆیان ئاگادار نەدەکردەوە و تەنیا وەك ئامرازی گەیشتن بە دەسەڵات، سوودیان لە بەهێزترین و زۆربەی جار پاکترین هانە دەروونییەکانی چالاکان وەردەگرت.



دوای ئەوە، دنیا گەیشتە تێگەیشتنێکی قووڵتر لە ماهیەتی سیاسەت و کردەوەی پاوانخوازانە. پاوانخوازان، چ سوور بن، چ قاوەیی، چ رەش[٣٦] دوژمنی سیستەمی دیموکراسین. ئاگربەسی کاتی لەگەڵیاندا، بە مانای بە فیڕۆدانی کات و لە دەستدانی پێگەیە. نەیارانی پاوانخوازی ناتوانن متمانە بە پاوانخوازان بکەن و لە بەر ئەوە ناتوانن کاریان لەگەڵدا بکەن. بوونی کۆمۆنیستان لە شوێنە حەساسەکان، لە هەر وڵاتێك یان سەرانسەری جیهاندا کۆسپێکی گەورەیە لەسەر رێگەی یەکگرتوویی یەکێتییەکانی کرێکاری و رۆژکاران، چینی کرێکار و جووڵاونەوە دژە فاشیستییە ئازادیخوازەکان، چونکە ملیۆنان لایەنگری دیموکراسی خۆیان لە هاوکاریکردنی دژەدیموکراتەکان دەپارێزن.

کەسانی بە ویژدان و رێزدار، رەنگە جاروبار خۆیان سەرکۆنە بکەن کە ناچار بوونە لە هەڵبژاردنی نیشتمانیدا، یارمەتیی کۆمۆنیستان لە لایەنگریکردن لە پاڵێوارێکی لێوەشاوە- کە بە دژی ئیمپریالیزم خەبات دەکا، بە دژی چەوساندنەوەی نیژادی شەڕ دەکا، خانووی زیاتر دروست دەکا و... - رەت بکەنەوە - بەڵام دەبێ بزانین کە کۆمۆنیستەکان وەکو ئامرازێکن بۆ یەك ئامانج و دیموکراتی راستەقینە، تەنیا سوود لە ئامرازێك وەردەگرێ کە نرخی ئامانجەکەی هەبێ. ئەگەر وا نەبێ مامەڵەکە لە رەگ و ریشەوە، سەقەت و هەڵوەشاوە و گەندەڵە.

ئاکامەکانی کاری هاوبەش لەگەڵ پاوانخوازان، یان سیاسەتوانی گەندەڵ، ئەوەندە خراپ و بەربڵاو و کاریگەرن کە وردە بەرژەوەندییە ئیحتمالییەکان کاڵ و بێبەها دەکا.

(٣٦) بە سەرە، مەبەست کۆمۆنیست و نازی و فاشیستەکانن کە ئەو رەنگانەیان لە جلوبەرگ یاندا یان پڕوپاگەندە گرووپییەکانیاندا بەکار دەهێنان.

ئەو سۆسیالیست یان لیبراڵانەی(٣٧) هاوکاریی کۆمۆنیستان دەکەن، ناتوانن رەخنە لە کۆمۆنیزم بگرن، مەگەر تۆمەتی نارێکی لەلایەن ئەوانەوە قەبووڵ بکەن. کۆمۆنیستەکان خوازیاری هاوکاری لەگەڵ سۆسیالیستەکان، یەکێتییەکانی کار و لیبراڵەکانن تا دوژمن و نەیارە سروشتییەکانی خۆیان لەسەر رێگە لابدەن و بێدەنگیان بکەن، بەڵام تا ئەو کاتەی کە بۆنموونە سۆسیالیستەکان رەخنەیەك لە کۆمۆنیستان نەگرن و پاوانخوازیی ئەوان لەقاو نەدەن. رای گشتی توانای لێك جیاکردنەوەی سۆسیالیستە دیموکرات و کۆمۆنیستەکانی نییە. لەوەها بارودۆخێکدا، سەرچاوەی دەوڵەمەندتر، پرۆپاگەندەی بەردەوام و پڕ جموجووڵتر و دیسپلینی پاوانخوازانەی کۆمۆنیستەکان لە هەڵبژاردندا لەوانەیە بە جەماوەری زۆر، بەرنامەی رادیۆیی و پرۆپاگەندەی بەهێزی خۆیان پشتی ناکۆمۆنیستەکان بگرن. ناکۆمۆنیستەکان بۆ ئەو خزمەتانە، باجێکی قورس دەدەن. هانری. ئا. والاس لە وتارە بەناوبانگەکەی لە پارکی *مەدیسۆن ئەسکوایری* نیویۆرك لە ١٢ی سپتەمبەری ١٩٤٦ سووکە رەخنەیەکی لە سیاسەتی رووسیا گرت. هۆڵەکە پڕ لە کۆمۆنیست بوو. ئەوان لە وەڵامدا هوڕایان لێکرد. ئەو لە درێژەی وتەکانیدا، بەشە رەخنەییەکانی وتارەکەی لە بارەی رووسیا دەرهاویشت.

هەندێ وتاربێژ کە ئالوودەی هاوکاریکردنی کۆمۆنیزمن، چەندین و چەند جار هێرش دەکەنە سەر سیاسەتەکانی ئەمریکا و ئینگلیز لە یۆنان و بۆنموونە رەفتاری ئینگلیز لە فەلەستین، بەڵام چاو لە دڵڕەقییەکانی رووسیا و کۆمۆنیستان دەنووقێنن کە بەردەوام بە دژی مرۆڤەکان و بەدژی دیموکراسی ئەنجامی دەدەن. **لێرە دایە مرۆڤ تێدەگا بۆچی گاندی پێ لەسەر گرنگیی ئامراز و کەرستەکانی دادەگرێ. ئەم کارە بەشێك لە شەیدایی ئەوە بۆ هەقیقەت. لە هەڵبژاردنی ئامرازدا، هێندە بەسە کە**

(٣٧) لیبرال لێرە دا بەمانای ئازادیخواز(Libertaria) ە نەك حەتمەن لایەنگری ئابووریی سەرمایەداری.



**ویژدانی سەرکۆنەکەر لە بیر بکەی، ئەو کاتەیە کە لەوانەیە ببیتە مرۆڤێکی ناپاك.**(٣٨)

غەیرە کۆمۆنیستێك کە ئامادەیە هاوکاریی کۆمۆنیستان بکا، خۆی لەبەردەم بارودۆخێکی وەهادا دەبینێتەوە: وای دابنێن کۆمۆنیستەکان توانیبایان بە پشتیوانی و لایەنگریی غەیرە کۆمۆنیستە پاشکۆکان، دەوڵەتێکی نەتەوەیی پێکبێنن. ئەو هەڵە لە چەند وڵاتی ئەورووپیدا رەخساوە. ئەوەدەم وەزیرە کۆمۆنیستەکان بە بێ ئەوەی رێی دەربازبوونیان هەبێ، پێگەی خۆیان بۆ نفووز و بەدەستهێنانی پۆستێکی جێگیر لە سیستەمدا و هێرش کردنە سەر دامەزراوی دیموکراسی بەکار دەهێنا. ئەمە بە مانای ستەمکارییە و لە حاڵەتێکدا کە نەیارانی پاوانخوازی لە لایەکی دیکەوە، هێزەکانی خۆیان تەیار بکەن، بە مانای شەڕی ناوخۆیە! لە بنەڕەتدا دیموکراتەکانی هاودەستی کۆمۆنیستان، ئامادەی بەشداریکردن و دەست تێکەڵکردن لەگەڵ سیستەمێکی ستەمکاریشن.

لەگەڵ هەموو ئەمانەدا، کۆمۆنیستەکان بە شێوەیەکی جێگیر، بە کردەوەکانی مۆسکۆ دەڵدەڵێن. ئەوان بە پەیمانی سۆڤیەت - نازییان هەڵگوت. ئەو کاتە غەیرە کۆمۆنیستەکان چییان کرد؟ درێژەیان بە هاوبەندیی خۆیان دا یان تەنیا بۆ چەند مانگێك برادەرایەتییەکەیان تێکدا؟ پلانەکەی باروخ لەمەڕ قەدەغەکردنی بۆمبی ئەتۆم هەنگاوێکی گەورە بوو بەرەو سیستەمی نێودەوڵەتی و دەوڵەتی جیهانی. مۆسکۆ بە هۆکارە نەتەوەخوازییەکانی خۆی - کە تەنیا خۆی سەری لێدەردەچێ - پلانەکەی باروخی رەت کردەوە. کۆمۆنیستەکان گوتیان: راستە قوربان، دەستخۆش! حکوومەتی سۆڤیەت پەیوەندیی دۆستانەی لەگەڵ ستەمکاری ئەرژەنتین، خوان پیرۆن دامەزراند. لەسەر ئەو بنەمایە، کۆمۆنیستەکانی ئەرژەنتین دەستیان کرد بە پشتیوانیکردنی خوان پیرۆن. کار گەیشتۆتە جێگایەك کە رووسیا کردنە سەرمەشق،

(٣٨) رای گاندی، بە شێوەیەکی دەقیقتر، کەمێك دڵنەرمانەترە. ئەو کەسێکی واش مەحکووم ناکا بەڵکو بێزاریی بەرامبەر کردەوەکەی (ناپاك) دەردەبڕێ." بێزاریی لە تاوان نەك لە تاوانبار!".

رادیکاڵ و لیبراڵەکانی بۆ ئۆردووی کۆنەپەرستی پاڵ ناوە. کەواتە چۆنە سەرەڕای ئەو هەموو بەڵگانە، غەیرە کۆمۆنیستەکان دەست دەخەنە دەستی کۆمۆنیستان؟ ئەنجامدانی ئەو کارە بەو مانایەیە بەرژەوەندی لە سەرووی ئامانج و دەسەڵات لە سەرووی بڕواوەیە. ئەمەیە کلیلی کۆشکی پاوانخوازی. کەواتە، کاری هاوبەش لەگەڵ پاوانخوازان، پاوانخوازیی لە هەناوی نەیارانیدا پەرە پێدەدا و یارمەتیی پاوانخوازیی خۆیان دەدات.

لەحاڵەتی ئاساییدا، کۆمۆنیستێك؛ مەرج نییە تەنیا دۆستی رووسیا بێ. ئەو بڕوای بە ستەمکاریە، بڕوای بە تۆقاندن و تیرۆرە، بڕوای بە شێوازی پاوانخوازانەیە و بەکاری دێنێ. کۆمۆنیستی راستگۆ و خۆڕاگر دەبێ قەبووڵ بکا کە ویستوویەتی وڵاتەکەی لەلایەن رووسیاوە بەڕێوە بچێ (کۆمۆنیستانی پۆڵۆنیایی، رۆمانیایی، هەنگاریایی و ئەوانی تر، وەکو داردەستی دەسەڵاتدارێتیی رووسیا هەڵسوکەوت دەکەن و تابووری پێنجەمی سیاسەتی سۆڤیەتن) یان دەبێ قەبووڵ بکا کە بە نیاز بووە سیستەمێکی ستەمکاری لە چەشنی سیستەمی رووسیا و یەکگرتوو لەگەڵی لە وڵاتەکەیدا حاکم بێ. حیزبی کۆمۆنیستی ئەمریکا، کە حیزبێکی دوورەپەرێزی زۆر بچووکە و هەموو ئەو کەسانەی لەم ئاواتە ناسروشتییەدا هاوبەشی نین بەجێیانهێشتووە و لە وڵاتێکی وەك ویلایەتە یەکگرتووەکاندا - کە کۆمۆنیستەکان تێیدا لە رووی ژمارەوە ئێجگار کەمن - هێشتا بە شێوەی یاسایی خەریکی چالاکییە، رۆژ بە رۆژ زیاتر، بەڵگە و شایەتی نوێ، لە بێکەڵکی بیروباوەڕ و ئامانجەکانی دەخاتە روو.

بەڵام کۆمۆنیستەکان لە پەیوەندی لەگەڵ هاودەستە غەیرە کۆمۆنیستەکانیان دەتوانن جووڵانەوە کرێکاری و لیبراڵەکان تووشی ناکۆکی بکەن و بەم جۆرە دەستەراستە کۆنەپارێزەکان بەهێز بکەن. کۆمۆنیزم گەورەترین سەرمایەی کۆنەپەرستییە و بە پێچەوانەوەش. هەر چەندە کۆمۆنیستەکان بەهێزتر بن،



کۆنەپەرستەکانیش بەهێزترن و هەر چەندە کۆنەپەرستەکان بەهێزتر بن، کۆمۆنیستەکانیش بەو رادەیە بەهێزترن.

لەلایەکی دیکەوە، چەپە میانەڕۆکان، گورز لە هەر دووك لایەنی توندڕۆ دەوەشێنن. بۆ نموونە لە بەریتانیا، ساڵ و نیوێك دوای بە دەستەوە گرتنی دەسەڵات لە لایەن حیزبی کرێکاران، ئاماری ئەندامێتیی حیزبی کۆمۆنستی بەریتانیا، بە گوێرەی بەڵگەنامەکانی خۆیان، لە ٣٤ هەزار کەسەوە بۆ ٣٣ هەزار دابەزیوە. هەبوونی دەوڵەتێکی چەپ، بە پشتگیریی میانەڕۆکان و چینی کرێکار، کۆمۆنیستەکان دەکاتە کەمینەیەکی وا کە پشتگوێ بخرێن و کۆنەپارێزان وەها دەڕەنجێنێ کە سەرۆکەکەیان وێنستن چەرچیل لە کۆبوونەوە ساڵانەکانی هاوینی ١٩٤٦ی حیزب لە *بلاك پول* لە خوا دەپارێتەوە بە هانای حیزبەوە بچێ!

لە هیند، حیزبی کۆنگرە بە رێبەرایەتیی *گاندی* - *نەهرۆ*، کارێکی دوورودرێژ و گەرموگوڕی بۆ سەربەخۆیی هیند کردووە. حیزبی روو لە گەشەی (*سۆسیالیست*)یش، بە دوای چارەسەری کێشە کۆمەڵایەتییەکانەوەیە. لە ئاکامدا، کۆمۆنیستەکان ئیدی ناتوانن بانگەشەی ئەوە بکەن کە تاکە رزگارکەری وڵاتەکە یان چینی رەنجدەرانن. مەقبووڵیەتیان وردە وردە، لە جاران، کەمتر دەبێتەوە. هەر بەم جۆرە، هەڵبژاردنی ژاپۆن، لە ئاوریلی ١٩٤٧دا، دوای ئەوەی توندڕۆترین کۆنەپەرست و شەڕخوازەکان لادران، سەرکەوتنێکی گەورەی بۆ سۆسیالیستەکان بە دیاری هێنا و کۆمۆنیستەکانی تووشی وەها شکستێك کرد کە دەنگی دایەوە. هەر دوو لایەنی توندڕۆ، لە رێڕەوی رقی هاوبەشیان لە میانەڕۆکان و ویستی هاوبەشیان بۆ رزگاربوون لە دەستیان، چەکی هاوشێوە و بە شێوەیەکی یەکسان بەکار دێنن. کۆنەپەرستان دەڵێن:

"میانەڕۆیەك لە ئارادا نییە، هەموو سۆسیال دیموکراتێکی رێکخراو، کە بۆ یەکێتییەکانی کرێکاری و *نیو دیلە* شەڕ دەکا، کۆمۆنیستێکە." هەوڵ دەدەن ترس و تۆقان دروست بکەن: "لە ژێر هەر بەتانییەکدا سوورێك خەوتووە." بازاڕی توندڕۆکان

لە کەشوهەوایەکی سیخناخ لە ترس، ئاژاوە، راوەدوونان و ئازاردانی نەیاراندا گەرم دەبێ.

کۆمۆنیسەکانیش هەروەتر. ئەوانیش هێرش دەکەنە سەر کۆنەپەرستەکان، بەڵام زۆرترین رقی سەرچاوە گرتوو لە ئێرەییان، بۆ لیبراڵ و سۆسیالیستەکان پاشەکەوت دەکرێ کە لەگەڵ ئەماندا جیاوازن. دیموکراتێ کە رەخنە لە کۆمۆنیستان و رووسیا دەگرێ - بەم هۆیە کە دیموکراتە - لە ئەدەبیاتی کۆمۆنیستاندا، بە کۆنەپەرست یان فاشیست ناودەبرێ، یان لەوەش خراپتر بە **ترۆتسکیست!** ئەم جنێوە، بە هۆی دووپاتکردنەوە و بە هیممەتی هورا کردن و قەشمەری پێکردنەوە، بووە بە پیسترین وشە لە زنجیرە وشە ستالینستەکان کە هەر لە بنیاتڕا زانیارییەکی دروستیان لە پێشینە و نووسینەکانی لیۆن ترۆتسکی نییە.

ئازادبیرانی کەم جورئەت، لە جنێوفرۆشیی کۆنەپەرستان دەترسێن، پاشەکشە دەکەن، نەوی دەکێشن و هێرشەکانی خۆیان بۆ سەر بەدفەڕییەکانی سەرمایەداران کەم دەکەنەوە. کەسایەتیی لەرزۆکی ناو ئازادبیران، لە ژێر سێبەری ئەم ترس و تیرۆرە فیکرییەی کۆمۆنیستیدا تووشی لاوازی دەبن و ئەمە راست ئەو شتەیە کە توندڕۆکان دەیانەوێ.

ئازادبیر، سۆسیالیست، پێشکەوتنخواز[٣٩] و رادیکاڵەکان و هەموو ئەو خەڵکانەی کە بۆ دنیایەکی دیموکراتی تێدەکۆشن، هەرگیز نابێ رێگە بە خۆیان بدەن کە توندڕۆکان کپیان بکەن یان ترس و تۆقاندنیان بخەنە ناو. هەر بەو جۆرە،

(٣٩) ئەم پێشکەوتنە لە پێناسەی سۆڤیەت بۆ بەرەی پێشکەتن و کۆنەپەرستی جیایە. لە سەردەمی دوای جەنگی دووەمی جیهانی تێوردارێژە دووپاتوێژەکانی سیاسەتەکانی مەکتەبی سیاسی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەت، دوو دنیایان پێناسە دەکرد: یەکەم بەرەی پێشکەوتن: هەر کەس بە تەوای ببایە وابەستەی سۆڤیەت و ئابووری و سیاسەتەکەی یان کاڵای لێ کڕیبا، یان پەیڕەوی لێکردبا سەر بەو دنیایە بوو، دووەمیش: ئەوی دژی سۆڤیەت بوو یان رەخنەیەکی بچووك یا گەورەی لێدەگرت سەر بە دنیای دژە پێشکەوتن و بەرەی کۆنەپەرستی و سزاواری پیسترین جنێو بوو! وەك: پیاوی سیا، سەگی زنجیر لەملی سەرمایەداری و ئیمپریالیزم، بۆرژوا، وردە بۆرژوا و.. تاد.



لایەنگرانی دیموکراسی نابێ تەسلیمی داوای لایەنێکی توندڕۆ بۆ بەگژداچوونەوەی لایەنەکەی تر بن. خەبات بۆ دیموکراسی شەڕێکە لە دوو بەرەدا، بە دژی کۆنەپەرستانی راست و بە دژی کۆمۆنیستان. یەکگرتن لە گەڵ دژە دیموکراتەکان ناتوانێ یارمەتیی دیموکراسی بدا.

لایەنگرانی دیموکراسی نابێ لە نێوان کۆنەپەرستی و کۆمۆنیزمدا سەرپشك بن. هەروەك نابێ هەڵبژاردنی خۆیان لە نێوان فاشیزم و کۆمۆنیزمدا کورت بکەنەوە. ئەم هەڵبژاردنە تەندروست نییە. هەڵبژاردنی راستەقینە لە نێوان دیموکراسی و ستەمکاریدایە. واتە کامڵبوونێکی بێ سەبرانە و بێ پسانەوە کە بە هاتنە دی یەك لەم دوالیزمانەی خوارەوە کۆتایی دێ:

- **ئازادی یان شۆڕشی پڕ خەسارەت"**
- **ئەخلاق گەرایی گاندی ئاسا یان پاوان و قۆرخکردنی دەسەڵاتی سەرۆکی فەرماندەی گشتی ستالین"**
- **مافی بێ ئەملاو ئەولای ئازادیی تاك یان دەرفەتی چپەدوویەکی جاروبارە لە ژێر نیگای سیلەی چاوی پۆلیسی نهێنیدا"**
- **حکوومەتی پابەند و سنووردار بەو شتەی تاکەکان ناتوانن بە دەستی خۆیان و بۆخۆیانی بکەن (شەڕی پێویست) یان دەوڵەتێکی هەمەلایەنەی روو لە راوکردنی هاووڵاتییان، سیخوڕی و خۆتێهەڵقورتاندنی بەردەوام لە وردەکاری و بوارەکانی ژیانی رۆژانەی خەڵکدا"**
- **مرۆڤی بە کەرامەت یان مرۆڤی برغوو ئاسا لە ئامێری حکوومەت یا ئامێری دامەزراوە تایبەتە قۆرخکارەکان کە بە هەمان رادە دژە مرۆیین"**
- **مرۆڤ وەك بوونەوەرێکی بەشداریخوازی تەواو چالاك لە داڕشتن و دیاریکردنی هەلومەرجی کار و ژیانی خۆی یان مرۆڤێکی بێدەمار، کە فرۆشیاری کار و کاتی خۆیەتی"**.

بەڵێ لەمانە دەبێ سەرپشك بین!

ئازادبیرانی لایەنگری دیموکراسی و سۆسیال دیموکراتەکان بە کێشانی هێڵێکی تۆخ لە نێوان خۆیان و کۆمۆنیست و راستەکاندا (بەڵام لە کردەوەدا، فاشیست و کۆنەپەرستەکان، بە پێچەوانەی کۆمۆنیستەکان، زۆربەی کات خۆیان دەخزێننە ناو گرووپە چەپە میانەڕۆکانەوە)، بە روونی دەتوانن ئامانجە ئەخلاقی و بڕواییەکانی خۆیان دەربڕن و بەرەو ئەو ئامانجانە هەنگاو بنێن.



# بەشی نۆیەم

## دەنگوباسی تازە چییە؟

بەرگریکارانی **ئەوەی هەیە**، لە هەر جۆرە ئاڵوگۆڕێك کە لە سەرمایەداری دوور بکەوێتەوە دەترسن. ئەمانە قەبوولکردنی هەر تۆسقاڵێك لە سۆسیالیزم بە مانای مەرگی سەرمایەداری لێك دەدەنەوە. دەڵێن دوو رێگامان پتر لەبەر نین: یان سەرمایەداری یان سۆسیالیزم.

کۆمۆنیستەکانیش هەر بە هەمان دوو ربەی رەش و سپی دەپێون، ئاخر دەیانەوێ کەسانێ کە لە سەرمایەداری بێزارن، بخەنە داوی خۆیانەوە.

بەڵام لەراستیدا، هەڵبژاردن، نەبەسراوەتەوە بە سەرمایەداری و سۆسیالیزم. سەرمایەداریی پەتی هەر لە بنەڕەتدا بوونی نییە. لە هەموو وڵاتێکی دیموکراتدا، سۆسیالیزم شان بە شانی سەرمایەداری ئامادەیە.

سۆسیالیزم واتە بەشداریکردنی حکوومەت لە کاروباری ئابووریدا، بە لەبەرچاوگرتنی خۆشگوزەرانیی گشتی و لە ئاست بەرژەوەندیی تاکەکەسیدا. سۆسیالیزم، بەنداوی *گێرەند کولی‌ی* واشتنۆنە کە حکوومەتی ویلاتە یەکگرتووەکان دروستی کردووە و حکوومەت خۆشی رەنێوهێنەریەتی" سۆسیالیزم، رەنێوهێنانی حکوومەت یان ئەنجوومەنی شارە لە هێڵی کارەبا. زەینی پێگەیشتوو، لەم نێو و نرتکە و لەو ناتۆرە ناترسێ.

کۆمەڵگا کاتێ دەبینێ بەڕێوەبەرایەتی گشتی لە بوارێکی دیاردا لە بەڕێوەبەرایەتی تایبەت باشترە، ئاسایییە کە داوا لە حکوومەتی خۆی بکا بەڕێوەبردنی ئەم بوارە دیاریکراوە بگرێتە ئەستۆی خۆی. هەمیشە بەو ئیستدلالەوەیە کە حکوومەتەکان رۆڵی ئابووری نوێ بە دەستەوە دەگرن.

ولاّتانی دەرەوە کە لە ئاکامی شەڕی یەکەمی جیهانی پێویستیان بە یارمەتی بوو، پارەیان لە بانکە ئەمریکییەکانی وەك جەی. پی. مورگان، نەشنالٚ سیتی و هیتر وەرگرت. لە کاتی جەنگی دووەمی جیهانیدا، ولاّتانی دەرەوەی موحتاجی یارمەتی، بەرامبەر بە بەکرێدانی پێگەی سەربازی، ئەم یارمەتییانەیان وەرگرتن. لەکاتی جەنگی یەکەمی جیهانیدا، ئەو تەقەمەنیسازانەی ژمارەیان روو لە زیاد بوون بوو، قەرزیان لە بانکەکان وەرگرت. لە بەرامبەردا لە جەنگی دووەمی جیهانی، بەشی هەرە زۆری کردەی پەرەپێدانی پیشەسازی بۆ ئامانجی سەربازی، لەلایەن خودی حکوومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە ئەنجام درا.

ئەم جیاوازییە ئاراستەیەی نێوان جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانی لەبەر چی بوو؟ بەو هۆیە کە ئەرکی دابینکردنی پارە و چەك لە جەنگی دووەمدا، بۆ دامەزراوە تایبەتەکان وەها گەورە و قورس بوو کە لە توانای ئەواندا نەبوو.

هەر ئێستاش کاری ئاوەدانکردنەوەی ئەوروپا و بنیاتنانی ئاسیا هێندە گەورەو گرانە کە ئەمریکا لە کاری بەرەورووبوونەوەی ولاّتە میحوەرییەکان لە گەلّیان دەستەویەخە بووە. کۆمپانیا ئەمریکییەکان بە سەرمایە خەیالّییەکانیانەوە، بەرگەی خەرجییەکانی شەڕخوازی ناگرن. جا ئەورووپای هەژارکەوتوو و ئاسیای گەشە نەکردوو، چۆن دەتوانن گرفتی گەورە بەبێ بەشداریکردنی حکوومی، یان هەمان سۆسیالیزم، چارەسەر بکەن؟

هەر بۆمب و هاوەنێك کە لە کاتی جەنگدا تەقییەوە، سەرمایەی تایبەتیی لە ناو برد. کارکردن بۆ جەنگ، ئامراز و کارگاکانی ئیستهلاك کردن. گرانیی ئاکامی شەڕ، پاشەکەوتی سەرمایەی گەسك دا. دەلّێن سەرمایەداری شەڕ هەلّدایسێنێ. رەنگە وابێ، بەلاّم جەنگی دووەمی جیهانی سەرمایەداری هەلّینەگیرساند.

گرنگیی نەمانی بڕوا بە سەرمایەداران و سەرمایەداری، لە گرنگی کەمبوونەوەی سەرچاوە و سامانی ئەوروپا و ئاسیا کەمتر نییە. سەرمایەدارانی گەورە لە فەڕەنسا، ئیتالّیا، ئەلّمانیا و ژاپۆن دەستیان لە ناو دەستی نازی و فاشیستاندا بوو. بۆیە



گەلێکیان لە لایەن هێزە بێگانە داگیرکەرەکانەوە یان خودی خەلّکەوە لە ناوبران. ئەوان تازە لە کۆمەلّگادا ناتوانن بگەڕێنەوە پێگەی پێشووی خۆیان.

مرۆڤ ناتوانێ دووجەنگی جیهانی، ئاژاوەی ئابووری، بێکاریی جەماوەری و نائارامیی سیاسی سەردەمی نێوان دوو شەڕ، بە دەم تێپەڕینی تەمەنی نەسلێك تەی بکا، بێ ئەوەی گوێ بداتە ئەو گومانانەی کە بەرەو رووی بڕوا بنەڕەتییەکانی بنیاتنەری کۆمەلّگای مودێرن بوونەتەوە. ئەمە وردە کاسبکار، بازرگانی وردەفرۆش، مامۆستا، مافناس، پزیشك، پزیشکی ددان، کارمەندی حکوومەت و جووتیاری قەرەیە کە لەو سالاّنەی دواییدا تووشی قوولّترین قەیرانی باوەڕ بۆتەوە. گرانی، مووچە و پاشەکەوتەکانیان چرووك دەکا. مرۆڤە وردەکان لە لایەن فرۆشگا زەبەلاحە زنجیرەییەکانەوە دەپلّیشێنەوە و لەناو دەچن. چینی ناونجیی بێ ئاسایش، لە هاوپەیمانی تازە دەگەڕێ، چونکە بوونی چینی ناونجی بەڕاستی کەوتۆتە بەر مەترسی لە ناو چوونەوە. لەراستیدا ئەم چینە، لە روانگەی سیاسییەوە وەك دوورگەیەکی سەرئاو کەوتوو وایە.

لە کۆمەلّگەی پیشەسازیی مۆدێرندا، چینی ناونجی هێندە گەورەیە کە دەتوانێ دیاری بکا کۆمەلّگا دەبێ کام رێگا بگرێتە بەر. سەرەتا ئەمە چینی ناونجیی ئەلّمانیا بوو کە خۆی بە دەست هیتلەرەوە دا و دوای ئەوە هەموو ئەلّمانیا نازیزمی قەبوولّ کرد. لە ئینگلیز، چینی ناونجی لایەنگری لە حیزبی کرێکار کردووە. دەنگی چینی کرێکار بە تەنیایی نەیدەتوانی لە پەرلەمان زۆرینەی تەواو بە حیزبی کرێکار ببەخشێ. چینی ناونجی ئەم بۆشاییەی پڕ کردەوە. چینی کرێکار بڕوای بە چینی دەسەلاّتداری پێشووی بەریتانیا لە دەستدابوو، هەمان چینی دەسەلاّتدار کە خۆشی بەر لەوە کەمێك بڕوای بە خۆی لە دەست دابوو. چینی کرێکار و چینی ناونجی، هەستیان بە دابەزینی ئاستی پیشەسازیی بەریتانیا لە سەردەمی پێش جەنگ کردبوو. سەرمایەیەکی بەرچاو لە بەریتانیاوە دەچووە دەرێ و ئەودیوی دەریاکان و لە جیاتی ئەوەی لە ناوخۆدا بمێنێتەوە و کۆمپانیا لاواز و لە کارکەوتووەکانی پێ

بخرێتەوە کار و خانووبەرەی زیاتری لە وڵاتدا پێ دروست بکرێ، لە وڵاتانی دیکەدا خەرج دەکرا.

پیشەسازی بەردەخەڵوز لە دەستی کەرتی تایبەتدا تووشی ئیفلاس هاتبوو. میکانیزاسیۆنی ئەم پیشەسازییە کەم، داهات و سەرچاوەکانی کەم و بەڕێوەبردنەکەشی جێگەی داخ بوو. هۆی ئەوەی بەردەخەڵوز یەکەم پیشەسازی بوو نەتەوەیی کرا هەر ئەم خاڵانە بوون. لەو جێگایەدا کە کەرتی تایبەت سەرکەوتنی بە دەست نەهێنابێ، ئەگەری زۆرە، حکوومەت خۆی کارەکە بگرێتە دەست.

رای گشتی بەریتانیا، جگە لەو کێشانەی سەرەوە، دەیدی کە سیاسەتی دەرەوەش شکستی هێناوە. دەکرا بە کردارێکی بەوەخت پێش لە بەرپابوونی جەنگی دووەمی جیهانی بگیرێ، بەڵام ئەو کارە نەکرا. خەڵکی بەریتانیا - چونکە لە رووی سیاسییەوە پێگەیشتوو بوون - دەیانزانی ئیمپراتۆری دەبێ خۆی هەڵبوەشێنێتەوە ئەگینا خۆی، لە ئەنجامی کردەوەکانیدا هەڵدەوشێتەوە. بەڵام چەرچیل کە سەر بە رابردوو و بە سەدەی نۆزدەم سەرسام بوو، رایگەیاند ئەم کارە ناکات.

کۆنەپارێزان سەر بە رابردوون. بەڵام بەریتانیا چاوی برییە داهاتوو و حکوومەتی کرێکاری. رێگە بەو حکوومەتە درا وڵاتێکی نوێ کە لە حاڵی گۆڕاندایە بنیات بنێ. لە ئەورووپای قاڕەییدا، داوا لە کەسانی تێکشکاو دەکرێ دنیایەکی خاپوور دروست بکەنەوە. ئەوان کەمچەیان بە دەستەوەیە، گاجووت لێدەخورن، ئامێری تراش وەکار دێخن و قەڵەم بە دەستێك دەگوشن کە لە بەر ماندوویەتیی زۆر، کەم خۆراکی و لە هەموی ناخۆشتر، وەبیر هاتنەوەی بۆمبی لە حاڵی تەقینەوەدا، تەرمی لە سەر زەوی کەوتوو و ژانی لە ناوچوو، دەلەرزێ. ئەم مرۆڤانە مردوون. ئەوان مردن و دووبارە زیندوو بوونەوە، ئەو مرۆڤانە کە نازانن ئەمە گشتی چۆن روویدا و، بە چاوێکی مات و سارد و سڕ و حەپەساو تەماشای ژیان دەکەن. ئەو مرۆڤانەی هەزار جار مردوون، دەبێ وجوودی خۆیان لە سەر ١٢٠٠ کالۆری بنیات بنێنەوە، بەبێ تۆسقاڵێك هیوا.



داهێنانێکی نوێ دەتوانێ رۆحی ئەمانە زیندوو بکاتەوە. نەریتە کۆنەکان گۆڕستانیانە، ئەمان لەوێ ژێر خاك نریان.

ئەورووپایەك کە دایکی ئەمریکایە، ئەورووپایەك کە شوێنی پێگەیشتنی ئەو ئایینانەیە کە لە ئاسیا گووراون، بە شێوەیەکی جەرگبڕ هەلا هەلا بووە. تا ئەو کاتەی کە ئەورووپا لەو کارەساتە نەخەلەساوە، شارستانییەت وەك کەمئەندامێکە کە دەست و پێیەکی سەقەت بێ، وەك کەسێك وایە بینایی لێڵ بێت. دەبێ هەموو سەرچاوەکانی زانست، گەشە، سامان، میهرەبانی، خۆشەویستی و ئازادی بخرێنە گەڕ تا جارێکی دیکە تەواوی ئەورووپا زیندوو بکەنەوە.

ئاسیا، دێوی کیسەڵئاسا، دێوی نوستوو، بوونەوەرێکی زەبەلاح کە هێشتا مێشکێکی هاوسەنگ لەگەڵ جەستەی لە خۆیدا پەروەردە نەکردووە- ئاسیای پڕ حەشیمەتتر لە سەرجەم قاڕەکانی دی، پێویستی بە زانستە تا نەخۆشییە جەستەییەکانی چارەسەر بکا، گەرما سووتێنەرەکەی دابەزێنێ، بیابانەکانی ئاودێری بکا، مەوداکانی کەم بکاتەوە، پەردە لەسەر خەزێنەکانی هەڵداتەوە، رووتیی خۆی داپۆشێ و برینج و گەنم و شیر بەرهەم بێنێ بۆ ئەوەی ملیۆنان کەس هەموو ساڵێ تا سەر لێواری مردن برسێتی نەچێژن. ئەفریقا و ئەمریکای لاتین - یش هەر بەم شێوەیە چاوەڕوانی دەستێکی مۆجیزەکارن.

کێشەکە، لە هەڵبژاردنی ئەم یان ئەو سیستەم گرنگترە.

ئامانجی هەوڵدانی مرۆڤ پاراستنی سەرمایەداری یان سۆسیالیزم یان کۆمۆنیزم نییە. ئامانجی مرۆڤ دەبێ شادومانی و چێژوەرگرتنی زیاتری مرۆڤ بێ، ئەم ئامانجە ئەگەر بە شێوازێکی غەیری سەرمایەدارییە پەتی وەدی بێ، کەسێك کە مرۆڤی خۆش دەوێ نەك ئەم یان ئەو سیستەم یان ئیزم یان کەسایەتی یا ئایدیۆلۆژیا، کەی دەتوانێ دژایەتیی شێوازەکە بکا؟ سەرمایەداری لە هەندێك بواردا سەرکەتوو بووە، بەڵام لە هەندێ جێگاشدا شکستی هێناوە. لە ژێر ئاڵای ئەودا، قاڕەکان رەقن و بەیار ماونەتەوە، گەلان لە خوێنی خۆیان گەوزیون و خەڵکی تر پەلاماریان داون، تەنانەت

دەوڵەمەندترین وڵاتان ئازاریان بە دەست چوونە سەری نرخان، دابەزینی بەهای دراو، بێکاری و نائارامی چێشتووە.

هەندێ کەس وەك مەزهەبێکی بونیادگەرایانە و ئایینێکی پاك تەماشای سەرمایەداری دەکەن، بەڵام لە راستیدا، سەرمایەداری شتێکی تێدا نییە کە پیرۆز و لە گۆڕاننەهاتوو بێ.

ئامانج مرۆڤە نەك سیستەم. ئامانج ئازادییە نەك ئابووریی بازاڕی"ئازاد". ئابوورییەك کە هەر لە بنەڕەتدا ئازادیش نییە.

دنیای کۆن (ئەوروپا، ئاسیا و ئەفریقا) بڕوای بە سیستەمی رابردوو نەماوە. ئەوروپا و ئاسیا، لە تاریکیدا و بە **دەستەکوتە** لە شتێکی نوێ دەگەڕێن کە بتوانن متمانەی پێ بکەن، شتێك کە بڕوا بەخۆبوونیان بۆ بگێڕێتەوە.

نەتەوە لێقەوماوەکان شتیان دەوێ، دڕدۆنگن و وەشك دەکەون. ئەم رۆحیەتە دەتوانێ ستەمکار پەروەردە بکا. بەڵام لە هەموو شتێك زیاتر، ئەم رۆحیەتە ئەزموونکردن و گۆڕانی لێدەکەوێتەوە. ئەوان بۆ ئەم کارە تەنیا دەبێ نەهامەتی و بیرەوەرییە تاڵەکانیان لە بیر بکەن. کۆنەپارێزانی بە چاو و راو، تووشی مرۆڤێکی حەپەساو دەبن، کە دەپرسێ:

چی؟؟!! دەڵێی ئەو رابردووە بپارێزین!؟"

ئێوە چەندە کۆنەپارێزن، زۆر جار پەیوەندیی بەوەوە هەیە کە رابردوو چەند بە لاتانەوە خۆش بووە یا لە بەدبەختترین مرۆڤان چەند دوورن یا لە ئاسۆی روانینتاندا داهاتوویەکی روونکتر بۆ مرۆڤایەتی دەبینن یان نا.

کۆنەپارێزانی رەشبینی هەموو سەردەمەکان لەوە دڵنیان کە هیچ شتێك ناتوانێ لە ئێستا باشتر بێ مەگەر رابردوو. چاکسازیخوازەکان گەشبینن. ئەوان وا هەست دەکەن دەتوانن لە رابردوو باشتر رەفتار بکەن.



سێ فەلسەفەی کۆمەڵایەتیی ناکۆك و زاڵ بەسەر بیرکردنەوەی سەدەی بیستەمدا بریتین لە: کۆنەپارێزی - واتە سەرمایەداریی دەست لێنەدراوی ساڵی ١٨٨٠ یا ١٩٠٧، سەرمایەداری چاککراو و کاریگەر بە سۆسیالیزم و لەکۆتاییدا، کۆمۆنیزم.

زۆربەی ئەوانەی مەرایی لەبەر سەرمایەداریی پەتی دەکەن و بە روویدا پێدەکەنن،

ئەو کەسانەن کە بۆ کار و کاسبیی تایبەتیی خۆیان لە یارمەتیی حکوومەت سوودمەند بوونە. هەندێ لە قارەمانە ئازا و شێلگیرەکانی سەرمایەداریی پەتی، هۆکارێك بوون بۆ هاتنی حکوومەت بۆ نێو کاروباری ئابوورییەوە. هەموو لایەنگرێکی ئابووریی ئازاد، پشتگیریی رەسمی لە لایەن حکوومەتەوە دەقۆزێتەوە.

ئێستا ئیدی کێشەکە ئەوە نییە کە ئاخۆ حکوومەت دەبێ لە چالاکییە ئابوورییەکاندا دەوری ببێ یان نا، حکوومەت لەمێژە هاتۆتە نێو کاروباری ئابوورییەوە. کێشەکە ئێستا ئەوەیە کە حکوومەت تا چ رادەیەك دەبێ دەست بخاتە نێو ئەم کاروبارانەوە.

گەلێ لە وڵاتە دیموکراتییەکان، بە دەست ئاستی بەشداریکرانی حکوومەت لە کاروباری ئابوورییەوە دەناڵێنن. دۆزینەوەی رێگەچارەیەکی ژیرانە و بەوەخت بۆ ئەو کێشەیە، زامنی مانەوە و گەشەکردنی دیموکراسییە. چونکە ئاستی چالاکیی ئابووریی رەسمی حکوومی، دیاری دەکا کە حکوومەت تا چ رادەیەك دەسەڵاتی دەبێ. چەقی کێشەی ئازادی ئائەمەیە.

هەندێك کەس کە بە گۆڕانکاریی کەم رازی بوونە، حکوومەت لە رۆڵی داڕێژەر، دادوەر، بابە نوئێل، یان سەرچاوە و خاوەنی دارایی پڕۆژە بنەڕەتیە گشتییەکانی وەك جادە و پرد دا دەبینن. هەندێکی دی لەوە زیاتر پێی لێ هەڵدەبڕن و پێشنیار دەکەن حکوومەت خاوەندارێتی و بەرهەمهێنانی پیشەسازی بە دەستەوە بگرێ. کام پیشەسازی و تا چ رادەیەك؟ ئەمە خۆی جێگەی باس و گفتوگۆیەکی نوێیە. بە نەتەوەیی کردنی خزمەتگوزارییە گشتییەکان، هێڵی ئاسن، کانگەی بەردەخەڵووز، پیشەسازیی گەورەی وەك پۆڵا، هەر کام لایەنگری خۆیان هەن.

تیۆردارێژان بە گەمەکردن بە وشە ناتوانن ڕێگەچارەیەك بۆ ئەو کێشانە بدۆزنەوە، بەڵکو ئەوە پەیوەندیی هێزە سیاسی و ئابوورییەکانی هەر وڵاتێکە کە لەم بوارەدا کێشەکان ساغ دەکاتەوە. لە روانگەیەکی گشتیدا، لانیکەم لە پاشماوەی سیستەمە دیموکراتیەکاندا، ئەم بڕیارە، ڕەنگدانەوەی بیروڕای گشتی لەبارەی سەرکەوتن یا شکستی **رابردووی** سەرمایەداری دەبێ.

تەنانەت لە ئەمریکای دەوڵەمەندا، سیناتۆری کۆماریخواز، *رابێرت، ئەی. تفت* کە کەم وا هەیە بە سۆسیالیست دابنرێ، لە ١٨ی مارسی **١٩٤٧**دا رایگەیاند کە : "ئابووریی تایبەت خانووبەرەی پێویستی بۆ کەمدەرامەتترین توێژەکانی کۆمەڵگا دابین نەکردووە." لێکۆڵینەوەی ڕێکخراوی نەتەوەیی نیشتەجێکردن لە ساڵی **١٩٤٥**دا ئەم قسەیەی پشتڕاست کردەوە و گوتی: پتر لە ١٦ لە سەدی خانووەکانی کەرتی تایبەت لە شارەکانی ویلاتە یەکگرتووەکاندا، بێ ئاون، زیاتر لە دوو لەسەر سێیان حەمامیان نییە، نزیکەی دوو لە سەر سێیان بێ ئاودەستخانەی ناوەوەن و دوو لەسەر سێشیان سیستەمی گەرمکردنیان کەموکووڕی تێدایە یان ترسناکە.

سەرمایەی تایبەتی، بۆ سوود و قازانجی خۆی خانوو دروست دەکا و لەو جێگایانەی بزانێ قازانجی کەم دەست دەکەوێ - خانووی توێژە کەمدەرامەتەکان وان - ئامادە نییە سەرمایەگوزاری لەو بەشەدا بکا. لە ئەنجامدا سەلامەتی و شادی و دڵخۆشیی خەڵك لەو نێوەدا زیانی پێدەکەوێ.

بۆیە سیناتۆر *تفت* جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە دابینکردنی ئەنوای هەرزان، بەرپرسیارێتی سەرەکیی حکوومەتە.

لەکاتێکدا حکوومەت خەریکی دابینکردنی دارایی بۆ بواری بیناسازی دەبێ، لەوانەیە بایەخدان بە خانوو دروستکردن بۆ هەژاران - کە لە هەموو کەس زیاتر پێویستییان بە سەرپەنا هەیە- دیسانەوە بە دڵی کەرتی تایبەت نەبێ و ڕەنگە هەر بەو پێیە، حکوومەت خۆی ناچار بێ خانوویان بۆ دروست بکا. جا ئەم بڕیارە، واتە سۆسیالیزم.



گرنگیدانی زیاتر بە هەژاران، تا رادەیەکی زۆر بە مانای زیادکردنی پشکی حکوومەتە لە چالاکییە ئابوورییەکاندا. بەڵام لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا، بە شێوەیەکی گشتی فشار بۆ لابردنی سیستەمی سەرمایەداری یان پێکهێنانی ئاڵوگۆڕی بنەڕەتی تێیدا، لاوازە" چونکە سیستەمەکە زۆر بەهێزە و لە حاڵی حازردا بە قازانجی خەڵکێکی زۆریش کار دەکا، لاوازبوونی باری ئابووری ئەم گوشارە بەهێزتر دەکا. هەردەم، کاتێ کە توێژە جۆراوجۆرەکان هەست دەکەن دەبنە قوربانیی نادادپەروەریی ئابووری یان نەتەوەیی یان بێعەداڵەتییەکانی تر، ئەم فشارە دەگاتە بەرزترین **ئاستی** خۆی. بەڵام هەندێ جار ئەو کێشەیە دەبێتە بابەتێکی شەخسی.

خاتوو *کلرلیوس* دەڵێ بەر لەوەی بچێتە ناو کەنیسەی کاتۆلیکەوە، دەروونشیکاری و دوای ئەوە کۆمۆنیزمی تاقی کردوونەوە و دەنووسێ: "پێم وایە سەرنجڕاکێشیی کۆمۆنیزم لەوەیەدا پێکهاتەیەکە تەواو مەزهەبی و دەسەڵاتخواز." هەر بەم جۆرە *هێی وود برۆن*، سەرەتا کۆمۆنیست بوونی تاقی کردەوە و پاشان هاتە سەر مەزهەبی کاتۆلیك. *لوویی بودنز*، کەنیسەی کاتۆلیکی جێ هێشت و بوو بە بەرپرسی زمانەوانیی بڵاوکراوەی کۆمۆنیستیی *دەیلی وۆرکێر*. بەڵام جارێکی دیکە گەڕاوەتەوە کەنیسەکەی پێشووی. کەسانی دیکەی لەو بابەتەش، دەقە پیرۆزەکانی ستالینیان لە تەنیشت ئەستێرکە تایبەتییەکانی *هالیوود*دا خوێندۆتەوە یان پلانی شۆڕش - یان لە زەویوزارە بەرفراوونەکانی خۆیاندا لە *کانکتیکات* داڕشتووە. ئەمانە دەیانەوێ کەفارەتی سامانێك بدەن کە هیچ چێژێکیان پێنابەخشێ جگە لە دڵەڕاوکەی پاراستنی. هەر بۆیە، بە شێوەیەکی ساختە دەچنە ریزی پرۆلیتاریای هەژار، بەڵام لە هەمان کاتدا دڵنیان کە ئەم کارە ئاسان و بێ مەترسی و کەم خەرجە. ئەو شێوازەی کە بۆ دروستکردنی بەهەشت لە دەرەوی رووسیادا پێیەوە خەریکن، - رووسیایەکی کە نایناسن - شێوازێکی نائاساییە.

هانە دەروونی، فەلسەفی یا سۆزداری یان هاوڕەچەڵەکی (واتە ئەم راستییە کە ئەوان کۆیلەگەلێکن کە بۆ **دایکە نیشتمانی رووسیا** کار دەکەن) هەندێ کەس بەرەو

کۆمۆنیزمی پاوانخواز پاڵ پێوە دەنێ. هەست یان بڕوایەکی پتەوی ئەخلاقیی زۆر پێگەیشتوو کە ریشەی لە زانستی مێژوو، زانستی سروشتی و کۆمەڵگادا بێ و قەبووڵ بکا کە سەرمایەداری بیچمی کۆتایی دامەزراوە مرۆییەکان نییە، دەتوانێ کەسانێکی دی بەرەو سۆسیالیزمی دیموکرات رابکێشێ. بەڵام کاتێ ئەمریکا بەڵێن دەدا و خۆشبژیوی دەبەخشێ، هیچ کام لەو دوو قوتابخانەیە، پشتگیرییەکی بەربڵاو بەدەست ناهێنن.

لەنێو میللەتانی دەستکورتدا، زۆرەملی و گوشاری دژی سەرمایەداری توند و جددیترە. گەلانی دیموکراتی ئەورووپا و ئاسیا و هەندێکی ئەمریکای لاتینیش، جگە لە چەند دانەیەکی کەمیان، بە خێرایی بەرەو بەشداریکردنی حکوومەت لە ئابووریدا هەنگاو دەنێن. سوێد، بەریتانیا، فەرەنسا، ئیتاڵیا، ئوستراڵیا، زلاندینۆ، نەمسا و ئەڵمانیای رۆژئاوا پیشەسازییە گەورەکانیان نەتەوەیی کردوون. لەو جێگایانەش کە حکوومەتەکان پیشەسازییەکانیان نەگرتوونە دەست، خەریکی خۆ ئامادەکردن بۆ ئەم کارە یان دانانی چاودێریی توندوتۆڵ لە سەریانن، دەنا ئابووری و کار و پیشەی تایبەتیان خستوونە ژێر چاودێریی حکوومەتەوە. سەرمایەداری تایبەتی، کە دوای شەڕ، بووە بە نەمامێکی لاواز، رۆژ بە رۆژ زیاتر پاڵ وە کۆتەرەی ئەستووری حکوومەت دەدا. حکوومەتەکانیش، کە وتەبێژ و رەنگدەرەوەی بێ متمانەیی خەڵك بەرامبەر بە سەرمایەن، چاودێرییەکی وردتر و نزیکتر و کۆنترۆڵێکی توندوتۆڵتر دەکرێن.

سەرمایەداری خەریکە لە وڵاتانی دیموکراتیدا پشتیوانەکانی لە دەست دەدات. حیزبی کۆنە پارێزی بەریتانیا لە ١١ی مەی ١٩٤٧ رایگەیاند کە ئەگەر جارێکی دیکە بگەڕێتەوە دەسەڵات، خاوەندارێتی بانکی بەریتانیا، کانگەی بەردەخەڵووز، یان هێڵەکانی رێگەی ئاسن ناداتەوە دەست کەرتی تایبەت. لە فەرەنسا، حیزبی کۆمۆنیست و سۆسیالیست، دژی سەرمایەدارین و حیزبی کاتۆلیکیش باڵێکی دژە سەرمایەداریی بەهێزی هەیە. ئەم سێ حیزبە، گەورەترین حیزبی وڵاتن. تەنانەت



ژەنەراڵ *دۆگول* کە راستێکی توندڕۆیە، لە ٢٤ی ئاوریلی ١٩٤٧دا بەراشکاوی رایگەیاند کە لایەنگری نەتەوەییکردنی پیشەسازی بەردەخەڵووز، کارەبا و بیمەیە. لە ئیتاڵیاش، دۆخەکە هەر بەو شێوەیە. یەکێتی سۆسیال مەسیحییەکانی ئەڵمانیا کە لە کاتۆلێك و پرۆتستان پێکهاتووە، لایەنگری نەتەوەییکردنی هەندێ لە پیشەشازییەکانە. تەنیا حیزبێکی ئەڵمانی لایەنگری سەرمایەداریی پەتییە. حکوومەتی نەتەوەخوازانی چین سەندیکای زەبەلاحی بەرهەم هێنەرانی رستن و چنین دادەمەزرێنێ کە لەگەڵ بەرهەمهێنەرە تایبەتەکان ململانێ بکا. حیزبی سۆسیالیتی ژاپۆن دەنگی بەشێکی زۆری دەنگدەرانی بۆلای خۆی راکێشا. *ئەی.کی.گانی* وەزیری ئابووریی کۆماری نوێی ئەندەنووسیا- بە ٥٥ ملیۆن کەس حەشیمەتەوە- بەرنامەیەکی دە ساڵەی بۆ بە **نیوە سۆسیالیست**کردنی جاوە و سوماترا راگەیاندووە. دەوڵەتی ناوەندیی هیند، بڕیاری داوە بانکی ناوەندی بکاتە نەتەوەیی و خەریکی دروستکردنی دە هەزار خانووە بۆ کانگاچییەکانی بەنگاڵ و بیهار. سۆسیالیستەکانی هیند - چونکە حیزبێکی تەواو سێکۆلارن - دەتوانن بە باشترین شێوە لەگەڵ هیندوو و مسوڵمانەکان ململانێ بکەن. گاندی گوتوویە، تەقریبەن نەك بە تەواوی، بە قەد ئەوەی پێشکەوتووترین سۆسیالیست و تەنانەت کۆمۆنیستەکانیش دەیانەوێ، حەزی لێیە سەرمایەداری کۆتایی پێ بێ، هەر چەند بە شێوازێك کە خۆی بڕوای پێیەتی. بە جەماوەرترین گرووپی جوولەکە لە فەلەستین حیزبی کرێکاری جوولەکەیە. لە سەرانسەری ئەورووپا لەمێژەوە رێکخراوی سۆسیالیستی تارادەیەك گەورە هەبوون کە گرنگترینیان حیزبی کرێکاری ئینگلیزە. ئەم حیزبە تا ئێستا، هەنگاوی گەورەی بەرەو سۆسیالیزم ناون.

سەرمایەداری خەریکە پشتیوانی گشتی لە دەست دەدات. ئەو خەڵکانەی بە دەست هەژاری و نەدارییەوە دەناڵێنن، بە دوای گۆڕانکارییەکەوەن لە پێناو ئابووریی سۆسیالیستی و کۆنترۆڵی دەوڵەت... ئابووریی ئازادی تایبەتی، بابەت بوونی خۆی لای ئەوان لە دەست داوە.

سەرمایەداری خەریکە رۆشنبیرانی لە دەست دەدات. هێزە داهێنەرە رۆشنبیرییەکانی ئەوروپا و ئاسیا و ئەوروپای دیموکراتی یان ئایینیین، یان سۆسیالیست و یان کۆمۆنیست. ئێستا بیرمەند یان راڤەکار مەگەر فس فس پاڵەوانێکی ئاوارە(ی وەك دۆن کیشۆت) هەبێ تا ئامادە بێ بچێتە ناو قەڵشتی دوو قارِەکە و بۆ بەرگریکردن لە ئابووریی تایبەتی شین بگێرِێ و شینگڵ لە خۆی بدا. ئەو ناتوانێ هەنگاوێك بەرەو پێشەوە هەڵبگرێ.

لە سەرانسەری ناوچەی ژێر دەسەڵاتی سۆڤیەت لە ئەوروپادا - لە فینلەند، پۆڵۆنیا، ئەڵمانیای رووسان، نەمسای رووسان، رۆمانیا، هەنگاریا، چێکوسلۆڤاکی، بوڵگاریا، یوگسلاڤیا و ئەلبانیا، بەشێکی گەورەی ئابووری لە ژێر گوشاری رووس و کۆمۆنیستەکاندا کراوەتە نەتەوەیی. تراست و کارتێلەکانی مۆسکۆیی، بەرهەمهێنان و بازرگانیی ئەم ناوچە فراوانەیان بەتەواوی گرتۆتە دەستی خۆیان. کەواتە ئەم شێوە گۆرِانکارییە کۆمەڵایەتییە، بەرە بەرە لە ئەمریکای سەرمایەداریی بە سۆسیالیزمێکی ئێجگار کەمەوە دەست پێدەکا و دەگاتە بەشە دیموکراتییەکانی ئەوروپا و ئاسیا کە لەواندا سۆسیالیزم بە خێرایی خەریکی ئاوێتەبوون لەگەڵ سەرمایەدارییە و لە وێوە دەبێتە دنیای ژێر دەسەڵاتی سۆڤیەت کە رۆژ بە رۆژ دیموکراسی تێیدا کەمتر و سۆسیالیزم زیاتر دەبێ و تا سۆڤیەتی تەواو نادیموکراسی درێژە دەکێشێ کە سەرمایەداری تایبەتی لەوێ لەناو چووە.

ئەمە وێنەیەکی تازەیە لە دنیای دوای جەنگ. لە هەموو جێگایەك دەبینین کە شەرِ، حەزی دووربوونەوەی لە سەرمایەداریی خێراتر کردووە.



بەشی دەیەم

## چۆن دەکرێ هەنگاومان لەگەڵ بارودۆخی نوێدا رێکبخەین؟

ئەورِۆکە، مرۆڤ شایەدی هەڵپەیەکی ناماقووڵ و شێتانەیە بۆ گەیشتن بە دەسەڵات. نەتەوە گەورەکان، نەتەوە بچووکەکان هەڵدەلووشن، دێوەزمەی کۆمپانیا گەورەکان، کۆمپانیا بچووکەکان قووت دەدەن، یەکێتییەکانی کرێکاری و کارمەندان، گۆپاڵێکیان لە سەر سەری پیشەسازی و حکوومەت راگرتووە. هەر لایەنێك بە ئاماژەکردن بۆ رەفتاری لەو شێوە دژبەرانەی نەیارەکانی پاساو بۆ رەفتارەکانی خۆی دێنێتەوە. هەرکام هیچ نەبێ لە برِێك لەو خاڵانەدا هەقیان بە دەستە.

پەرەگرتن و گەشەسەندنی سەرسورِهێنەری بەرهەم لە سەردەمی نوێدا ریشەی کێشەی دەسەڵاتە.

هەر چەند ئابووری بەهێزتر بێ ئەو دەسەڵاتەی گرووپە سیاسی و ئابوورییە خاوەندارەکان و پشتیوان یا پەلگری ئەم ئابوورییە بە دەستی دێنن، گەورەتر دەبێ.

راستت دەوێ، دەکرێ بڵێین ئەورِۆکە سەرجەمی دەسەڵاتی سیاسی و ئابووری لە ویلایەتە یەکگرتووەکان ئیجگار زیاترە لە ١٨٩٠، بەم هۆ سادەیە کە ئەورِۆ بەرهەم زیاترە، کرِین زیاترە، پارە زیاترە، هەموو شتێك زیاترە. گاندی بە جۆرێك رووبەرِووی ئەو بارودۆخە دەبێتەوە کە ژیان سادە و سەرەتایی رادەگرێ[٤٠] و لەگەڵ ئەوەدا پیشە

(٤٠) گاندی ژیان بە شێوەیەکی سەرەتایی راناگرێ. ئەو خۆی پێناسەیەکی ئابووری لە دیدی خۆیەوە کردووە کە لە کتێبی "خەڵکی هەموویان بران"دا تا رادەیەك ئاماژەی پێکراوە. جگە لەوە ئەو خۆی لە حاڵی ئەزموونکردندا دەبینێ و ئامادەیە رەگاژۆکردووترین نەریت و دۆگمەکانی ژیانی رۆحی و ئاینی و فەرهەنگی و نەتەوایەتی خۆی وەلا بنێ. لە شوێنیکدا بە راشکاوی دەڵێ: "من نە چاوم لەوەیە و نە پێشنیار دەکەم هیچ کام لە پیشەسازییە بە کەڵك و چالاکییەکانی کەرتی پیشەسازی لە پێناوی ماشەری دەستی بە لاوە بترێن. بنەمای بیری من لە بەکارهێنان و برەودان بە

دەستییەکانی ناوماڵ لە گوندە خۆبژێوەکاندا دەپارێزێ. بەڵام تەنانەت هیندییەکانیش لەو بارەوە پەیڕەوی لێناکەن و هەڵبەتە دنیاش هەروەتر.[٤١]

تۆ بڵێی بکرێ تەکنەلۆژیایەکی بەسوود لە شارستانیەتی پیشەسازیی ئاڵۆزماندا دابڕێژرێ تا دەسەڵاتی هەوسارپساو یان ئاستی گشتیی دەسەڵات کەم بکاتەوە؟ تا ئەو کاتەی ئامرازی لەو بابەتە پەیدا دەبن، دۆزینەوەی زانستی و داهێنانە تەکنەلۆژییەکان، کە دەبێ شوکرانەبژێریان بین، هەروا ئامراز و کەرستەی بەکۆیلەکردن یان لە ناوبردنی چەشنی مرۆڤ دەبن.

هەندێ کەس لە سەر ئەو بڕوایەن کە ئەگەر بڕیار بێ، دەسەڵات و سەرمایە پاوان بکرێ، ئاسایشی زیاتر لەوەدایە کە لە ژێر کۆنترۆڵی حکوومەتدا بێ کە ئیرادەی گشتی بەڕێوەی دەبا، نەك لە دەست کەرتی تایبەتدا. بۆیە پشتگیریی گواستنەوەی گشت دەسەڵات لە سەرمایەدارانەوە بۆ حکوومەت دەکەن. بەڵام ئەم کارە هەڕەشەکردن لە ئازادی نە لادەبا و نە کەمی دەکاتەوە، چونکە دەکرێ لە دیموکراسیەتدا سەرمایەداران یاسامەند بکرێن و بە یارمەتیی سەندیکاکان، کۆنترۆڵ و

---

ماشەری دەستی ، ئەم راستییەیە کە دەیان ملیۆن کەس خەڵکی هەژار لە هیند دەژین کە نیوەی ساڵێ بێکارن و لە سەرانسەری ساڵدا بەدەست برسێتییەوە دەناڵێنن. باسکردنی ئازادی و سەربەخۆیی بۆ ئەمانە بێمانایە. ئەوان بەر لە هەموو شت کار و نانیان دەوێ. قەبووڵ دەکەم ئەگەر ئەو بارودۆخە لە ئارادا نەبا، بەکارهێنانی ماشەری رستنی دەستیش هیچ پێویست نەبوو." دەبینین ماشەری رستن بەلای گاندییەوە نە رەمزە نە دۆگم و ئارمانێکی ئایدیالیستی. بەڵکو تەنیا و تەنیا رێگەچارەیەکی بەپەلەیە کە سیاسەتمەدارێکی پراگماتیست، بە ناچاری ملی بۆ دەدا تا ئەوکاتەی رێگەچارەی دیکە دەدۆزرێتەوە.

(٤١) ئەوەش بڵێین کە ئاڵای نەتەوایەتی هیند، ماشەری رستنی گاندی وەك رەمزی سەربەخۆیی یان گەشەسەندن لە خۆیدا نەخش کردووە. هیندییەکان لانیکەم لە ئیدیعادا، وەها نەبوونە کە نووسەر باسی دەکا، بەڵام لە کردەوەدا ئەمە گەشەی شارنشینی و مرۆڤی شاری بووە کە زاڵ بووە، نەك بەدیهێنانی ئۆقیانوسێك لە گوندی گەشەسەندووی دڵخۆش و خۆبژێو، وەك گاندی دەیویست. ئەمە بە باشی لە پیشەسازیی فیلمی بالی وردی هیند و سەرسامیی یەك ملیار هیندیی حەسرەتباردا دەبینرێ، بۆیە راپۆرتی نووسەر، لەسەر بنەمای راستییەکانە.



سنووردار بکرێن، بەڵام حکوومەتێك کە هەموو سەرمایەکانی لە بەر دەست بن، حکوومەتێکی ستەمکار و رەخنەوەرنەگرە و ناشێ سنوورداری بکەیەوە.

حکوومەت هەر چەند جموجوڵی زیاتر بێ بەو رادەیە دەسەڵاتی زیاتر دەبێ و هەر چەند دەسەڵاتی زیاتر بێ بەو رادەیە بەسەر تاکدا زاڵتر دەبێ. لە رووسیادا حکوومەت، هەموو کارێك دەکا. حکوومەت سەرمایەداری بەڕێوەبەری قۆرخکەرە، ئەوەیە سەرچاوەی چەوساندنەوە، سەرکوت، ستەمکاری و ئیمپریالیزم. مارکسیستەکان وایان دادەنا کە لەگەڵ گواستنەوەی سەرمایەی سەرمایەداران بۆ حکوومەت، هەزارەیەکی نوێ دەست پێدەکا. بەڵام حکوومەتێك کە خاوەنی هەموو مڵك و زەویوزارە، دەبێتە دێوێك لە رووی بارستایی و توندوتیژییەوە. ئێستا دەبێ بزانین مرۆڤ لەو ناوەدا چی پێدەبڕێ؟

ئاشکرایە کە بەدیلی ستەمکاری، ئابووریی ماشەری گاندی نییە. سیستەمێکیش نییە کە لەودا حکوومەت هیچ کاری بە ئابووری نەبێ. ئەمەیان دەبێتە هۆی بێسەروبەری و نائارامی.

قۆرخکردنی دەسەڵات، چ دەسەڵاتی حکوومی بێ و چ دەسەڵاتی سەرمایەدارانی کەرتی تایبەت هەر بەڵایە. هەردووکیان دەیانەوێ مرۆڤ بکەنە زڕە مرۆڤ. دەسەڵاتی خۆرخکراو، نادیموکراتییە.

چارەیەك جگە لە بە خۆداچوونەوە و سەرلەنوێ دابەشکردنی یەکسانتری دەسەڵات نییە.

ئوستراليا، وەك زۆر وڵاتی دی لەم ساڵانەی دواییدا گەلێ کۆمپانیای بچووکی لە لایەن کۆمپانیا زلەکانەوە لووش دراون. بیروڕاکان بەرەو پێکهێنانی کۆمەڵەی ئابووریی کەمتر بەڵام گەورەترن. لەبەر ئەوە، هێزی کاری ئۆستراليا داوای لە حکوومەت کرد بێتە ناو کێشەکەوە. سەرەك وەزیرانی ئوستراليا گوتی: "بە رای من لێرە جێگای هەر دوو لا دەبێتەوە." پیشەسازیی تایبەت، لە سیستەمی ئابووریی ئازاددا، هەندێ جار لە ژمارەیەکی ئەوەندە کەمی **تراستدا** چڕ دەبێتەوە کە رکابەری،

تووشی خنکان و سەرکوت دەبێ. کاتێ کە حکوومەت و سەرمایەی تایبەت هەردووکیان لە پیشەسازیدا ئامادە بن، ئەودەم دەشێ رکابەرییش هەبێ.

بەرنامەی ئێستای نیشتمانیکردنی حکوومەتی بەریتانیا، لە راستیدا پیشەسازی بەردەخەڵووزی، گواستنەوەی جادەیی و رێگەی ئاسن. گاز، کارەبا، تەلەفۆن، بێتەل و خزمەتگوزارییە گشتیەکانە. ئەم پیشەسازییانە دەوری لە سەدا ١٠ی پیشەگەرەکانی لە خۆیدا جێ کردۆتەوە. لە سەدا (٩٠)ەکەی دی دیسانەوە لە خزمەتی کەرتی تایبەتدا دەمێنێتەوە.

ئەم ئابوورییە، سیستەمێکی تێکەڵاوە کە لەوانەیە لە زۆر لە دێموکراسییەکاندا ببێتە نموونەیەکی نوێ، ئابوورییەکی تێکەڵاو لە سەرمایەداریی کەرتی تایبەت و سەرمایەداریی حکوومەتی.

بۆمبی ئەتۆم بە بەشداریکردنی دۆستانەی حکوومەت و پیشەسازیی ویلایەتە یەکگرتووەکان دروست کرا.

ئەو تاقیکردنەوانەش کە بە مەبەستی سوودوەرگرتن لە وزەی ئەتۆم بۆ کاروباری سەربازی ئەنجام دەدرێن، لەلایەن حکوومەتی فیدراڵ و بە هاوکاریی کۆمەڵگە ئابوورییە تایبەتەکان جێبەجێ دەکرێ. وزەی ئەتۆم هێندە لە کاروباری سەربازی نزیکە و لە سیاسەتە جیهانییەکاندا هێندە چارەنووسسازە کە حکوومەت دەبێ دەورێکی گرنگ بۆ کۆنترۆڵکردنی بگێڕێ. کەواتە رۆژگارێك لە داهاتوودا، حکوومەت لەوانەیە ببێتە سەرچاوەی سەرەکی و لە راستیدا تاکە سەرچاوەی وزەی ئەتۆم بۆ پیشەسازی. وزەی ئەتۆم لەوانەیە سەرجەم سیمای بەرهەمهێنان - بۆوێنە لابردنی مەعدەنکاریی بەردەخەڵووزی - بگۆڕێ.[٤٢]

(٤٢) ئێستا دوای ٦٠ ساڵ دەبینین کە تاقیکردنەوە، هەندێ خاڵی دیکەی لە بارەی بەرهەمهێنان، سوودلێوەرگرتن، چاکردنەوە و راگرتن و رەنێوهێنان و لقوپۆپەکانی بەرهەمهێنانی وەزی ئەتۆم و درێژەپێدان و گەشەپێدانی ئەم پیشەسازییە هێناونە گۆڕێ، بە جۆرێك کە زۆربەی وڵاتە پێشکەوتووەکان خەریکی کۆکردنەوەی بارگە و بنەی وێستگە ئەتۆمییەکانی خۆیانن. لەلایەکی



حکوومەت کە بە شێوەیەکی سۆسیالیستی وزەی ئەتۆم بەرهەم دێنێ، بەسەر کارگەکانی سەرمایەداریی تایبەتدا دابەشی دەکا، ئەمە دەتوانێ بە مانای ئابووریی تێکەڵاو بێ. زانستی نوێ، ئەو شکڵەی ئێستای بە سەرمایەداری بەخشی. زانستی نوێتر دەتوانێ سەرمایەداری بە تەواوی بگۆڕێ.

لە ئابووریی تێکەڵاودا، خاوەندارێتی و بەکارهێنانی ئامرازی بەرهەمهێنان تەنیا لە نێوان حکوومەتی فیدراڵ و کۆمەڵگە گەورەکانی کەرتی تایبەتدا دابەش نابێ، بەڵکو لە نێوان حکوومەتی فیدراڵ، حکوومەتەکانی هەرێم یان ستانی، ئەنجوومەنی شارۆچکەکان، شار، کۆمپانیاکانی هەرەوەزی و تایبەت و کەسانی تایبەتیش دابەش دەکرێ.[٤٣]

ئەم جۆرە دابەشکردنەی بەربڵاوی دەسەڵات رێگە لە ستەمکاری سیاسی دەگرێ و تا رادەیەکی زۆر، هاندەری داهێنان و چالاکییە. بە وتەیەکی تر، دیموکراسی ئابوورییەك بەدی دێنێ کە دیموکراسیی سیاسیشی لە خۆیدا هەڵگرتووە.

یەکێ لە گەورەترین باشییەکانی ئابووریی تێکەڵاو، پلان دارشتنی سەرانسەری و خۆبەخشانەیە لەلایەن کەرتی تایبەت و لە پەیوەندی لەگەڵ حکوومەتدا. بنەماڵەیەك پلان دادەرێژێ، قوتابخانەیەك پلان دادەرێژێ، خاوەنی کارگایەك پلان دادەرێژێ. بەڵام پێویستیان بە پلانێکی گشتیش لە نێو خەڵکانی کاسبکاردا هەیە، جاران زانایانی زانستە کۆمەڵایەتییەکان پێیان وابوو کە پەیوەندیی نێوان لقە جۆراوجۆرەکانی ئابوورییەك پێویستی بە دارشتن و پلان دانان نییە، بەڵکو ئەمانە خۆیان بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی و لە رێگەی میکانیزمەکانی نرخ، داواکردن و خستنەروو رێکدەخەن.

دیکەوە هێشتا دەبینین هەندێ وڵاتی ناپێشکەوتوو بۆ بەدەستهێنانی ئەم تەکنەلۆژییە و سەرچاوەی ئامرازی دەسەڵات هەوڵ و پەلەقاژەیانە.

(٤٣) ئەم پێشبینییە لە کردەوەدا وەڕاست نەگەڕا، چونکە ئەورۆکە تەنیا دوو جەمسەری سەرەکیی حکوومەت و سەرمایەداریی کەرتی تایبەتن کە شتیان بە دەستە. لە هەمان کاتدا لە وڵاتێکی وەك ئەمریکا، یاسای **دژی قۆرخکردنیش** هەیە کە تا رادەیەك رێگە لە ستەمکاری سەرمایە لە بەرامبەر رکابەرانیدا دەگرێ.

بەڵام مرۆڤ هەر هێندە بەسە تەماشایەکی نائارامی، ئاڵۆزی، شکست هێنان و مانگرتنی ئەنجامی نرخی گران و مەسرەفی کەمتر لە ستاندارد لە توێژی بێهێز بکا تا بزانێ کە ڕێکخستنی ئۆتۆماتیکی، زۆربەی کات بە گران ڕادەوەستێ و زۆر جاریش وا بووە کە کردەی ڕێکخستنەکە بە ئەنجام نەگەیوە.

ئەگەر دامەزراوێکی تایبەت هەوڵ بدا لە سەر ئاستی نیشتمانی پلان دابنێ، لەوانەیە بە قۆرخکاری و بەرتەسك کردنەوەی کەشوهوای بازرگانی تاوانبار بکرێ.

ئێستا حکوومەتەکان خەریکی کاری ڕێکخستنن، هەوڵ دەدەن نرخەکان نزم ڕابگرن، بە وەرگرتنی باج داهاتەکان باشتر دابەش بکەن، مووچەکان ڕێکبخەن، کاری زیاتر دابین بکەن و... بەڵام زۆربەی کات ئەم کارانە دوای ئەوە دەکرێن، بە شێوەیەکی پاشاگەردانی و بێ حیساب و کیتاب ئەنجام دەدرێ. پێشەکی دەبێ پێشبینی کێشەکان بکرێ و ، لانیکەم دەست پێشخەری بەرامبەر هەندێکیان بکرێ. ئەمە دەشێ **کاری تایبەتی** پلان دانانی ئابووریی تێکەڵاو بێ.

پلان دانان بە مانای ڕێساسڕینەوەی زیاتر و، هەماهەنگیی زیاتر و ئۆتۆماتیکی بەشە بێئەژمارەکانی ژیانی ئابووریی نیشتمانییە.

حاڵی حازر، سەرمایەداری بە شێوازی نازانستیی تاقیکردنەوەی کوێرانە و هەڵە قورسەکانی ئەنجامی ئەو تاقیکردنەوانە، تووشی بێسەروبەری و پاشاگەردانییەکی گران بووە. ئێمە ئەوڕۆکە لە پێشبینی کەشوهەوای هەفتەی داهاتوو زۆر ئاگادارترین تا بازاڕەکانی هەفتەی داهاتوو. تەنانەت سیاسەتیش لە ئابووری ڕێکوپێکتر کاری خۆی دەکا.

ئابووریی تێکەڵاو نەك هەر دەتوانێ ڕێکوپێکی دروست بکا، بەڵکو هانەیەکی نوێش زیاد دەکا. دەتوانێ هەوڵدانی کرێکار و کارمەندانی زیاتر بکا. لە سەردەمی کارکردنی باڵا یان کامڵدا، کاتێ کە کرێکاران متمانەیان بە ئاسایشی پیشەکەیان هەیە، لەوانەیە حەزیان لێبێ کە چالاکییان کەم بکەنەوە. بۆی هەیە دنیا بچێتە ناو



سەردەمی کارکردنی کامڵەوە. هەر ئێستا لە قارەی ئەورووپا و خودی بەریتانیادا کەمایەسی هێزی کار هەست پێدەکرێ.

بەڵای پەتای ڕەش (تاعوون) بەریتانیای لە ساڵانی ١٣٤٨- ١٣٤٩ی زایندا تەفروتونا کرد، یەك لە سەر سێ تا نیوەی دانیشتوانی دوورگەکەی لە ناو برد. کەم بوونی هێزی کار لە قۆناغی دواتردا، ئەو هەلەی بۆ وەرزێرانی گرێدراو بە زەوی ڕەخساند و وەرەی دانێ زەویەکانیان جێ بێڵن و ڕوو بکەنە شاران. لەوێ بوو کە ئەمانە بوونە هۆی گەشە و هەڵدانی پیشەسازی و سەرمایەداریی بەریتانیا.

هەر بەم پێودانگە، کەمبوونی ئێستای هێزی کار لە بەریتانیای مەزن، پێویستیی بە میکانیزەکردنی زیاتر و چاکسازی و عەقڵانیەتێکی زیاترە لە چاو ئەوەی کە کەرتی تایبەت بە زەوقی خۆی تا ئێستا کردوویەتی. کەواتە کەمبوونی کرێکار لە بەریتانیا یەك لە هێزە پاڵنەرەکان بەرەو سۆسیالیزمە.

گەر وای دابنێین ئازادیی تاکەکەسی دەستەبەر دەکرێ و دامودەزگای حکوومی لە ڕادەبەدەر قەبە و زل نابێ، بونیادی ئابووریی حکوومی لەوانەیە لە سەردەمی کارکردنی باڵادا، پڕ بەرهەمتر لە کەرتی تایبەت بێ، چونکە کرێکارەکان ڕەنگە وا هەست بکەن کە خۆیان بۆ کۆمەڵگاکەیان ماندوو دەکەن. ئابووریی تێکەڵاو لە ئەنجامدا دەتوانێ ببێتە هۆی بەدیهاتنی دیموکراسیی ئابووری.

لە دیموکراسیی ئابووریدا، دەسەڵاتی بەڕێوەبردن، یاسادانان و دادوەری یەکتر کۆنترۆڵ دەکەن و ڕێکدەخەن. سێگۆشەی دەسەڵاتەکان دەستەبەری ئازادییە. لە کاروباری ئابووریدا، سیستەمێکی پێکهاتوو لە کۆنترۆڵ و ڕێکخستنی بەرامبەریش پێویستە. سێگۆشەی ئابووریی ئێستا بریتییە لە ڕێکخستنی سەرمایەداران لە لایەن حکوومەتەوە، بوونی سەندیکای کرێکاران و کارمەندان و لە کۆتاییدا، خەباتی کرێکاران و کارمەندان لەگەڵ سەرمایەداری. ئەم پێکهاتەیە قازانجی خۆی هەیە، بەڵام لە کاتێکدا ئەگەر بەرهەمهێنان و دابەشکردن لە نێوان حکوومەت، سەرمایەدارانی

تایبەت و گرووپی کەسانی ڕێکخراو لە هەرەوەزییەکاندا دابەش کرابێ، کۆنترۆڵ و ڕێکخستنە بەرامبەرە ئۆتۆماتیکییەکان ڕەنگە ڕەوانتر و ئۆتۆماتیکیتر کار بکەن.

ئەم شێوازەی ئابووریی تێکەڵاو، واتە هەڵوەشاندنەوەی قۆرخکردن و ڕکابەریی زیاتر، یەك لە شێوەکانی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ کێشەی دەسەڵاتە، بەڵام بەس نییە. دەبێ ڕێگەیەکی دی تاقی بکرێتەوە: کەمکردنەوە و سنووردارکردنی ئاستی دەسەڵاتی یەك کەس. ئیمکانی زۆر هەن. لە هیند، نزوول خۆر مەبلەغێکی زۆر بە هاتنە سەری زۆرەوە دەدەنە جووتیاری هەژار. دوای ئەوە - و زۆربەی کات تا کاتی مردن - جووتیاری **سرف** کۆیلەی ئابووریی خاوەن قەرزەکە دەبێ. بانکێکی کشتوکاڵ یان سندووقی هەرەوەزیی **قەرزی دوولایەنە** دەتوانێ خاوەن قەرز لەکۆڵ قەرزدارەکە بکاتەوە.

ئەگەر ڕێساکانی پەساپۆرت و ڤیزە لە نێوان وڵاتانی دۆستدا هەڵبگیرێ، کاربەدەستانی کونسوولگەرییەکان ئیتر تاخیر کردن، پێنەدان، بێنەوە بەردە پێکردن و ڕەنجاندنی موسافیریان پێناکرێ.

لەناوبردن و بە ڕەزالەت کوشتن، لە هەر ساڵێکدا تەنیا یەك یا دە ڕەشپێست ناکوژێ. ئەوان ملیۆنان قولەڕەش دەتۆقێنن و بەجۆرە بە ئازادییە کاغەزییەکەیان پێدەکەنن. ڕژێمێکی پابەند بە یاسا، دەتوانێ دڕندە سپی پێستەکان لە زاڵبوون بەسەر ڕەشەکان دوور بخاتەوە.

منداڵبوونی بە پێی حیساب و بەرنامەوە، ئەو توانایە لای دایکان و باوکان بەدی دێنێ کە ژیانیان ئازادانەتر بگرنە دەست و نەبنە کۆیلەی منداڵی زۆر و بە دەستی خۆیان هەژاری بۆخۆیان دروست نەکەن. کاسبکار و سەرمایەدارێك کە تەنیا پارەیەکی بۆ بە میرات ماوەتەوە یان پێڵاوی کارگاکەی خۆی لە ئەستۆی کڕیاران راکردوون و خاوەنی یەك دوو ڕۆژنامە و ئێزگەی ڕادیۆیی شارەکەیە، ئەم هەلەی بۆ ڕەخساوە کە بیر و زەینی هەزاران کەس کۆنترۆڵبکا. ئالێرەدایە کە ڕکابەری پێویست دەبێ. کاتێ کە ڕکابەرییەك لە ئارادا نییە، خاوەندار و سەرمایەدار دەبێ لە بەرپرسیارێتی



کۆمەڵایەتیی خۆی بەرامبەر بە ڕەنگ پێدانەوەی بەویژدانانەی هەموو لایەنە جیاوازەکانی کێشەکان ئاگادار بێ.

بۆ هەر بنەماڵەیەك، هەبوونی خانوو زۆر گرنگترە لەوەی ئۆتۆمبێلیان هەبێ. ئەگەر هەر بنەماڵەیەك، خاوەنی خانوو یان ئەپارتمانێکی خۆی لە کۆمەڵگەیەکی هەرەوەزیی نیشتەجێکردن بێ، مەیدانی ئاژاوەگێڕیی خاوەن خانووەکان بەرتەسك دەبێتەوە. لە ئاراستەی ئەم ئامانجەدا، شارەکان بۆ ئەوەی خاوەنی ئەو زەوییە بن کە لە سەری دروست دەکرێ، ئەنجوومەنی شار دەتوانێ باش ئەرکی خۆی ڕاپەڕێنێ و ئیزنی کڕین و فرۆشتنی موڵکەکانی شار تەنیا بداتە دانیشتوانی شارەکە.

دەبێ ڕێوشوێنی مەدنیانە بۆ جێگیرکردن و ڕێکخستنی هەقدەستەکان، هەلومەرجی کار، نرخی تەلەگراف، تەلەفۆن، گواستنەوە و خزمەتگوزارییەکانی تر و پیشەسازییە قۆرخکراو و نیوە قۆرخکراوەکان - کە ئاسانکاریی بە ڕاستی گشتین - هەبێ تا ڕێگە لە لەناوچوونی ژیانی میللەت لە لایەن ئەم یا ئەو سەندیکای کرێکاری یان کارمەندی بگیرێ. ئەم ڕێگە چارەیەش دەتوانێ لە ئاستی دەسەڵاتی کەڵەکەبوو کەم بکاتەوە.

زەویی کشتوکاڵی وەك هەوا دەبێ بە خۆڕایی بێ و نابێ کڕین و فرۆشتنی لەسەر بێ. کۆمەڵگا دەبێ ئەو زەوییانە بە پێی توانای کار لەسەر کردنی بنەماڵە و کەسەکان و بە لەبەر چاو گرتنی ئاسوودەیی گشتی لە نێویاندا بەش بکا. ڕادەی ئەو زەوییەی دەدرێتە کەسێك دەبێ بە وردبینی بیدرێتێ و سنووردار بێ. بەم جۆرە خاوەن زەویی مشەخۆر، دەسەڵات و زاڵبوونی خۆیان بەسەر ئەو پیاو و ژن و منداڵانەدا کە خۆراکی دنیا و بەرهەمە کشتوکاڵییە پیشەسازیەکان بەرهەم دێنن، لە دەست دەدەن.

هەبوونی کار وێڕای بیمەی کۆمەڵایەتی و بیمەی بێکاریی بە ڕادەی پێویست، مووچەخۆر و هەقدەست وەرگران دەباتە ڕەوشێکی باشتر بۆ چەنەلێدان لە سەر بارودۆخی کارەکەیان، هەر لەسەر ئەم بنەمایە، ئەوان لە بەرامبەر خاوەن کاردا سەربەخۆیی زیاتر بە دەست دێنن.

دەزگای ڕێبەرایەتی حیزبی سیاسی کە دەتوانێ بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، پاڵێوراوی گرتنەوەی پۆستەکان ڕابگەیەنێ، دەسەڵاتێکی زۆری هەیە ئەمانە دەست و باڵی دیموکراسی گرێ دەدەن. چالاکیی زیاتری سیاسی، لە لایەن دەنگدەری ئاسایی حیزبییەوە، ئەم دەزگایانە لغاو دەکا.

ستاندنی باجی سەرانە یان تاقیکردنەوەی دیاریکردنی سامان[٤٤] بۆ دەنگدەر و پاڵێوراوان، دەسەڵاتێکی زۆر دەداتە دەست کەسانێکی بە ژمارە کەم. ئەو بەرتەسك کردنەوانەی لەسەر دیموکراسی دەکرێن، دەتوانرێ لە لایەن ڕای گشتیی وروژاوەوە پێشێل بکرێ.

کۆمپانیایەکی مەعدەنکار کە خاوەنی خانوو و دوکانەکانی گوندی مەعدەنچییەکانە، دەسەڵاتی زیاتری بە سەر کرێکارەکانیدا دەشکێ. ئەم دۆخە دەکرێ چاك بکرێ.

لە کاتێکدا پەروەردە ئیمتیازێکی گرانبەهایە، ئەو ژمارە کەمەی کە دەرەقەتی مەسرەفە گرانەکەی دێن، لە چاو ئەوانەی کە توانایان نییە، گەلێ باڵادەستتر دەبن. پەروەردەی گشتیی بە خۆڕایی، ئەم باڵادەستییە لە دەسەڵاتدا کە ئێستا بەسراوەتەوە بە سامان، لە ناو دەبات. یەکسانی لە ساماندا، تا ماوەیەکی زۆر نایەتە دی، بەڵام دۆزینەوەی ڕێگەیەکی لەسەرخۆی بەرەو یەکسانی لە نێوان تاکەکاندا، دەتوانێ سەرەتایەك بێ بۆ چارەسەری کێشەی دەسەڵات.

ئەگەر سامانیش یەکسان بێ، دەسەڵات یەکسان نابێ. لە هەموو کۆمەڵگایەکدا کەسی دەستەبژێر (نوخبە) و خەڵکی ئاسایی هەن. واتە دەسەڵاتدار و بێدەسەڵات. ئیدی هەر یەك لەمانە چۆن ڕەفتار دەکەن، لە ڕوانگەیەکەوە، هەندێ جار بە چۆنیەتی یاساکان و کارابوونی سیستەمی کۆنترۆڵ و پێشگیری و ڕێکخستنی دوو لایەنەوە بەندە. لەگەڵ ئەمانەشدا، دیسانەوە گەندەڵی و بەکارهێنانی خراپی دەسەڵات بۆی

---

(٤٤) Property test : تاقیکردنەوەیەك کە دەریدەخا سامانی پاڵێوراو لە ڕێگەیەکی تەندروست و یاساییەوە بە دەستهاتووە.



هەیە بکرێ. بەم جۆرە دوای شیکارییەکی کۆتایی دەبینین کە ڕیشەی هەموو کێشەکان دەگەڕێتەوە سەر چۆنیەتی ئەخلاقی تاکەکەسی و پڕایی خەڵك.

**مرۆڤێك** کە حەزی لێیە ببێتە خاوەنشکۆیەکی زۆردار و کەڵەگا، بە شوێن ڕێگایەکەوەیە بۆ وەدی هێنانی تامەزرۆیی و شەهوەتی هیچوپووچی خۆی و دەتوانێ ئەوی لێی دەگەڕێ لە بنەماڵەیەك، پۆلی خوێندن، دایرە، کارگا یان پیشەیەکی حکوومیدا، بیدۆزێتەوە. ئەو کەسە پێویستی بە دەرمانێکە کە چاك وایە دوای تەماشاکردنی ئاوێنە و هەروەها ئەو گیانانەی ئازاریان دەدات، بۆخۆی دەست بداتە چارەسەرکردنی خۆی. بەم جۆرە، ئەگەر نەریت و نۆرمە باوەکان بە نرخی بێ ئەملاولای داسەپاندنی ناکارایی بەسەر سیستەمدا، چاوپۆشی لە وەرگرتنی بەرتیل، ماڵی دزێتی، خزم خزمێنە لە دامەزراندندا، و جیاوازیدانان دەکەن و ملی بۆ ڕادەکێشن، ئەو دەمە گشت کۆمەڵگاکە زیانی وێدەکەوێ، جا با هەموو یاسا پێشکەووتووەکانیش لە کۆمەڵگادا دانرابن.

ڕێگاکانی ئابووری و بەڕێوەبردن و یاسایی بەرەنگاربوونەوەی ئاژاوە کۆمەڵایەتییەکان، دەبێ بە هەوڵی کەسانێ کە بە گوێرەی بانگەوازی ویژدان و کەسایەتیی ڕۆحی کاردەکەن و هەروەها کۆمەڵگایەکی خوازیاری پێوەرە ئەخلاقییە باڵاکان کامڵ بکرێ.

سیستەم گرنگە. گاندییەکی تەنیا، لە دیکتاتۆریدا ناتوانێ زۆر بەرگە بگرێ و بۆ پێشەوە هەنگاو بنێ. دیکتاتۆری هەوڵ دەدا و زۆربەی کاتیش لەوەدا سەردەکەوێ کە ڕووکردنە تاکەکەسییەکان بەرەو چاکە و خێر کاڵ بکاتەوە و لەناو ببا. تۆقاندن و تیرۆریزمی دیکتاتۆری، هەمووان ناچار دەکا خۆیان لەگەڵ نۆرمەکانی بەڵادا بگونجێنن.

لەلایەکی دیکەوە، لە دیموکراسیدا، هەموو تاکێك **بازنەیەکی کردەوەی** بەرینی هەیە کە لەم بازنەیەدا، پاکی یان ناپاکیی ئەو دەورێکی زۆر گەورە دەگێڕێ. جاران پێیان وابوو کە دوای کۆتایی هاتنی سەرمایەداریی تایبەت، ئەخلاقیاتی پێشڕەو،

هەر لە خۆوە سەرهەڵدەدا. ئەزموونی سۆڤیەت بەڵگەیەکە دژی ئەم بۆچوونە. کۆمەڵگای سۆڤیەت بە رادەیەکی بەرچاو نائەخلاقییە. کەسایەتیەك لە رۆمانێکی سۆڤیەتدا بە ناوی *هونەرمەندی گومناو*(ڤی . کاڤرین، ١٩٣١) دەڵێ:

"ئەخلاقیات؟ ئەخلاقیات کیلۆی بە چەندە؟ کاتم نییە بیری لێبکەمەوە، سەرقاڵم، جارێ خەریکم کار لە سەر بنیاتنانی کۆمەڵگەی سۆسیالیستی دەکەم. بەڵام ئەگەر ناچار بم لە نێوان ئەخلاقیات و پانتۆڵدا، یەکیان هەڵبژێرم، پانتۆڵەکە هەڵدەبژێرم. "

ئەو کەسە پانتۆڵەکە تەنیا لە بەر ئەوە هەڵنابژێرێ کە لە بازاڕدا کەمیابە، بەڵکو بەم هۆیە کە ئەخلاقیات لە بنەڕەتدا بێنرخە! کاتێ درۆکردن چەکێکی رەسمییە، ئەخلاق چۆن دەتوانێ بەنرخ بێ؟ کاتێ کە تۆقاندن و تیرۆریزم **ئارامیی بە هەر نرخێك** پڕبەها دەکا، بنەمای ئەخلاقی چۆن دەتوانێ پڕبایەخ بێ؟ ئەزموونی سۆڤیەت ئەزموونێکی یەکلاکەرەوە و گردەبڕ نییە. بەڵام نموونەیەکی ئاگادار کەرەوەیە، بەتایبەت کاتێ مرۆڤ رەفتاری کۆمۆنیستە غەیرە رووسەکان دەبێ کە لە مامۆستا مۆسکۆییەکانیان کەمتر ناپاك نین. **کارل مارکس (سۆسیالیزم)ێك کە بووەتە کۆیلەی پێتری مەزن (نەتەوەخوازیی رووس). کارل مارکسێکی لادەر لە ئەسڵی خۆی. مارکسی ئاوێتە لەگەڵ گاندی دەکرا تێکەڵەیەکی سوودبەخشی لێ دروست بکرێ. چاکسازی و شۆڕشی ئابووری بەتەنیا بەس نین. دیکتاتۆر بە کەم بایەخدان بە ژیان و کەرامەتی مرۆیی، بە چاونوقاندن لە ئازاری مرۆیی و ناپاکی، قەڵەو دەبن و گەشە دەکەن. ئەگەر بە گژ ئەو کردارانەدا بچییەوە وەکو ئەوە وایە بەگژ دیکتاتۆردا بچیتەوە. ئەگەر ژیانی دیموکراتی لە دیموکراسییەکاندا، بەهای ژیان، ئازادی و هەقیقەت فێری منداڵان و گەورەکانیش بکا، ئەگەر خەڵك فێری ئەوە بن کە بە میهرەبانی، خاکەڕایی و دۆستانە هەڵسوکەوت بکەن، کاریگەری باوەڕە نائەخلاقییە پاوانخوازانەکانیان لە سەر کەم دەبێتەوە. هیچ ئاستێك لە سۆسیالیزم مرۆڤان فێر ناکا کە گوڵ و خۆرنشینیان خۆش بوێ یان لەگەڵ ئاژەڵان دڵنەرم بن. هەر بەم جۆرە هیچ شتێك لە جەوهەری دەوڵەت یان ئابووریدا ناتوانێ تۆوی خۆشەویستیی مرۆڤ بە خێرایی لە نێو خەڵکدا بچێنێ.**



لە ئەنجامدا، جەوهەری حکوومەت و سیستەمی ئابووری بەسراوەتەوە بە کەسایەتیی خودی مرۆڤەکانی ناویان و رادەی گوێقولاخی و هۆشیارییان. *ئەفلاتوون* بیست و سێ سەدە لەمەوبەر، ئەم بابەتەی بەم جۆرە دەربڕیوە: "وەچەی مرۆڤ هەرگیز دەستی ناگاتە رێگەچارەی کێشەکان، مەگەر ئەوەی عاشقانی راستەقینە، خۆیان قۆڵ هەڵماڵن و دەسەڵاتی سیاسی بگرنە دەست، یان ئەوە کە خاوەنانی دەسەڵاتی سیاسی، بە جۆرێك دامەزراندن و توانەوەی ئیلاهی ببنە ئەویندارانی راستەقینەی عەقڵ."

رزگاریی دیموکراسی لەو مەترسیانەی دەورەیان داوە، پێش هەمووشت، ئەرك و پابەندبوونێکی ئەخلاقییە کە دەبێ لەناخی هەر تاکێکەوە دەست پێبکا. ئاشتی و دێموکراسی وەك خێرکردن، لە ماڵەوە و لە دڵی مرۆڤەکانەوە دەست پێدەکا.

**هەموو ئەو شتانەی کە لەبارەی حکوومەت و دامەزراوە ئابوورییەکان گوترا، لە بارەی ئایین و پەرستگاکانیشەوە راستە و ئەوانیش هەر هێندە ئەخلاقین کە کەسەکانی ناوەوەیان هەن.**

مەهاتما گاندی کەسێکی زۆر زۆر مەزهەبییە؛ ئەخلاق، فەلسەفە و شێوەی ژیانی، هەمووی بەراستی و بەتەواوی لە ناخی مەزهەبە تاکەکەسییەکەیەوە هەڵدەقوڵن. ئەو لەو بارەوە دەڵێ: "من گەشەکردنێکی ئاشکرا و بەرچاوم لە هیچ ئاینێکدا نەبینیوە. ئەگەر ئایینەکانی دنیا پێشکەوتوو بان، دنیا تووشی ئەو ئاژاوە و بێ سەروبەرییەی ئێستای نەدەبوو."

ئۆسقۆفی مەزنی کەنیسەی ئۆرتۆدۆکسی یونانی لە روسیا، ستالینی بە **متفەرك** و **پشتێن بەستووی خوا** ناو دەبرد. ئەڵمانیی هەموو رێبازەکانی مەسیحییەت، کاتێ وەك نەتەوەخوازی توندڕۆ پشتی هیتلەریان گرت، مەسیحیەتی خۆیان لە بیر بردەوە. قەشە و ئیماندارانی کاتۆلیك یارمەتیی فرانکۆی دیکتاتۆریان دا و یارمەتیی دەدەن، هەر چەند کە بە پێی وتەی *فرانسیس. سی.مەك ماهون*، ئیمانداری بەناوبانگی کاتۆلیك لە ٣٠ی ئاوریلی ١٩٤٧ لە رۆژنامەی *نیویۆرك پۆستدا*: "کەنیسەی کاتۆلیك

لە ئیسپانیا هەر هێندە ئیزن و ئازادیی کردەوەی هەیە، کە حەز و بەرژەوەندییەکانی دیکتاتۆر پەرە پێبدا و باس بکا."

ڕۆحانیەتی کاتۆلیکی ئیتالیا، بەشداریی چالاکانەی دەستدرێژیی مۆسۆلینی بۆ سەر ئیتیۆپی کرد: ئۆسقۆفەکان زێڕیان بۆ کۆکردەوە.

خاوەنانی ئایین(ئاینکاران)، لە جیاتی ئەوەی شێلگیرانە بەرەنگاری بەدفەڕییەکانی دەسەڵات ببنەوە، بۆ سازش کردن و بەرووداِ پێکەنینی هەنگاو دەنێن.

مەسیح، ئەخلاقگەرا و دیموکرات بوو، بەڵام چەند کەس مەسیحی هەن کە پەیڕەوی لێبکەن؟ سیستەمی کاستی لە هیندووگەراییدا، نائەخلاقی و نادیموکراتییە، بەڵام چەند کەس هیندوو لە خەبات بە دژی ئەو سیستەمەدا هاوڕێیەتی گاندی دەکەن؟ ئیسلام وانەی برایەتی زۆر تێدان، بەڵام میسر، عێراق، ئوردن، فەلەستین، ئێران یان عەرەبستانی سعودیا تا چەند دیموکراتین؟ ئاییینی جوولەکە سیستەمێکی لە ئەخلاقیاتی بەرز هەیە. چەند کەس جوولەکە پەیڕەوەی لەو سیستەمە دەکەن؟

پەرستگە کاتێك ئەخلاقی و پاکە کە بە شێوەیەکی بەرچاو و ئاشکرا بەرەورووی کێشەی دەسەڵاتی فرە چەشن و تێکپەستراو و دەسەڵاتی قۆرخکراو ببێتەوە.



# بەشی پازدەهەم

## ریشەی دەسەڵاتی جیهانیی رووسیا لە کوێدایە؟

گەورەترین کێشەی دەسەڵات لە جیهانی ئەمڕۆدا، رووسیایە. ستالین بە دەسەڵاتترین کەسی دنیایە. پیاوی دەسەڵاتە و لە یاساکانی دەسەڵات مەعلانە. ئەو بە ئاگادارییەوە دەسەڵاتێکی گەورەی لە ناوخۆدا بە دەست هێناوە و ئێستا دەسەڵاتێکی بەربڵاویشی لە دەرەوە چنگ خستووە. چۆنە یەکێتی سۆڤیەت دەتوانێ رکابەریی ئەمریکا و لە راستیدا سەرجەم دنیای دیموکراتیك بکا؟ حکوومەتی سۆڤیەت نە نان و ئاوی پێویست دەداتە خەڵکی خۆی و نە ئازادیی پێویست. رووسیا لە رووی سەربازییەوە لە ئەمریکا لاوازترە. بۆ هەمووان ئاشکرایە کە ئازادی لە دیکتاتۆری باشترە. لەگەڵ ئەوەشدا کۆمۆنیستەکان چۆن دەتوانن رکابەریی حیزبە دیموکراتەکان بکەن؟ سەرچاوەی دەسەڵاتی رووسی و دەستڕۆیشتوویی کۆمۆنیستی لە سەرانسەری دنیادا لە کوێوەیە؟

لە کاتی کۆنفرانسی ئەم دواییەی ئاشتیی پاریس، پیرە سەرتاشێکی پاریسی، تازە قژی بۆ کورت کردبوومەوە کە من لە رووی دەبەنگییەوە، داوای شامپۆی رۆنی زەیتونم لێکرد. پەشۆکا و گوتی: "رۆنی زەیتوون؟!" ئینجا گوتی: "بۆ سەرت؟! ئێمە نیمانە لە شێوی کەین." لە رەوشەکە بە گازندە بوو. دەیگێڕایەوە: "جارێکی تر دەنگ دەدەمە کۆمۆنیستان. ئەوانی دی، هەموویان تاقیکردنەوەی خۆیان دا و کارەکەیان خراتر کرد. ئەم جارەیان با دەرەفەتێك بدەینە کۆمۆنیستان. دەڵێن ئەوان شتێك بە شتێك دەکەن.

سەرتاشەکە کۆمۆنیست نەبوو، بەڵام بارودۆخی نالەبار، وای لێکردبوو بڕوای بە سەرمایەداری نەمێنێ. چی ئەوتۆی نەبوو لە کیسی بدا. باسی ئازادیم لەگەڵ کرد. پێی سەیر بوو: "ئازادیی چی؟ من هەمیشە نانی خۆم پەیدا دەکەم. من تەنانەت لە

سەردەمی نازیشدا وەزعم باش بوو." ئەم وتەیە واتە دەنگێك بە قازانجی حیزبی کۆمۆنیستی فەڕەنسا. ئەو بە تەنیا نەبوو و خەڵکی دیکەشی لەگەڵدابوون.

هاوینی **١٩٤٢** لە قودس(ئورشەلیم) بووم. مارشال رومل - ی نازی خەریك بوو دەگەیشتە گەرووی سوئێز و قاهیرە. ئەگەر لەوەدا سەرکەوتنی بە دەست هێنابا، جەنگەگە بە زیانی هێزی هاوپەیمانان دەشکایەوە. سەرکردە عەرەبەکانی قودس پێیان خۆش بوو رۆمل پێشڕەوی بکا و خەریك بوون خۆیان ئامادە دەکرد پێشوازی لێبکەن. بۆ؟ چونکە عەرەب دژی ئینگلیز بوون: نازییەکان لەگەڵ ئینگلیز شەڕیان دەکرد، کەواتە عەرەبیش لەو ناوەدا، دەبوایە لایەنگری نازییەکان بن.

هاوینی **١٩٤٦** دیسان لە ئۆرشەلیم بووم. خانمێکی بەناوبانگی عەرەب بۆ خواردنی شەو دەعوەتی ماڵێی کردم کە کەوتبووە بناری تەپۆڵکەی سکۆپوس. چەندین سەرکردەی لاوی عەرەبیش لەوێ بوون. یەکیان گوتی: "ئەگەر ئیگلیزەکان رێگەچارەیەك بە قازانجی سەهیۆنیستان لێرە بێننە گۆڕێ، عەرەبەکانیش روو دەکەنە رووسیا." هەروەها گوتی: "داوای رزگاری لە سۆڤیەت بەو مانایەیە لە کۆلکە بڕەویەوە و بەسەر بەرازدا بکەوی یان لە ترسی خنکان بچییە هەناوی نەهەنگەوە."

لەگەڵ ئەوەشدا، کەم نین ئەو عەرەبانەی کە لەگەڵ مۆسکۆ سەر و ساختیان هەیە و مەرایی دەکەن. لێرەشدا، لۆژیك هەمان لۆژیکی پێشووە: عەرەب دوژمنی ئینگلیزن؛ رووسیا حەز دەکا ئینگلیزەکان ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست جێ بهێڵن، کەواتە هەندێ عەرەب رووسیا بە دۆستی خۆیان دەزانن.

ئەگەر بارودۆخ نالەبار بێ، حەز دەکەیت گۆڕان رووبدات، هەرچەند دڵنیا نەبی کە ئەم گۆڕانە لە چ قوماشێکە و چ شتێکت لە باتی ئەوەی ئێستا هەیە بەدیاری بۆ دێنێ. مرۆڤی ناڕازی یان ئازار چەشتوو، دڵخۆشی و بەختەوەری لە شتێکدا دەبینێ کە بانگەشەی پێچەوانەی دۆخی ئێستای بکا.

تۆوی پڕوپاگەندەی کۆمۆنیستی، زیاتر لە زەوییەکدا شین دەبێ کە بە بێبەشی و سەرکوتی درێژخایەن ئاوس بووە. سیستەمی سۆڤیەت وەکو سیستەمێکی یۆتۆپیایی



دەناسێنرێ و دەخرێتە روو، چونکە مڵکدارێتی گەورە و سەرمایەداریی تایبەتی تێکەوەپێچاون و خاوەندارێتیی حکوومەتی لە جێگەی پلاندانانی ئابووری داناوە. وەرزێڕی **پشك کاری** چینی بە بیستنی **چیرۆکی بەهەشت** کە دەڵاڵ و ئاغای وەدرنان (واتە وڵاتی شیر و هەنگوین(٤٥)) واقی وڕ دەمێنێ" ئیدی لە ستانداردی ژیانی خەڵکی سۆڤیەت ناپرسێ و کاریشی بە ئازادیی رۆژنامەگەری و کتێب نییە.

جگە لەوە، رووسیا لە بەر چاوی ئاسیایی و ئەفریقاییەکان وەك قارەمان و رزگارکەری کۆلۆنییە کۆتکراوەکان وێنا دەکرێ. بەڵام ناکرێ چاو لەم راستییە بنووقێنن کە رووسیا ئێستا خۆی نەتەوە بێگانەکان کۆت و زنجیر دەکا. مەنچووریی چین بە تاڵان دەبا. بە دەست بە سەراگرتنی بەندەری پورت ئارتور وەك پێگەیەکی دەریایی و بەندەری دایرن وەکو بەندەری ژێر کۆنترۆڵی رێژەیی خۆی، دەگەڕێتەوە سەر سیاسەتی کۆنی تزاری. کاتێ کە لەشکری سوور لە خاکی ئێران، بە ستاندنی ئیمتیازی نەوت لە حکوومەتی ئێران گەڕایەوە سەر خووخدەی تزاری. کاتێ کە داوای کرد بە هاوبەشی کۆنترۆڵی گەرووی داردانێلی تورکیا بکا، گەڕایەوە سەر سیاسەتی تزاری.

ئەم هەواڵانە تازەن و کەڕەناکانی پڕوپاگەندە بە پەلە بەسەریاندا باز دەدەن. بەڵام لە جیاتی ئەو راستی و شایەدانە، لە سەر باس و گفتوگۆی ویشینسکی لەگەڵ وەزیری دەرەوەی ئینگلیز، *ئێرنست بوین*، پێدادەگرێ کە رووس لەودا وەك دۆستی ئەندەنووسییان دەرکەوتوون. چاوەکان لەسەر دەنگی وەزیری دەرەوەی سۆڤیەت،

(٤٥) چیرۆکی وڵاتی شیر و هەنگوین لە هەموو سەدەکاندا، حیکایەتێکی دوور و درێژە کە تەنانەت گەنجێکی رەشۆکی خەڵکی سەرخەس (شارێکی باکووری ئێران) لە سەردەمی ئاویلکەدانی کۆتایی سۆڤیەتدا (لە هەشتاکاندا) وەها سەرسام دەکا کاتێ چاو لە ئاسۆی باکووری وڵات دەبڕێ، ئاخ و داخ هەڵدەکێشێ " ئەم وڵاتە لە زەین و گیانی هەموو ئەو یۆتۆپیاخوازانەی کە ساویلکەش بن نەخشی هەڵکەندووە و هەڵدەکەنێ.

مۆلۆتۆف، به بڕیارنامەی هیندیی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بە دژی گتۆ[٤٦] ڕەشەکان لە ئەفریقای باشوور مۆلەق دەوەستن کە دەیەوێ قولەڕەشەکان لەوێدا بەند بکا.

حەشیمەتە ملیۆنییەکانی ڕۆژهەڵات، ڕەوشەکە لە سادەترین و کاڵترین شێوەی خۆیدا دەبینن: ئەوان دەیانەوێ لە دەست ئیمپریالیستی بێگانە ڕزگار بن. ئیمپریالیستی بێگانەش بریتین لە بەریتانیای مەزن، فەڕەنسا، هۆڵەندا و پورتوگال. ئەمریکا پشتگیری لە بەریتانیا دەکا. رووسیا دژی ئیمپریالیستانە. کەواتە خەڵکی کۆلۆنییەکان، روسیا بە دۆستی خۆیان دەزانن.

مرۆڤی سەیرکەر، لە ئاسیا، لافاوێك لە هەستی دژە سپی و دژە ڕۆژئاوایی دەبینێ. ئەم جۆرە دوژمنایەتیکردنەی بێگانە، دزێو و دڕندانەیە. بەشێکە لە ڕۆچوونی مرۆڤی نوێ بۆ زەلکاوێك کە هاتنەوە دەر لێی گەلێ زەحمەتە. وەکو نەفرەتی نیژادیی نازییەکان و جیاوازیی دانان و دەمارگرژیی ڕەنگپەرستانەی دڕندەکانی گرووپی **باڵادەستی سپی** لە ویلایەتە یەکگرتووەکان. ئەم تەرزە ڕوانینە لە حاند ڕێنماییەکانی گاندی توندوتیژی دەخاتە ڕوو و لە ڕاستیدا مەترسیدارترین نەخۆشیی ئەم سەردەمە ترسناکەیە.

لە هیند لەگەڵ *چاکراوارتی ڕاجا گوپالا چاریار*، ئەندامی کابینەی دوڵەتی هیند، کۆنە هاوڕێی گاندی و یەك لە کۆنە سەرکردەکانی جووڵانەوەی نەتەوەخوازیی هیند دەدوام، دەیگوت: "ئەمریکا لە کاتی شەڕ لەگەڵ ئەڵمانیادا، بۆمبی ئەتۆمی هەبوو. بەڵام بەسەر ئەڵمانەکانیدا بەرنەدایەوە، چونکە سپین، بەڵام لە ژاپۆنییەکانی دا چونکە ڕنگین پێستن." هیچ شتێك نەیدەتوانی قەناعەتی پێ بێنێ. من هەر ئەو بۆچوونەم چەندین جار لە ئاسیا بیستبوو. ئەم شتە وا نییە. ویلایەتە یەکگرتووەکان تا بەر لە شکستی هیتلەر نەببووە خاوەنی بۆمبی ئەتۆم. پێداگریی ڕاجا گوپالا چاریار بێ بنەما

---

(٤٦) گتۆ: جوولەکەی گەڕەکی جوولەکان. بە شێوەیەکی گشتی گەڕەکی نەتەوە، ڕەچەڵەك یان ئاینێکی دەورەدراو و کۆنترۆڵکراو، وەکو گەڕەکی ئەرمەنییەکان، جووەکان، قولەڕەشەکان، هیندییەکان و ... تاد.



بوو، بەڵام لە سەر ئەو زانیارییەوە وەستابوو کە مرۆڤی سپی، مرۆڤی ڕەنگین پێست دەچەوسێننەوە.

لە دوو ملیار حەشیمەتی دنیا دەوری ملیارێك و سێسەد ملیۆن ڕەنگین پێستن. چوارسەد و پەنجا ملیۆن لە چین، چوارسەد ملیۆن لە هیند، ژاپۆن، هیندوچین، ئەندەنوسیا، مالایا، برمە، ئەفریقیا و هیتر، ڕەنگین پێستن. هیچ شتێکی هاوبەش بە یەکەوەیان نابەستێتەوە“ بەڵام ڕەنگبێ ڕەنجانیان بە هۆی ڕەنگیانەوە لە هەموو جێگایەك، هەموویان ئازار بدات.

لەتۆپەتکردن (یەکێ لە یەکەمین ئەو پرسیارانەی گاندی لێی کردم ئەوە بوو: ئەمساڵ لە ئەمریکا چەند کەس لەتوپەت کراون) و کۆنەپەرستی و دەمارگرژی بەرامبەر بە قولەڕەشەکان لە ویلایەتە یەکگرتوەکان، سنووورداری لە دژی هیندییەکان لە ئەفریقیای باشوور و ئیمپریالیستی سپی زۆربەی کردوونە دژی ڕۆژئاوا. لێرەدایە کە لە شوێنێکی تر بە دوای ڕێبەرێکی تردا دەگەڕێن. کۆمۆنیستەکان ڕۆڵێکی گرنگیان لە جووڵانەوەی ڕزگاریخوازیی برمە، هیندوچین و ئەندەنوسیا بینیوە. کۆلۆنییەکانی ڕۆژهەڵات بۆ ڕزگاری لە چنگ ئەو ئیمپریالیستانەی کە سەرمایەدارن، تێدەکۆشن. تێکۆشانێك کە وایان لێدەکا بە دژی سەرمایەداری، ڕێنمایی و فێرکاری قەبووڵ بکەن. مرۆڤی کۆلۆنی تەنیا بازرگانە بێگانەکان وەك چەوسێنەرانی خۆی دەتوانێ ببینێ.

ئەمە هەمووی یارمەتیی کۆمۆنیستان دەدات. بڵاوکراوەی کۆنەپارێزی *هراڵد تریبون* دەنووسێ: "نەیاری سوورەکان، ئەگەر زۆرترین هەوڵی خۆیان بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو نەهامەتییانە خستبایە گەڕ کە کۆمۆنیستەکان لەسەریان دەژین، زۆر کەمتر دڵەڕاوکێیان دەبوو، بە تایبەتی لە ئاسیا."

ئاسیا نان و سەربەخۆیی دەوێ. ئەورووپای هەلا هەلا و لە گرێژەنەچووی نائارام و هەژار هەروەتر بە شوێن ڕێگای ئاوەندانکردنەوە و مانەوەوەیە. رووسیاش بە وەڵامێکی ئامادەوە خۆی لە بۆسە ناوە.

سەرهەنگ *تول پانۆف* رابیتی باڵای سۆڤیەت لەگەڵ بێگانان لە ئەڵمانیا، بە سەرکردەیەکی سیاسیی ئەڵمانی دەگوت: "ئێوە و هەموو ئەڵمانەکان دەبێ لە نێوان ئەمریکا و رووسیادا، یەکیان هەڵبژێرن. ئەمریکا دەوڵەمەندە و شتی زۆری بۆ بەخشین هەن. بەڵام لە کزیدانی ئابووری لە ویلایەتە یەکگرتووەکان وردە وردە خەریکە سەرهەڵدەدا و ئێوەش لەگەڵ خۆیدا تووشی چارەڕەشی دەکات. ئەگەر خۆتان لە کلکی ئەمریکا بخەن، ئێوەش لەگەڵ خۆیدا نوقم دەکات. هەروەك شکستی ئابووریی دوای قەیرانی **واڵ ستریت** لە ساڵی ١٩٢٩دا، گەلێ لە نەتەوەکانی ئەوروپای بە شێوەیەکی ناخۆش خستە ژێر کاریگەرییەوە. رووسیا بە قەد ئەمریکا پارەدار نییە، بەڵام ئابووریی ئێمە سەقامگیرە:"

سەرکردە ئەڵمانییەکە قەناعەتی پێنەهات چونکە دڵنیا نەبوو کە ئابووریی رووسیا سەقامگیرە یان ئەوە کە لەکزیدانی ئابووریی ئەمریکا نزیکە. ئەو بەشی خۆی بە دەست دیکتاتۆرییەوە ئازاری چەشتبوو. بەڵام رووسەکان دیسانەوەش هەوڵی خۆیان دەدەن، ئەوان دەزانن ئەوروپا لە حەسرەتی سەقامگیریدا پەلەقاژەیەتی.

کۆمۆنیستەکان دەڵێن رووسیا دەیەوێ لە ئەوروپا بمێنێتەوە" ئەمریکا لەوانەیە بڕوات. بەم پێیە هەندێ لە ئەوروپییەکان لەوە دوودڵن کە بە راشکاوی هەستی ئیجابی خۆیان بەرامبەر بە ئەمریکا دەربڕن و خۆیان بە وەفادار و پابەند بەرامبەری نیشان بدەن، ئەوان تێگەیشتوون ئەگەر ئەمریکییەکان بکشێنەوە لەوانەیە دۆخەکە ئاوەژوو بێتەوە و فایلەکەیان لای رووسیا رەش و تاریك بێ.

ئەوەی رووسیەك لە ئەڵمانیا دەیڵێ لە زۆر شوێنی سەرانسەری دنیادا دەبیسترێ. لە نێو ئەو زایەڵانەدا، رۆژنامەی *تاکونگ پائو* لە شاری *تی ین تسینی* چین لە ٣ی ئاوریلی ١٩٤٧دا بە پێی راپۆرتی *بنیامین وەهـ لێهس* لە نیویۆرك تایمز دا، پێشبینی ئەوەی کردووە کە"لە ماوەی١٠ ساڵدا ویلایەتە یەکگرتووەکان لەگەڵ لە کزیدانێکی گەورەتری ئابووری بە بەراورد لەگەڵ ١٩٢٩ بەرەورووو دەبێ." رۆژنامەکە پێشبینی دەکا کە ئەگەر ئەمە روو بدا، "ئەمریکا لەوانەیە رێکخراوی نەتەوەکان جێ بهێڵێ، دەست لە



رۆژهەڵاتی ناڤین بەربدا و ئاسیا چۆڵ بکا." هەر ئەم وتارەی رۆژنامەکە رەخنە لە ئیمپریالیزمی ئەمریکا دەگرێ.

ئەم دۆخە لەگەڵ پلانی سۆڤیەت بۆ ئاڵۆزکردن و سەرلێشیواندنی دنیا لەمەڕ داهاتووی ئەمریکا تەواو یەك دەگرێتەوە. لەوناوەدا ئەمە رووسیایە کە لە پێشەوە رکێف دەکوتێ.

دراوسێتیی ئەوروپا و ئاسیا و پەلاماردەرێتیەکەی، بەشێکن لە تواناکانی ئەو. بۆنموونە مۆسکۆ داوای لە تورکیا کرد دوو ستانی خۆی و هەروەها جەوازی بەشداریکردنی رژێمی بۆلشەڤیك لە پاراستنی گەرووی داردانێلی بداتێ، کە لە راستیدا بە مانای ژێردەستەبوونی تورکیا بوون. بەڵام رووسیا لە کردەوەدا هیچی نەکرد، بەڵکو تەنیا بە هێنانە گۆڕی ئەم داوایانە سێبەری خۆی خستە سەر سەرانسەری تورکیا. تورکەکان کە وشیار ببوونەوە، بەشی هەرە زۆری هێزی مرۆیی خۆیان کۆکردەوە و سوپای خۆیان لە حاڵی ئامادەباشی جەنگیدا راگرت، تا ئەو جێگایەی کە بە نرخی شکستهێنانی ئابووریی نیشتمانییان تەواو بوو( هیتلەریش کارێکی وای لەگەڵ نەمسا، چێکوسلۆڤاکی و فەرەنسا کرد. ئەو بەر لەوەی سەربازەکانی پەلاماری ئەو وڵاتە بدەن، بە دەستپێکردنی شەڕێکی دەروونی زراوی بردن.) کۆمۆنیستەکان کە بەو سەرکەوتنە بێخەرجەی خۆیان هەستیان بە بەخۆنازین دەکرد، دەستیان بە پڕۆپاگەندە کرد. هاواریان لێهەستا کە" تورکیا نادیموکراتییە، تورك ئەرمەنییان قەتڵوعام کردوون. تورك تا نەیاندی کە شەڕی دووەم رووەو کۆتاییە خۆیان لێنەدا."

ئەم وتانە هەموو راستن. خەڵکی رەشۆکی ئێجگار ساویلکەی ئەمریکا، سەریان بە مانای خەفەت و ناچاری رادەوەشێنن و قەبووڵ دەکەن کە تورکیا موستەحەقی یارمەتیدان نییە و ئەمە راست ئەو ئاکامەیە کە کۆمۆنیست دەیانەوێ.

لەکاتی دامەزرانی تورکیای نوێدا بە سەرۆکایەتی کەماڵ پاشا ( ئەتاتورك) لە ساڵی ١٩١٩ تا ئەم دواییە تورکیا رژێمێکی تاك حیزبی بووە. لەو دواییەدا ئیزن بە حیزبێکی تر دراوە وەکو ئۆپۆزیسیۆنی سنووردار کار بکا... هەر لەم ماوەیەی تاك حیزبی بوونی

توركیادا، پەیوەندیی رووسیای سۆڤیەت لەگەڵ ئەم وڵاتە، لە رادەبەدەر دۆستانە بووە. یارمەتییەکانی رووسیا، تورکیای لە شەڕی ئەنەدۆڵ لە ساڵانی ۱۹۲۱ و ۱۹۲۲، لە دەست یونان و بەریتانیا رزگار کرد. لە کۆنفرانسە نێودەوڵەتییەکان( بۆوێنە لۆزان – ی سویسرا، لە **۱۹۲۳**دا) رووسیا پشتگیری لە بەرژەوەندییەکانی تورکیا کرد. بەرژەوەندیی تورکیایەکی تاك حیزبی کە لەودا، چالاکیی کۆمۆنیستان نایاسایی بوو و بە توندوتیژی رەفتاریان لەگەڵ دەکردن. بەڵام ئێستا لەناکاو کرملین بۆی دەرکەوتووە کە تورکیا دیموکراتی نییە! چ شتێك گۆڕاوە؟ ئەمە، رووسیایە کە گۆڕاوە. رووسیا لە سەر ئەوە سوور بوو کە تورکیا مل بۆ داواکانی بدات. تورکەکان نەیانکرد. رووسیا لە پڕێکدا کەشفی کرد کە تورکیا دیموکراتی نییە. کۆمۆنیستەکان جێبەجێ تێگەیشتن کە ئەرمەنییەکانی تورکیا دەبێ بگوازرێنەوە یەکێتی سۆڤیەت.

لە **۲٤**ی مارسی **۱۹٤۷**، وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لە واشنتۆن بەندێکی رێککەوتنە سێقۆڵییە نهێنیەکەی کۆنفرانسی **(تاران)**ی لە دیسەمبەری **۱۹٤۳**دا بڵاو کردەوە. بە پێی دەقی ئەو رێککەوتنە، رۆزڤێلت، چەرچیل و ستالین بڕیاریان دابوو کە "زۆر باش دەبێ کە تورکیا بەر لە کۆتایی جەنگ لە بەرژەوەندی هێزە هاوپەیمانەکان بێتە ناو شەڕەکەوە." ئەوان ئەم تورکیا نادیموکراتییەیان لە بەرەکەی خۆیاندا وەرگرت. سوودیشیان لەو وتانەی مارشال ستالین وەرگرت کە دەیگوت "ئەگەر تورکیا خۆی لە شەڕ لەگەڵ ئەڵمانیادا ببینێتەوە و بەو هۆیە، بولگاریا بە دژی تورکیا شەڕ رابگەیەنێ یان پەلاماری بدات، سۆڤیەت بە پەلە هێرش دەکاتە سەر بولگاریا." ستالین تورکیای نادیموکراتی رزگار دەکرد.

تورکیا ئەو کات نەچووە ناو جەنگەکەوە. بەڵام زۆر درەنگتر چوو. رووس و کۆمۆنیستەکان لە دژی تورکیا، توند بەو خاڵەوە نووسان. بەڵام بولگاریا هەرگیز نەچووە پاڵ هاوپەیمانانەوە. لە راستیدا بولگاریا ماوەیەکی زۆر لە سەنگەری هیتلەردا شەڕی کرد و رووسیا ناچار بوو بە دژی بولگاریا شەڕ رابگەیەنێ و پەلاماری بدات، لەگەڵ ئەوەشدا ساڵی **۱۹٤٦**، داوای لە کۆنفرانسی ئاشتیی پاریس کرد کە بولگاریا –



ی دوژمنەکەی پێشووی – ئیزن بدرێ کە خاکی یونان کە بەرپەرچی پەلاماری ئەڵمانیا و ئیتالیای دابۆوە، بخاتەوە سەر خاکی خۆی. بۆ؟ چونکە بولگاریا داردەستی رووسیایە.

ئەمە نموونەیەکی ئاشکرایە لە بەرەڵڵایی ئەخلاقیی دیپلۆماسیی رووسیا و هەڵوێستی کۆمۆنیستی کە ئینکەبەرایەتیی دیموکراسییەکان دەکا. ئامانجە نەتەوەییەکانی رووسیا بەر لە هەموو پێوەرێك دێنە پێشەوە. هێڵی رەفتاری مۆسکۆ بەرامبەر هەر وڵاتێ، هیچ پەیوەندییەکی بە ماهیەتی سیاسیی وڵاتەکەوە نییە.

ستالین پەیمانی لەگەڵ هیتلەر و داگیرکەرانی ژاپۆن بەست و پەیمانی دۆستایەتی لەگەڵ دیکتاتۆری ئەرژەنتین (خوان پرون) مۆر کرد. ئایدیۆلۆژیا و سیاسەتی رووسی لە خزمەتی هەڵخەتاندنی خەڵکی تر و دروستکردنی وەهم بووە. ئەمانە دەبوایە بۆ خەڵك بە تەواوی روون بن، بەڵام راستییەکە بە شێوەیەکی ترە.

ناپاکیی ستالین و بێ ویژدانیی کۆمۆنیستی، یارمەتیی رووسیای داوە کە گەلێ سەرکەوتن بەدەست بێنێ. حکوومەتی سۆڤیەت نایەوێ دنیا یان تەنانەت قارەیەکیش بە زەبری چەك داگیر بکا. ئەم کارە دەشێ دژوار و گێلانە بێ. کۆمۆنیست لەوە دڵنیان کە بە کەمێك گەمە لەلایەن مۆسکۆوە بۆ پەرەپێدانی پاشاگەردانییەکە و قۆستنەوەی نائومێدیی گەلانی وڵاتە دیموکراتییەکان، خەڵکەکە خۆی، دنیای غەیرە سۆڤیەت وێران دەکا. دیموکراسییەکان تائێستا بەرەو ئەو ئامانجە، تارادەیەك یارمەتیی کۆمۆنیستانیان داوە.

لە ئەنجامی پەیمانی ستالین – هیتلەر، رووسیا نیوەی خاکی پۆلۆنیا تا هێڵی کرزان، ئەستۆنیا، لاتڤیا، لیتوانیا و بەشێك لە رۆمانیای خستەوە سەر خاکی خۆی. لە ئاکامی پەلاماردانی فینلەند، بەشێك لە خاکی ئەو وڵاتەشی داگیر کرد. بە هۆی توانای سەربازی و دیپلۆماسی پڕ جموجوڵی ستالین و هەڵبەت لە سایەی هەڵەی گەورە سیاسییەکانی رۆژئاوا؛ روسیا چەند بەشێك لە خاکی ئەڵمانیا، پۆلۆنیا، چێکوسلۆڤاکیا و ژاپۆنی خستەوە سەر خاکی خۆی. سەرجەم دەوری **٥۲۰** هەزار کیلۆمەتری چوار گۆشە بە **۲٥** ملیۆن حەشیمەتەوە.

گشت ئەوانە، پێشێلکردنی بڕیارنامەی ئەتلانتیکن. زۆربەی ئەو کردەوانە پێشێلکردنی ئەو پەیمانانەن کە مۆسکۆ لەگەڵ وڵاتان بەستوونی. ناوچەکانی ئەڵمانیا و چێکوسلۆڤاکی و دەوڵەمەندترین بەشی پۆڵۆنیا(گالی سیای ڕۆژهەڵات) هەرگیز هی ڕووسیا نەبوونە. زۆربەی ئەو ناوچانەی پێشتر هی ڕووسیا بوون لەلایەن تزارەکانەوە دەستیان بەسەردا گیرایەوە و ڕووسیا لەو بارەوە قەرزی لەسەر کەس نەبووە تا بێت و داوای بکاتەوە. لێنین لە ناملیکەی *شەڕ و شۆڕش*دا کە مانگی مەی ١٩١٧ لە پترۆگراد بلاوکرایەوە، جیاکردنەوەی کورلەند، بەشێك لە ڤاتڤیا و پۆڵۆنیای لە لایەن ڕووسیا، ئەڵمانیا و نەمسا- هەنگاریا وە مەحکووم کرد. ئەو دەیگوت: "سێ ڕێگری تاجدار کورلەند و پۆڵۆنیایان جیا کردەوە. ئەوان سەد ساڵ ئەو دوو بەشەیان داگیر کرد. ئەوان جەستەی زیندووی ئەو دوو ناوچەیان هەڵدڕی و لەو نێوەدا جەردەی ڕووسی لە هەموان زیاتر هەڵیدڕین، چونکە ئەوکات لە هەموویان بەهێزتر، ڕووسەکان بوون." لێنین ئەو وڵاتخۆرانەی بە جینایەتکار دەزانی و بەم پێیە هەر لە سەرەتای شۆڕشدا، ئەو ناوچانەی گێڕانەوە دەست خاوەنیان. ئەو بە ئاشکرا دەیگوت پۆڵۆنییەکان نایانەوێ لەلایەن ستەمکارانی ڕووسیای جارانەوە تالآن بکرێن.

کەچی ئێستا ستالین، ستەمکاری ڕووسیای نوێ، جارێکی دیکە وڵاتی لێ داگیر کردوون.

ئەگەر بڕیار بوایە گەلان ئەوی سەردەمێك هی ئەوان بووە، دەست بکەن بە ستاندنەوەی، ئینگلیز دەبێ بەشێك لە فەڕەنسا، سوێد دەبوایە لێنینگراد بستێنێتەوە، تورکیا دەبوایە بەشی هەرە زۆری ئۆکراینی سۆڤیەتی بستاندبایەوە، ئینگلیز نیویۆرك، هۆڵەندییەکان نیویۆرك یان ستاندبایەوە، فەڕەنسا لویزیانای بستاندبایەوە، ئیسپانیا کالیفۆرنیای ستاندبایەوە، ئەڵمانیا ئالزاس و لۆرن - ی ستاندبایەوە و دنیا دەبووە شێتخانەیەکی لەوەی کە ئێستا هەیە خراپتر. ئەم داگیرکەرییانە بەر لە هەموو شت دڕندانە و نایاسایی بوون. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، هی *ئەوان* بە چ مانایەکە؟ ئایا پۆڵۆنیا هی ڕووسیا بوو؟ ئاخۆ چێکوسلۆڤاکی هی هیتلەر بوو؟ ئایا هیند هیچ کات



هی ئینگلیز بووە، یان نادادپەروەرانە و بە زۆر داگیرکرا؟ ئەوە کە دەبینین کەسانی بەڕێز ئیجازە بە خۆیان دەدەن وشەی هی بەکار بێنن، یەك لە نیشانەکانی داڕمانی ئەخلاقی ئێمەیە. ئەوە هەمان ئەو زمانەیە کە سەردەمێك بەگ و ئاغا خاوەن زەویوزارەکان، لەگەڵ سرفەکانی خۆیان پێی دەدوان. وەرزێڕەکان *ڕۆحی* ئەو بوون و هی ئەو بوون. ئێستا ئێمە پێمان زیاتر لێ هەڵبڕیوە ( یان بۆ پاشەوە گەڕاوینەوە؟) و دەڵێین: گشت خەڵك هی ئەو کەسانەن کە توانای سەرکوتکردنیان هەیە."

جگە لەو ناوچانەی کە بە ڕاشکاویی داگیرکران، حکوومەتی سۆڤیەت، دوای جەنگ، چەند بەشێکی کۆریا، ئەڵمانیا و نەمسای بەپێی ڕێککەوتنێك لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکان و بەریتانیای مەزن خستنەوە سەر خاکی خۆی و هەندێ وڵاتی دیکەی وەك فینلەند، پۆڵۆنیا، ڕۆمانیا و هەروەها چێکوسلۆڤاکی، بولگاریا، یۆگسلافیا، ئەلبانیا و چەند بەشێکی مەنچووری خستنە ژێر کۆنترۆڵی خۆی. ئەم وڵاتانە بە حەشیمەتی دەوری سەدو پەنجا ملیۆن کەسەوە، دنیای نفووزی سۆڤیەت و ئیمپراتۆریەتی نوێی سۆڤیەت پێکدەهێنن.

ئیمپریالیزمی سۆڤیەت ئاکامی دژایەتیخوازیی سیستەمە دیموکراتییەکان لەگەڵ سیستەمی شۆڕایی( سۆڤیەت) یان هەبوونی بۆمبی ئەتۆم لەلایەن ئەمریکاوە نییە. زۆربەی ئەو ناوچانەی ئیمپراتۆیەتی سۆڤیەت لەکاتێکدا داگیرکران کە پەیوەندیی نێوان ڕووسیا و ئینگلیز و ئەمریکا خۆش بوو، لە کاتێکدا ڕووسیا چەندین ملیار دۆلاری وەك یارمەتیی تایبەتی لە هێزەکانی ڕۆژئاوا وەردەگرت و یەکەم بۆمبی ئەتۆم هێشتا نەتەقیبۆوە. بەشی هەرە زۆری ئیمپراتۆریەتی ئێستای سۆڤیەت لە سایەی خۆبەدەوەستەدانی ڕۆحزلانەی ویلایەتە یەکگرتووەکان و ئینگلیز داگیر کرا.

ئیمپریالیزمی سۆڤیەت بەرهەمی زەبروزەنگە. ئەم ئیمپریالیزمە هەیە چونکە ئەڵمانیا، ئیتالیا و ژاپۆن ڕووخان، چونکە ئینگلیز و فەڕەنسا لە ئەنجامی جەنگدا لاواز بوون و، چونکە ئەمریکا نەیتوانیوە بەرامبەری بوەستێتەوە یان هەر لە بنەڕەتدا حەزی لە کارێکی لەو جۆرە نەبووە.

ئیمپریالیزمی سۆڤیەت، بەرهەمی ناڕاستەوخۆی نەتەوەخوازیی رووسی و ئۆکراینی و حەزی سۆڤیەت لە نۆژەنکردنەوە و ساڕێژکردنەوەی برینەکانی رووسیای شەڕلێدراو بە کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوە و ئیمکانیاتە خۆڕایی و کەم خەرجەکانی میللەتە داگیرکراوەکانە.

لێکچوونی پڕئازاری فراوانخوازیی هیتلەر و ستالین لێرەدا بەرچاو دەکەوێ: هەردووکیان لەلایەن ئەو دیموکراسیانەوە یارمەتی دران کە لە هەموو کەس زیاتر لە لایەن ئەوانەوە هەڕەشەیان لەسەر بوو. هەردووکیان خەڵکیان فێر کرد رقیان لە دیموکراسی بێتەوە. لە دیدی مۆسکۆ و بەرلینەوە، هانەیەکی خۆکوژانە، دیموکراسی دەخاتە سەر پێ. بەڵام هیتلەر و ژاپۆنییەکان بە هەڵە وایان بیر دەکردەوە کە تا بخوازن دەتوانن بۆ پێشەوە بڕۆن.

ئیمپریالیزم خێرایی و توندوتیژی و وەزیەکی هەیە کە تایبەت بە خۆیەتی. هەر بەم هۆیەوە کە هەموو جۆرەکانی ئیمپریالیزم و پاوانخوازی خراپن، چ لە جۆری رووسییەکەی بێ، چ ئینگلیزی و چ ئەمریکاییەکەی. ئیمپریالیزم قەت چاوی پڕ نابێ. بەڵکو هێندەی پێ لێ هەڵدەبڕێ کە ئیمپریالیزم لە خەڵکانی تریشدا پەروەردە دەکا و ئینجا پەروەردەکراوەکان، راست وەك منداڵی قوتابخانە، لە بارەی ئەوەوە کە کێ یەکەم جار فڵان کارەی دەست پێکردووە مل لە مشتومڕ دەنێن.

هیتلەر لە دەرەوەی ئەڵمانیا، بە هۆی چەك و سیخوڕەوە و بە هۆی ژمارەیەك لە ئەڵمانییەکانی دەرەوەی وڵات کە زیاتر ئەمەگداری نازیی بوون نەك نیشتمانەکەیان، بە هاوکاریی کۆمەڵێك کۆنەپەرستی تایبەتی، بە هێورکردنەوە و رازی کردنی دیموکراتەکان و لە سایەی سەری فەشەلی ئابووری و سیاسی و ئەخلاقیی نێو دیموکراسییەکان، بە دەسەڵات گەیشت.

جەنگی دووەمی جیهانی ئەم نوشستەی پەرە پێدا و ئەمە یارمەتیی ستالینی دا لە دەرەوەی رووسیا دەسەڵات پەیدا بکا. حاڵی حازریش ئەم کارەی هێندە بۆ ئاسان بۆتەوە کە بە یارمەتیی هەڵەی بە لێشاوی نەیارانی، هان دەدرێ درێژە بە پێشڕەوی بدات.



مەترسیی دەسەڵات لە چوارچێوەی بەندەکانی پەیمانی ئەتلانتیکدا دەرکەوت. هەموو هێزی دوژمنکاران لەگەڵ هێزەکانی میحوەر، ئەم پەیمانەیان مۆر کرد و بەم جۆرە خۆیان بەوە پابەند کرد کە" بە شوێن دەسەڵاتخوازی، داگیرکردنی خاك یا شتی لەم بابەتەوە نەبن." ئەزموونی جیهانی دەریخستووە کە دەسەڵاتخوازی، شەڕی لێدەکەوێتەوە. ئینگلیز و ئەمریکا تەنیا بە یەك هۆی گەورە، خۆیان خستە ناو جەنگەوە: رێگەگرتن لە زاڵبوونی میللەتێك بەسەر نەتەوەکانی تری ئەوروپادا. هیتلەر وەك یەك لە گەورەکانی ئەوروپا لەگەڵ ژاپۆنییەکان - کە ئەوانیش گەورەی ئاسیا بوون - یەکی گرتبوو، دەکرا مەترسییەکی کوشندە بۆ ئەمریکا و ئینگلیز دروست بکا. هێزەکانی رۆژئاوا چوونە ناو شەڕەکەوە تا رێگە لەو رووداوە بگرن. ئەگەر رووسیا هەڕەشە لە ئەوروپا و دواجار لە ئاسیاش بکا کە بە سەریدا زاڵ دەبێ، ئەگەری جەنگی سێهەم، بە شێوەیەکی بەرچاو زیاتر و نیزێکتر دەبێ.

سەرۆك کۆماری ئەمریکا *ترۆمن*، لە مەکزیکۆسیتی گوتی: ئێمە نەسلێکین دوو جەنگی جیهانیمان بینی. تێگەیشتین کە لە شەڕی هەمەلایەنەدا، لایەنی سەرکەوتوو بە هەمان رادەی لایەنی تێشکاو زیان دەبینێ. ستالینیش ئەم وانەیە فێر بووە. ئەوەی بە لەناوچوونی رووسیا و کوژران و کەمئەندامبوونی چەندین ملیۆن کەس (بە پێی ئاماران ١٥ ملیۆن کەس) لە جەنگی دووەمی جیهانیدا بۆ دەرکەوت. شەڕی سێهەم خراپتر دەبێ. جا گرنگ نییە کێ دەباتەوە و کێ دەدۆڕێ. من بڕوام بەوە نییە ستالین خوازیاری شۆڕشێکی جیهانی بێ. هیچ کەس ناوێرێ بڵێ: "من بە چەك و بۆمبەکانم دنیا داگیر دەکەم." بەڵام ستالین هەمیشە تامەزرۆی دەسەڵاتی زیاترە. بەم جۆرە بە باشی هەلی پەرەپێدانی دەسەڵات دەقۆزێتەوە و چەندین و چەند جار ئەو هەلانە دەڕەخسێنێ. ئەگەر ئەو هەولانە ببنە هۆی هەژاری و قوڕبەسەری و برسێتیی پڕایی میللەتانی تر، بۆی گرنگ نییە. ئەو گوتوویەتی ئابووریی کۆمۆنیستی باشترین جۆری ئابوورییە. دڵنیایە کە سەرمایەداری دەبێ لەناو بچێ، لەوە دڵنیایە کە سیستەمەکەی ئەو دنیا دادەگرێ، دڵنیایە کە پێغەمبەرێکە لە لای مارکسەوە هاتووە بۆ ئەوەی ئەم گۆڕانکارییە وەدی

بهێنێ. ئەو هەموو ڕووداوەکانی ئێستا بە سەکۆی وەڕێکەوتنی سەرکەوتنی داهاتووی کۆمۆنیستی دەزانێ. هێڵی کردەوەی سۆڤیەت و هەڵسوکەوتی کۆمۆنیستەکانی دەرەوە، نیشانەی ئەوەیە کە مۆسکۆ سەردەمی بێزاری و دڵساردکەرەوە و نائومێدکردن و ناخۆش بە باشترین دەرفەت بۆ لاواز کردن و لەناو بردنی دنیای دیموکراسی دەزانێ، بە تایبەت – چونکە ڕاگەیاندنی سۆڤیەت هەرگیز لە دووپاتکردنەوەی ئەو خاڵە وەڕەز نابێ – لە کاتێکەوە کە قۆناغێکی لەکزیدانی سەرمایەداری نزیك بۆتەوە.

ستالین بە ئامرازی کەمەوە، چاوەڕوانی گەیشتن بە ئامانجی زۆر گەورەیە. گەورەترین ئیلهامبەخشی وی دەبەنگیی دوژمنەکانیەتی کە تێی ناگەن. ستالین هیوادارە کە لە ڕێگەی گەندەڵی و لەناوچوون و لادرانی دێموکراسی، دەسەڵاتێکی زیاتر وەدەست بێنێ. هەر ئەمەش دەشێ کوشندەترین هەڵەی ڕووسیا بێ.

داگیرکەرێ ئەگەر دەستخۆشیشی لێ کرابێ مەترسیدارە، چونکە نازانێ کەنگێ و لە کوێ واز لە داگیرکردن بهێنێ. لە جەنگی دووەمی جیهانییەوە بەرەو دوا، ستالین هەنگاو نانی خۆی بەرەو پێشەوە درێژە پێداوە. حکومەتێکی مۆرەی خۆی لە ستانی ئازەربایجانی ئێران دامەزراندووە و لە کاتێکدا کە هێزەکانی ڕووس لە خاکی ئێران بوون، کاربەدەستانی تارانی ناچار کردووە ئیمتیازی نەوتی بدەنێ.

دوای چەند مانگ حکوومەتە وابەستەکە ڕووخا، چونکە حکومەتیی ئێران بە دەست لە پیشتدانی ئەمریکا هێرشی کردە سەر ئەو ستانە. خەڵك پێشوازییان لە سەربازەکان کرد و پیاوانی حکوومەتی سەر بە ڕووسیش ڕایانکردە یەکێتی سۆڤیەت. ئەمە تاقە نموونەی پاشەکشەی فراوانخوازیی ڕووسە کە سۆڤیەت ملی بۆ ڕاکیشابێ.

لە ژوئیەی ١٩٤٥ لە پۆتسدام، ستالین بە *ترۆمن* و *ئاتلی* گوت کە حەز دەکا بەشداری لە پاراستنی گەرووی داردانێلی تورکیا بکا. لە لایەکی دیکەوە، ڕووسەکان بە شێوەیەکی ڕەسمی ئەو داوایەیان لە تورکیا کرد. ئەم ئیمتیازە دەیتوانی بە مانای کۆنترۆڵکردنی تورکیا لە لایەن ڕووسیاوە بێ. ئەم داوایە ئێستاش لە سەر جێی خۆیەتی. ڕۆژنامە ڕەسمییەکانی تورکیا ڕایانگەیاندووە کە دوو ستانی قارس و



ئەردەهانی تورکیا دەبێ بدرێنە ڕووسیا. تیتۆ (ستالینە چکۆڵە) کە بە مەدالیاکانیەوە دەڵێی مارشال گۆرینگی هیتلەرە، بە شێوەیەکی ڕەسمی داوای خاوەندارێتی مەقدۆنیای یونان، قەڵەمڕەوی ئیتالیا و چەند بەشێك لە یۆگسلافیا دەکا. هێشتا وازیشی لە *تری یستێی* ئیتالیا نەهێناوە. لە سەرانسەری جیهانی ژێر دەسەڵاتی سۆڤیەتدا، کۆنترۆڵی کۆمۆنیستی ڕۆژ بە ڕۆژ توندوتۆڵتر دەبێ. کۆمۆنیستەکانی هەنگاریا لە سایەی سەری حزووری لەشکری سوور، سەرەڕای ئەوەی لە هەڵبژاردنی ئازاددا شکستیان خوارد، لەم دواییەدا حکوومەتی هەنگاریایان گرتۆتە دەست. لە نەمسا هەموو ئەو دامەزراوە ئابوورییانەی کە نازییەکان لە نەمساوییەکانیان ئەستاندبوون، ڕووسەکان دەستیان بەسەردا گرتوون. بەم جۆرە بەشێکی گەورەی نەمسا بووە بە کۆڵۆنیی ئابووریی ڕووسیا.

تراستە زەبەلاحەکانی ڕووسیا، پیشەسازیی ناوچەی بەردەستی سۆڤیەت لە ئەڵمانیایان دەست بەسەرداگرتوون و ڕەنێویان دێنن. بە جۆرێك کە لەگەڵ ئابووریی سۆڤیەتدا تێکەڵ بوونەوە. سەرەڕای بانگەشەی یەکێتیی ئەڵمانیا، مۆسکۆ بە کردەوە ئەڵمانیای کردۆتە دوو پارچە و داگیرکردنی سەربازیی کردۆتە خاوەندارێتی تاهەتایی. ئێستا ئیدی ئیمپریالیزمی سۆڤیەتە کە بۆ پێشەوە ڕکێف دەکوتێ.

جاران دەگوترا ئیمپریالیزم لە سەر بنەمای هەناردەی سەرمایەیە: وڵاتی پیشەسازی، سەرمایە و کاڵای زیادەی هەیە کە دەیەوێ بینێرێتە دەرەوە. هەر بۆیە ناوچەی وا کە لە ڕووی ئابووری و فەرهەنگی پاشکەوتوون داگیر دەکا و دەیانکاتە موستەعمەرەی خۆی. بەڵام لە کاتی جەنگەوە تا ئێستا، ڕووسیا بە پێچەوانەوە جووڵاوەتەوە: ڕووسیا دەستدرێژی کردۆتە ئەو وڵاتانەی زۆر زۆر پیشەسازین و لە زۆر لایەنەوە، لە ڕووی ئابووری و فەرهەنگیشەوە لە یەکێتی سۆڤیەت پێشکەوتووترن.

بۆلشەڤیکەکان لە ڕێگەی ئامراز و ڕێککەوتنی جۆراوجۆر، بەرهەمی شوێنی ژێر دەسەڵاتی خۆیان هاوردە دەکەنە وڵاتەکەیان تا خۆراك بگەیەننە بازاڕی برسیی خۆیان. ئیمپریالیزمی سۆڤیەت لەسەر بنەمای هاوردەکردنی سەرمایە کار دەکا نەك هەناردەی

سەرمایە و بەرهەمی زیادە! ئەم سیستەمە بەری زێدەیی نییە بەڵکو بەرهەمی کەموکووڕییە و ئاکامە سروشتییەکەشی، چەوساندنەوە و رووتاندنەوەی وڵاتانی ژێر دەسەڵاتی خۆیەتی.

یەکێتی سۆڤیەت لە دەرەوەی ئیمپراتۆریی خۆیدا، هاوکاریی تامەزرۆیانەی حیزبە کۆمۆنیستەکانی لە پشتە، چ ئۆپۆزسیۆنی دەرەوەی حکوومەت بن یان هی ناو حکوومەت. ئەو کۆمۆنیست و لایەنگر و ساویلکە و چاو بەسراوانەی دواشیان دەکەون،" *فیدراسیۆنی جیهانیی سەندیکاکانی کار* (WFTU) یان رێکخستووە. وەزیری دەرەوە مۆلۆتۆف و نوێنەری سۆڤیەت لە رێکخراوی نەتەوەکان، *گرۆمیکۆ* هەوڵیان داوە کە پێکەوە دۆخێکی یاسایی لەبار لە رێکخراوی نەتەوەکان بۆ ئەو فیدراسیۆنە بەدەست بێنن. لە وڵاتانی جۆراوجۆر، بە تایبەتی لە فەرەنسا، فیدراسیۆن کاریگەرییەکی سیاسیی گەورە و گران لە خۆی نیشان دەدا.

بلۆکی سۆڤیەت - سلاڤ - کۆمۆنیستی، هێشتا بە شوێن فراوانخوازییەوەیە. هەروەك فراوانخوازیی ئەڵمانی، ئیتالیایی و ژاپۆنی جەنگی لێکەوتەوە، ئەم روانگەیەش دەشێ بە هەمان شێوە بەشەڕ کۆتایی پێبێ.

یەکەم هۆکار بۆ ئاوات و حەزی رێگەگرتن لە فراوانبوونی نفووز و خاك و سیاسەتی سۆڤیەت رێگەگرتن لە قەومانی جەنگی سێهەمە. ئەگەر رووسیا لەرادەبەدەر زێدەڕۆیی بکا، لەوانەیە گەلانی دی هەڵبەزنەوە و وەزاڵە بێن، هەروەك ئینگلیز لە ساڵی ١٩٣٩دا وەزاڵە هات و بڕیاری جەنگی دا.

لە پشت سەری پێشڕەویی بەگوڕی رووسیاوە، بەستەڵەکی دیکتاتۆری لە پێشڕەویی خۆیدا ئازادی تێکدەشکێنێ. ئەمەیە دووەم هۆکاری دژایەتیکردنی فراوانخوازیی سۆڤیەت. هاوینی ١٩٤٦ کۆمەڵە راپۆرتێك لە رۆژنامەکانی ئەڵمانیادا لە بارەی رفاندنی کوڕیژگەیەکی ئەڵمانی لەلایەن سۆڤیەتییەکانەوە بڵاو کرایەوە. رووس و کۆمۆنیستەکان بە تووڕەییەوە راپۆرتەکانیان بە درۆ خستنەوە. بەڵام پاییزی هەمان ساڵ لە بەرلین روونووسی نامەیەکم بە دەست گەیشت کە راستیی ئەم راپۆرتانەی



دەردەخست. کەسێك بە ناوی *ئۆتو بلوخ ویتز* نامەکەی نوسیبوو و ئیمزای کردبوو کە سەرکردەی حیزبی کۆمۆنیستی یەکیتی سۆسیالیستی لە ویلایەتی ساکسۆنی ژێر دەسەڵاتی سۆڤیەت بوو و بۆ *ئوتو گروت وۆل*، سەرۆکی هەمان حیزب لە بەرلین نووسیبووی. نامەکە هی ٧ی مانگی مەی ١٩٤٦ە و ئاوا دەست پێدەکا:

"ئۆتوی خۆشەویست:

من یەك دوو جاری دیکەش لە بارەی ئەو مەسەلەوە قسەم لەگەڵ کردووی، بەڵام بە هۆی هەلومەرجەکەوە، ناچارم جارێکی دیکە باسی بکەمەوە. لە بەڵگەنامەکانی بەر دەستمدا، دەوری ٤٠ کەس هەن کە لەلایەن NKVD[٤٧]یەوە دەستگیر کراون. زۆربەی ئەم لاوانە ١٥ تا ١٨ ساڵیان تەمەنە کە ساڵی رابردوو دەستگیر کراون."

پاشان نامەکە باسی دوو کەسی تەمەن گەورە دەکا کە لە لایەن رووسەکانەوە بەند کراون. *بوخ ویتز* ئیدیعا دەکا کە هیچ کامیان نازی نەبوونە. روونووسی نامەکەم بردە نووسینگەی حیزبی یەکێتی سۆسیالیستی لە بەشی رووسی بەرلین و نیشانی *ئوتۆ گروت وۆلم* دا کە ئەسڵی نامەکەی بۆ نێردرابوو. گوتی بۆخۆم زۆر لەو هەرزەکارانەم بەرداون.

لەوەڵامدا گوتم: "بەڵام کەسانی جیاواز - چ ئەڵمانی و چ غەیرە ئەڵمانی - کە ناوی قوربانییەکانیان کۆکردوونەتەوە پێیان گوتووم کە هەزاران کەس گیراون."

گروت وول هیچی نەگوت.

رۆژنامەی *دەیلی تەلەگرافی* بەرلین لە ٦ی ئاوریلی ١٩٤٧ نامەیەکی سەرئاوەڵای تێدایە لە لایەن خاتوو *ئانێ دۆرلبێری* سۆسیال دیموکراتی خۆشناوی ئەڵمانی کە نووسیویە: "دایکانی نائۆمێد دێنە لامان، چونکە کوڕە ١٦ ساڵانەکانیان گیراون. سەرەڕای ئەوە کە هەرزەکاران بەخشراون، هەندێ لە دایکان دەوری دوو ساڵە هەروا بە دوای منداڵەکانیاندا سەرگەردانن.

ئەم کوڕانە بە ئاسانی و بێ ئەوەی هیچیان بۆ روون بکرێتەوە لە لایەن پۆلیسی رووسەوە لە شەقام یان تراموادا دەستگیر کراون و بردوویاننە شوێنێکی نادیار. هەروەها

(٤٧) پۆلیسی نهێنیی سۆڤیەت.

دوای کۆتایی شەڕ، چەند شەمەندەفەرێکیان کرێکار و زانای ئەڵمانی بە زۆری لە رووسیا وەدەرناون.

دیکتاتۆری ناتوانێ لەگەڵ خۆی راستگۆ و ئەمەگدار نەبێ. لە بەر ئەوەیە کە هەمان ئەو شێواز و ئەخلاقیاتە لە شوێنی دیش بەکار دێنێ کە لە وڵاتی خۆیدا بەکاریان دەبا.

کۆمۆنیستەکان و هەروەها سۆسیالیست و دیموکراتە مەسیحیەکان، لە سێ ناوچەی رۆژئاوای ئەڵمانیادا هەن. بەڵام لە ناوچەی رووسیادا، سۆسیالیستەکان یان سۆسیال دیموکراتەکان نایاسایین. حیزبە بۆرژوازییەکان ناتوانن لە هەموو بوارێکدا پاڵێوراویان هەبێ. لەو نێوانەدا حیزبی کۆمۆنیستی دەمامکدار، بە ناوی حیزبی یەکگرتووی سۆسیالیستی، یارمەتیی مادیی زۆری لە رووسیا وەرگرت.

لە بەرلین، چونکە ئەم شارە بە شێوەی یەکدەست و لەژێر چاودێریی رێکخراوێکدا بەڕێوە دەبرێ کە راستەوخۆ لە ژێر سەرپەشتیی چوار دەوڵەتی بێگانەی داگیرکەردایە، هەموو حیزبە سیاسییەکان دەتوانن لە هەموو بەشەکانی شاردا چالاکی بکەن. بەڵام سەرەڕای ئەوەی لە هەڵبژاردنی ١٩٤٦دا حیزبی یەکگرتووی سۆسیالیستی دیواری بەشەکانی ئەمریکی و ئینگلیزی و فەڕەنسیی شارەکەی بە پۆستەر و وێنەکانی خۆی داپۆشین، سۆسیال دیموکراتەکان ئیزن نەدران پۆستەری هەندێ لە پاڵێوراوەکانی خۆیان لە بەشی رووسیادا بڵاو بکەنەوە. دوو نموونە لەو پۆستەرە قەدەغە کراوانە نووسیبوویان: "**لە شوێنێکدا کە ترس هەیە، ئازادی نییە. بەبێ ئازادی سۆسیالیزم بوونی نییە و بە بێ ئازادییە مەدەنییەکان، سۆسیالیزم وەدی نایە.**" لەوانەیە رووسەکان ئەم راستییە سادە و ساکارانەیان بە رەخنەگرتن لە یەکێتی سۆڤیەت لێك دابێتەوە.

ئەگەر رووسەکان لە ئەڵمانیایەکدا کە لانیکەم بە شێوەیەکی رەسمی لەژێر چاوەدێریی ئەمریکا و ئینگلیز و فەڕەنسا و رووسیادا بەڕێوە دەبرێ، کە بەردەوام لە شۆرای فەرماندەیی هاوپەیمانان لە بەرلین کۆبوونەوەیان هەیە، بتوانن دەست بدەنە بێبەزەیی و گوشاری سیاسی، بە ئاسانی دەشێ بزانرێ کە چی بە سەر وڵاتانی وەك



هەنگاریا، رۆمانیا، بولگاریا و یوگسلافیا دێنن کە بە تەنیایی لەوێ دەسەڵاتیان بە دەستەوەیە و جموجووڵی دیپلۆمات و نوێنەری وڵاتانی بێگانە ئێجگار بەرتەسکە و بە توندی کۆنترۆڵ دەکرێ.

بەهۆی نهێنیکاریی لەرادەبەدەر، رادەی کۆنترۆڵی سۆڤیەت لە ناوچە جیاجیاکانی دنیای ژێر دەسەڵاتیدا کەمتر دەبینرێ و لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دی جیاوازە. لە چێکوسلۆڤاکیا و فینلەند ئەم کۆنترۆڵە کەمترە لەوەی لە رۆمانی و بولگاریا هەیە. بەڵام دوا بە دوای وابەستەیی ئابووری ئەوان بە رووسیا و گەشەی بڕوا بە خۆبوون و جەسارەتی کۆمۆنیستی، دەسەڵاتی مۆسکۆ وردە وردە لە هەموو شوێنێکدا زیاتر دەردەکەوێ و بە ئامرازی ئاسایی و ئاشکرای ستەمکاری هەڵدەکوتێتە سەر نەیارانی.

ئیمپراتۆریی گەورە و نوێی سۆڤیەت لە ئەورووپا و ئاسیا" سەردەمێك لە بەر دەستی نازی، ئیتالیا یان ژاپۆندا بوو. سلاڤەکان، ئەو جوولەکانەی بە دەستی هیتلەر ئێجگار ئازار دران، کۆمۆنیستان و رەنگە هی تریش، ستالینیان پێ لە هیتلەر باشترە. بەڵام زۆربەیان پێدەچێ بە بێ ستالین بەختەوەرتر بن. ئەوان دوای دیکتاتۆریی قاوەیی یان رەش، زەحمەتە چێژ لە سوورەکەی وەربگرن. ئەوان ئازادیی تاکەکەسیی خۆیان دەوێ. لە هەموو وڵاتەکانی دنیای سۆڤیەتدا، کۆمۆنیستێك کە زۆربەی کات لە مۆسکۆ پەروەردە کراوە، دەکرێتە وەزیری ناوخۆ، وەزیری ناوخۆیەك کە سەرۆکی پۆلیسی نهێنیشە. هەموو چینە کۆمەڵایەتییەکان، ئازادیی مەدەنیی کەمتریان لە چاو سەردەمی حکوومەتی کۆنەپەرستی بەر لە جەنگ هەیە و هەڵبەت، ئازادی لەسەر ئاستی نەتەوەیی لە ئیمپریالیزمی مۆسکۆ و لە هاوهەنگاوی ئۆتۆماتیکی و دەستەوەستانانە و **شوان و مێگەلانە** لەگەڵ مۆسکۆ لە کۆمەڵە نێودەوڵەتییەکاندا، بە باشتر دەزانن. بەڵام ئەگەر کەسێکی دیموکرات، سۆسیالیست یان کەسێکی ئاسایی کە بڕوای بەسەربەخۆیی وڵاتەکەی هەیە، قسەیەك یان کارێك بکا، لەوانەیە بکەوێتە زیندان یان بۆ سیبریا دوور بخرێتەوە یان ناچار بێ رابکات. گەلێك لە سەرکردە نەیارەکانی هەنگار، یۆگسلاڤ و بولگار ناچار بوون رابکەنە پاریس و لەندەن. ژمارەیەکی کەمیشیان لە *واشنتۆن دی*

سی دەژین. هەندێ **گیانی** بوێر و خۆڕاگر، هێشتا درێژە بە سەرپێچیکردن لە رووس و کۆمۆنیستان لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی سۆڤیەت دەدەن. هێشتا سەنگەری دیموکراتیی زۆر لە ناوچەی ژێرکۆنترۆڵی سۆڤیەتدا، بە تایبەتی لە چێکوسلۆڤاکیا، فینلەند، پۆڵۆنیا، هەنگاریا، رۆژئاوای نەمسا و رۆژهەڵاتی ئەڵمانیا خۆیان راگرتووە، بەڵام حاڵی حازر دەسەڵاتی سیاسییان لە دەستدا نییە. رووس و کۆمۆنیست ئیمپراتۆرییەکەیان بە زەبری زۆر و سەرکوت و زاڵبوونی ئابووری راگرتووە. زەحمەتە پشتیوانیی جەماوەری کە کۆمۆنیست لە وڵاتێکدا بەدەستیان هێنابێ دەستنیشان بکەی. لە هەڵبژاردنی ئازاددا، کۆمۆنیستانی هەنگاریا تەنیا لە سەدا ١٧ی دەنگەکانیان هێنایەوە. سێ ناوچەی رۆژئاوای ئەڵمانیا و رۆژهەڵات هێلکەی رووسەکانیان لە ددان داوە. ئەوان تاڵان و دەستدرێژی، ئاودیوکردنی دەزگا و ئامێرەکانیان بۆ رووسیا، گەسك دانی هەموو بەرهەمی کشتوکاڵ لە لایەن رووسەکانەوە، دەست بەسەرداگرتنی دارایی و بەڕێوەبردنی پەیمانی ستەمکارانەی بازرگانییان چێشتوون. سەرباری هەموو ئەوانە، دیاردەیەکی سەیریان بینیوە: لەگەڵ کۆتایی جەنگ، هەر سەربازێکی ئەمریکی، ئینگلیز، فەڕەنسی و هەروەها دیلە ئەڵمانەکان ئاگری تاسەی گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان تێبەربببوو، رووسەکان تاکە ریزپەڕی ئەو رێسا سروشتییەی رەفتاری مرۆیی بوون. چەندین هەزار هاووڵاتی سۆڤیەت، ئەو ژن و پیاوانەی لە کاتی شەڕدا بە پێی فەرمان و راسپاردەیەك، وڵاتی خۆیان جێ هێشتبوو یان نازییەکان وەدەریان نابوون، شوێنی ژیانیان گۆڕیوە و دەیانەوێ لە تاراوگە بمێننەوە.

دەیان هەزار لەو راکردووانەی سۆڤیەت لە ئەورووپا بە کۆمەڵ یان بە تەنیا خەریکی راکردن لە دەستی پۆلیسی نهێنی سۆڤیەتن یان پەنایان بۆ ئۆردوگاکانی ئەمریکا و ئینگلیز و فەڕەنسایی ئاوارەکانی شەڕ بردووە. ئەو ژمارەیە، تەنیا بەشێکن لەوانەی توانراوە ناونووس و سەرژمێری بکرێن. لە بارەی ئەم کەسانە و هەروەها ژمارەیەکی زۆری خەڵکی بالتیك و پۆڵۆنیا کە نایانەوێ بگەڕێنەوە وڵاتی خۆیان تا لە ژێر حوکمی کۆمۆنیستیدا بژین، خانمی رۆزڤێڵت و جێگری سەرۆك وەزیرانی سۆڤیەت جەنابی وی



شینسکی لە کۆبوونەوەی رێکخراوی نەتەوەکان لە لەندەن و نیویۆرك خەرکی گفتوگۆ بوون. وی شینسکی داوای دەکرد ئەمانە سەرەڕای ویستی خۆیان بگەڕێنرێنەوە رووسیا. خاتوو رۆزڤێڵت وەك نوێنەری ویلایەتە یەکگرتووەکان گوتی ئەمانە دوورخراوەی سیاسین و مافی پەنابەرێتی دەیانگرێتەوە.

ئەو ئەورووپییانەی ئەم راستییە دەزانن لە خۆیان دەپرسن "باشە ئەم هاووڵاتییانەی سۆڤیەت بۆچی ئەورووپای وێران و رووت و برسی و ساردوسڕیان لە وڵاتەکەی خۆیان پێ خۆشترە؟"

تەنیا وەڵام بۆ ئەو پرسیارە ئەوەیە: راکردووەکان لە دیکتاتۆری و ژیانی تاڵ لە رووسیا بێزارن. هەر کەس دواندبنی دەزانێ وەڵام هەر ئەوەیە.

ئەم هەقیقەتە، لە بارەی رووسیاوە راستی زیاتر بە دەستەوە دەدا تا کتێبخانەی پڕ لە کتێبی بە هات و هاوار. بەڵام ئەوانەی لە چوارچێوەی سۆڤیەتدا دەژین ناتوانن خۆیان رزگار بکەن و ئەوانەی لە دەرەوەن، زۆربەیان ئاگایان لەو راستییانە نییە و لە رادەبەدەر نوقمی گرفتەکانی خۆیانن. زۆر پێدەچێ خەڵکانی دنیای سۆڤیەت - دەوری سەد و هەشتا ملیۆن هاووڵاتیی سۆڤیەت لەگەڵ ١٥٠ ملیۆن کەس لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی سۆڤیەت، سەرجەم ٣٣٠ ملیۆن کەس - بە هەمان رادەی ئەو ئەورووپییانەی ئاواتەخوازی دۆخی باشتری ژیان و دیموکراسیی راستەقینەن تاسەبار بن. لە زۆربەی وڵاتانی دنیای سۆڤیەتدا، ناشێ کاری زۆر بۆ ئەو گرفتانە بکرێ. بەڵام لەگەڵێك وڵاتی دەرەوەی دنیای سۆڤیەتدا، زۆر کار بۆ راپەڕاندن هەن.

کلیلی تێگەیشتنی فراوانخوازی سۆڤیەت یەك وشەیە: **بۆشایی !**

ستالین لە ئەورووپا و ئاسیا دەستی بە سوودوەرگرتن لە بۆشایی دوای جەنگی ئاکامی شکستی ئەڵمانیا، ئیتاڵیا و ژاپۆن و، لاوازیی ئینگلیز و فەڕەنسای پاش جەنگ کردووە. بەم جۆرە کۆمۆنیست و رووس پەلیان هاویشتۆتە سەرانسەری دنیا تا بۆشایی سیاسی و دەروونیی ئاکامی لاوازبوونی بڕوا بە دیموکراسی پڕ بکەنەوە.

کلیلی گەیشتن بە ئاشتی و دیموکراسی، ڕێگەگرتن لە پاوانخوازیی سۆڤیەتە بە یارمەتیی پڕ کردنەوەی ئەم بۆشاییە. ڕووسیا کاتێ بزانێ لە جیاتی بۆشایی دەسەڵات، لەگەڵ خودی دەسەڵاتێك بەرەوڕووە، قەڵەمڕەوەی خۆی فراوان ناکاتەوە. ئەگەر دیموکراسی، پڕ جووڵە، پێشکەوتوو و ڕاستەقینە بێ، ڕووسیا لە ڕووی سیاسی و ئایدیولۆژیاوە فراوانخوازیی پێناکرێ.

ئەو کاتانەی خەڵك هەست بە بۆشایی مەعنەوی دەکەن، لەو کاتانەدا کە هیوایان لە دەست دەدەن و دادەمێنن، گوێ بۆ ساختەچییان شل دەکەن و دڵ بە دیکتاتۆران خۆش دەکەن. بۆشایی، مەیدانی تەراتێنی درۆزنانی بێویژدان، مرۆڤی بوودەڵە و ملهوڕە.

کێشەی ڕووسیا کێشەی ئەڵمانیامان بیر دەخاتەوە، چونکە هەر دووکیان لە سەرچاوەیەکی هاوبەش ئاو دەخۆنەوە: شکستی شارستانیەتی نوێ کە بە ئاراستەی ڕەزامەندی مرۆڤ لە ژیانی خۆی و بەهاپێبەخشیندا دەڕوا.

ئێستا ئیدی سەیر نییە بڵێین کۆمۆنیزم مەمکی هەژاری دەمژێ. نان و ئاوەکەی لە نەبوونی ناندایە، لە نەبوونی بەردەخەڵووز و جلوبەرگدایە، بەڵام دەبێ قەبووڵ بکەین کە لە نەبوونی مەعنەویەتیشدایە!



# بەشی دوازدەهەم

## شەڕی ئایدیۆلۆژی لەگەڵ ڕووسیا

دنیایەکی یەکپارچە و یەکگرتوو، دنیایەکی بێ فرەحکوومەتی، ئایدیایەکی گەلێ جێگەی ڕێزە.

وێندێڵ وێڵکی[٤٨] - کە مردنە ناوەختەکەی بۆ ئەمریکییەکان کارەساتێکی نەتەوەیی بوو- بە هۆی برەوپێدانی ئەم دروشمە، پێگەیەکی نەمری لە نێو شانازییەکان و ناودارانی دێموکراسیدا هەیە. بەڵام بەداخەوە دنیا یەکدڵ و یەکپارچە نییە، درزی بردووە و دوولەت بووە و بەشێکی گەورەی بە هۆی پشتگوێ خستنی ئەو هەقیقەتە، لە دەست چووە. ڕەنگە ڕۆژگارێك لە داهاتوودا ببێتە یەکپارچە و ئەودەم ڕۆژەڤ ئەوە دەبێ کە ئاخۆ ئەم دنیا یەکپارچەیە، دنیایەکی دیموکراتییە یان دنیایەکی دیکتاتۆری. ئەوە هەمان ئەو شتەیە کە هەموو کۆنفرانس و کۆڕ و کۆبوونەوە و چرە و گوڕە و شەڕ و هەراکانی لەسەر دەکرێن.

سەردەمێك دەیانگوت ڕووسیا و ئەمریکا هێندە لێك دوورن کە ناشێ تێکهەڵقۆچانێك لە نێوانیاندا ڕووبدات. بەڵام سەرکەوتن لە جەنگی دووەمی جیهانیدا نەخشەی دنیای گۆڕی. ئێستا ڕووسیا و ئەمریکا لە ژاپۆن، کۆریا، چین، ئێران، تورکیا، یونان، ناوچەی باڵقان، نەمسا، ئەڵمانیا، فەڕەنسا، ئیتاڵیا، ئۆقیانووسی ئەتڵەس و ئۆقیانووسی بەستەڵەکی باکووردا هاوسنوور و ڕکابەری

---

(٤٨) Wendell Winllkie (١٨٩٢-١٩٤٤) سایەتمەداری ئەمریکیی لایەنگری حکوومەتی جیهانی و دامەزرێنەری *ماڵی ئازادی* لەگەڵ ئەلنورە ڕۆزڤێلت. کتێبەکەی بە ناوی *تەنیا یەك دنیا* لەبارەی پاراستنی ئاشتی و دامەزراندنی دەوڵەتی نێونەتەوەییەوە، ساڵی ١٩٤٣ لە سەرانسەری دنیادا دەیان ملیۆنی لێ فرۆشرا.

یەکترن. رووسیا و ئەمریکا لە سەرانسەری جیهاندا پێکەوە خەریکی شەڕێکی سیاسی و ئایدیۆلۆژین. تەنانەت لە ئەمریکای لاتین کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای لە رووی دراوسێیەتییەوە لێ نزیکترە، حەزی هەندێ لە کۆمارەکان بۆ دۆزینەوەی پارسەنگێك بە دژی تای قورسی دەسەڵاتی قۆرخکراوی ئەمریکا، لەم دواییەدا هەلی نفووزی بەرچاوی بۆ کۆمۆنیست و رووسیا رەخساندووە. چونکە بەریتانیا لەوە خۆپەرستترە بتوانێ ئەو پارسەنگە بێ. کاتێ کە *(پرۆن)*ی دیکتاتۆر، هەست بە دوژمنایەتی واشنتۆن دەکا، دەچێتە لای مۆسکۆ و دەست بە خۆشیرینکردن دەکا. پرۆن بە رووی مۆسکۆدا پێدەکەنێ و مۆسکۆش بە خۆشحاڵییەوە دەستی بە پشتیدا دێنێ.

ستالین چاکی ئاگا لەو شەڕە سیاسییەیە و بە هەر چەکێك کە لە جبەخانەکەیدا بێ، دەیکا. وشە و دەربڕینی رۆژنامە و رادیۆ و رەفتاری کاربەدەستانی سۆڤیەت رەنگدانەوەی ئەو شەڕە سیاسییەیە بەرامبەر بە دنیای غەیری سۆڤیەت. بۆ بەدبەختیان، ئەو هەموو کەسەی کە لەبارەی سیاسەتەکانی سۆڤیەتەوە دەنووسن و قسە دەکەن ، خۆیان ناتوانن رۆژنامە و گۆڤارەکانی سۆڤیەت بخوێننەوە. بە راوەشاندنی گۆچانی جادوویی ئەدیب و نووسەران ئەم شەڕە سیاسییە دیزەبەدەرخۆنە ناکرێ. یان بە گوتنی ئەوە کە ئەم شەڕ و هەرایە، لە چەمکناسیدا، لە بەدحاڵیبوونی وشان و لە تووڕەیی شەخسیی کاتی و ئەنجامی بەدگومانی و تاوانبارکردنی پێشوەختەوە سەرچاوە دەگرن، بزر بکرێ.

شەڕی سیاسی، لەبەرچاوانە و دەبینرێ. رۆژنامەکان هەموو رۆژێ، هەواڵنامەی گۆڕەپانی ئەو شەڕەن. رووس پەندێکیان هەیە کە دەڵێ: "کابرا چووە سێرك، فیلەکەی نەدی!" شەڕی سیاسیی نێوان سۆڤیەت و دنیای غەیری سۆڤیەت گەورەترین کێشەی نێودەوڵەتییە. تەنیا کەسانی زلکوێر و گێل نایبینن. کەسانی واش هەن نایانەوێ بیبینن، نەکا لەگەڵی تووشی شەڕ ببن و سەرنەکەوین.



پرسیارێکی دووپاتە کە گوێمان لێدەبێ ئەوەیە: "بۆ لەگەڵ رووسیا رکابەری بکەین؟ ئێمە دەبێ رە گەڵی بکەوین. دەبێ لەگەڵی پێکبێین و پێکەوە هەڵبکەین."

حکوومەتی ئەمریکا و ئینگلیز لەسەر پۆڵۆنیا، ئەڵمانیا، نەمسا، یۆگسلافیا، هەنگاریا، رۆمانیا و بولگارستان لەگەڵ رووسیا پێکهاتن. رۆزڤێلت و چەرچیل نیوەی پۆڵۆنیایان دایە ستالین و دەرفەتی جێگیربوونی حکوومەتی دانراوی مۆسکۆیان بۆ پێکهێنا تا لە وارشۆ بە سەر نیوەکەی تری پۆڵۆنیاشدا حوکم بکا. تەنیا داوایان لە ستالین کرد کە هەڵبژاردنێکی ئازاد و بێ کۆسپ لەوێ ئەنجام بدا. ستالین بەڵێنی وەی پێدان. بەڵام بەڵێنەکەی نەگەیاندە سەر. بەڵێنی هەڵبژاردنی ئازاد لە رۆمانیا و بولگاریاشی دا، ئەو گفتەشی جێبەجێ نەکرد. هەڵبژاردنی ئازاد لە هەنگاریا ئەنجام درا و کۆمۆنیستەکان تەنیا لە سەدا ١٧ی دەنگەکانیان هێنایەوە، بەڵام دوای چەند مانگێك، لە سایەی دەسەڵاتی سەربازیی رووسیا لە هەنگاریا، کەمینەی کۆمۆنیست، سێبەری کۆنترۆڵی خۆی خستە سەر حکوومەتی هەنگاریا و ئەوەی مۆسکۆ لە ئاراستەی پەیمانە بازرگانییە یەکلایەنەکان مەبەستی بوو، پێی گەیشت. ستالین لە پۆتسدام، لە جوولای و ئاگۆستی ١٩٤٥ بۆخۆی بەڵێنی دا کە وەك یەکەیەکی ئابووریی یەکپارچە لەگەڵ ئەڵمانیا بجووڵێتەوە، رووسیا ئەم رێککەوتنەشی ژێر پێ خست. ستالین قەولی دا لە مێژوویەکی دیاریکراودا لە ئێران بکشێتەوە، بەڵام تا ماوەیەکی زۆر دوای ئەو مێژووەش لە ئێران مایەوە. ئەوەیە ئەوی رووسەکان ناوی لێدەنێن <u>دان</u> و <u>ستان</u>. ئەوان سەرەتا بەڵێنێك دەدەن (<u>دان</u>) و پاشان دەیستێننەوە(<u>ستان</u>)!

دیموکراسییەکان لەسەر بەندەکانی پەیمانی ئەتلانتیك رێککەوتن بۆ ئەوەی بتوانن لەگەڵ رووسیا سازش بکەن، بەڵام ئەوە بە تەواوی بە زیان شکایەوە. ستالین هەرچییەکی دیموکراسییەکان دایانێ وەریگرت و پاشان هەوڵیدا شتی زیاتر وەربگرێ. ئەمەش مامەڵەیەکی دیکە لە جۆری <u>دان</u> و <u>ستان</u> بوو، دیموکراسییەکان <u>دەیاندا</u> و رووسیاش <u>دەیستاند</u>!

نیوەی ڕۆژهەڵاتی ئەڵمانیا، هەم وەك پێوەلکاندنی ڕاستەوخۆ، هەم وەك دیارییەك بۆ دەوڵەتی دانراوی ڕووسیا لە هەنگاریا، هەم وەك ناوچەی داگیرکراو لە لایەن ڕووسیاوە، درایە سۆڤیەت. ئاخۆ ئەم هەموو دیاری بەخشینانە کرملینی ڕازی کرد؟ نەخێر، لەو کاتەوە هەوڵی داوە هەموو ئەڵمانیا لە دەست خۆی بگرێ.

*تری یستێ* شارێکی ئیتالیایە کە ئیتالییەکان گەلێکیان دڵ پێوەیەتی. حکوومەتە دیموکراتییەکان بە نرخی دیموکراسی لە ئیتالیا، تری یستێ یان لێ دابڕی و هەر ئێستا ئەم شارە شارێکی نێودەوڵەتییە. بەڵام گەمەی ڕووسیا لەسەر تری یستێ تازە یەکەم قۆناغی بڕیوە و دەبێ چاوەنواڕی وەرەقەکانی دواتری بین. یوگسلافییەکان بە پشتیوانیی سۆڤیەت، هێشتا لە هەوڵی ئەوەدان تری یستێ ڕابکێشنە نێو ناوچەی ژێر دەسەڵاتی سۆڤیەتەوە.

کۆریا لە نێوان ئەمریکا و ڕووسیادا بەش کرا. ئەم بڕیارە، سازشێك بوو. بەڵام ئینکەبەرایەتی هەروا درێژەی هەیە. ویلایەتە یەکگرتووەکان دەخوازێ هەر دوو وڵاتە داگیرکەرەکە، کۆریا جێ بهێڵن تا کۆرییەکان بتوانن سەربەخۆ بن. ستالین لەوە تۆقیوە ئەو ڕێگەچارەیە بە مانای کۆریایەکی لایەنگری ئەمریکا بێ.

هێزەکانی ڕۆژئاوا و ڕووسیا بۆ هاوپەیمانەکانی پێشووی ئەڵمانیا هەندێ پەیمانی ئاشتییان مۆرکردن. پەیمانگەلی لەمەڕ فینلەند، ڕۆمانیا، هەنگاریا و بولگاریا دەریدەخەن کە ڕووسیا بەسەر ئەو چوار وڵاتەدا زاڵە. پەیمان بۆ ئیتالیا، پاشەکشەی دیموکراسی بوو. تری یستێ و چەنەلێدانی کۆنفرانسی دیپلۆماتیك ناچێتە قووڵایی کێشە و دیاردەی سەربەگێچەڵی ڕووسیا و هەروا بە چارەسەرنەکراوی دەیهێڵێتەوە.

سەرەڕای سازش و ئیمتیازات و خۆبەدەستەوەدانە بێئەژمارەکانی هێزەکانی ڕۆژئاوا بەرامبەر بە ڕووسیا، لە کاتێکەوە ئەم حکوومەتە لەساڵی ١٩٤١ شەڕی لەگەڵ هیتلەر دەست پێکرد و بەتایبەتی لە پاش کۆتایی شەڕەوە، نیشانەکانی ئامادەیی ڕووسیا بۆ هاوکاریکردن یان پێکهاتن بۆ چارەسەری کێشە سیاسییە نێودەوڵەتییەکان زۆر ورد و وردتر بوونە، ئەگەر بشێ لە بنەڕەتدا ئامادەیی بۆ



لەبەرچاو بگری. جگە لەوە، حکوومەتی سۆڤیەت خۆی لە هەموو ئەو دامەزراوە نێودەوڵەتییانەی لە لایەن ڕێکخراوی نەتەوەکان یان ڕێکخراوە جیهانییەکانی تر دامەزراون، کێشاوەتەوە" ئەو دامەزراوانەی کە ئەرکی چارەسەر کردنی کێشەی بەرچاوی وەك پەیوەندیی فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی، خۆراك، تەندروستی، پەنابەران، بازرگانی، سولفە و... هیتر ڕادەپەڕێنن.

گوتنی ئەوە کە :" ئێمە دەبێ لە ڕێگادا لەگەڵ ڕووسیا پێکبگەین و سازش بکەین" ئاسانە. ئێمە لە سەدا ٩٠ی ڕێگەی سازش لەگەڵ ڕووسیامان بڕیوە. بەڵام ڕووسیا تەنانەت ئەو لەسەدا ١٠یەش هەنگاوی لەگەڵمان هەڵنەگرتووە.

هۆکاری مۆسکۆ هۆکارێکی زۆر بەجێیە - بەلای مۆسکۆ خۆیەوە - ئاخر ئەو لە حاڵی شەڕی سیاسی لەگەڵ دیموکراسیدایە. ئەو بە شوێن بەدەستهێنانی ئاکام و بەرژەوەندییەوەیە. نایەوێ هیچ شتێك لە دەست بدا و لە خاڵێك پاشەکشە بکا. مۆسکۆ ئەوی هەیەتی دەیپارێزێ و لە هەلێك دەگەڕێ زیاتر پێشڕەوی بکا، بەشکەم ئەو هەلە کاتی دەستپێکی لە کزیدانی ئابووریی ئەمریکا بڕەخسێت.

کۆی کێشەی پەیوەندیی نێوان ڕووسیا و ئەمریکا یان نێوان دیکتاتۆرییەکان و دیموکراسییەکان لە مەیدانی دیپلۆماسی ترازاوە. ئیدی کێشەکە ئەوە نییە ئاخۆ واشنتۆن و مۆسکۆ دەتوانن گفتوگۆ و ڕێککەوتن بکەن یان نا. کاتێ ئەم دووە لێك ڕاست دەبنەوە، بە دەگمەن هەڵدەکەوێ کە بابەتی کێشەکەیان بەرژەوەندیی ڕاستەوخۆ و نەتەوەیی ڕووسیا یان ئەمریکا بێ، بە پێچەوانەوە کێشەکە لە سەر چین، ئەڵمانیا، یونان، تورکیا، ژاپۆن و ... هیترە. شتاق نایانەوێ ئەوی تر لە ڕووی سیاسییەوە ئەم وڵاتانە داگیر بکا. ئەمەیە ئەو شەڕە سیاسییەی ڕاناوەستێ، مەگەر ڕووسیا یان دیموکراسی بە سەر لایەنەکەی تردا سەرکەوێ. سیاسەتی نێودەوڵەتی گۆڕانی بەسەردا هاتووە. سیاسەتی نێودەوڵەتی جاران بە مانای پەیوەندیی نێوان دەوڵەتەکان بوو. ئەوە کە چ کەسانێك و حیزبگەلێك لە دەوڵەتدا بەشدار دەبوون زۆر گرنگ بوو، بەڵام ئەوە بابەتێك نەبوو کە

ناخۆییەکان(بێگانەکان) بایەخی پێبدەن. ئێستاش لای هەندێ وڵات ئەم دۆزە وەکو خۆی ماوەتەوە. بەڵام زلهێزەکان بەتایبەتی ئەمریکا و رووسیا رۆژ بە رۆژ زیاتر لە هەوڵی ئەوەدان هەلومەرجێکی سیاسی ناوخۆیی لە وڵاتانی بێگانەدا پێکبێنن، چونکە ئەگەر بۆ وێنە فەڕەنسا ببێتە کۆمۆنیست، بە کردەوە دەبێتە بەشێك لە ناوچەی ژێر کۆنترۆڵی سۆڤیەت. لەبەرئەوەی کە سۆڤیەت دەیەوێ فەڕەنسا کۆمۆنیست بێ و ئەمریکاش بەشبەحاڵی خۆی نایەوێ فەڕەنسا ببێتە کۆمۆنیستی. کەواتە کرملین و کۆشکی سپی هەر دووکیان بەقەد یەك نیگەرانی دەسەڵاتی حیزبی کۆمۆنیستی فەڕەنسا، کاریگەریی کۆمۆنیستەکان لە جووڵانەوەی یەکێتی کرێکاریی فەڕەنسا و وابەستە بوونی جووڵانەوەکە بە مۆسکۆن. ئەم خاڵە لەبارەی ئیتالیا، ئەڵمانیا، ژاپۆن و گەلێ لەوڵاتی دیکەشەوە راستە. ئەمە ئیمپریالیزمێکی ئایدیۆلۆژیکی نوێیە کە حکوومەتی ئەمریکا و سۆڤیەت بە شەوق و گەرموگوڕییەوە بەدوایدا دەچن. (ئەوە کە ئیمپریالیزمی سیاسی یان ئایدیۆلۆژیکی ئەمریکا لە روانگەی وڵاتانی دیکەوە چۆنە، بەسراوەتەوە بە سیاسەتی ناوخۆی ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە.) دەتەوێ بە ستالین بڵێین کە بەر بە حیزبە کۆمۆنیستەکانی دەرەوەی رووسیا بگرێ؟ کەواتە بە هەمان شێوەش دەکرێ داوا لە ویلایەتە یەکگرتووەکان بکەین کە بۆ غەیرە کۆمۆنیستان لە خۆیان دڵسۆزتر نەبێ یان سولفە و قەرزی تایبەت نەداتە حکوومەتەکانی ژێر هەڕەشەی کۆمۆنیستی.

کەسانێك هەن کە بەراستی دەیانەوێ ئەمریکا لە شەڕی سیاسیدا دەست لە ململانێ هەڵگرێ، لەکۆڵ وڵاتانی دیکەی دنیا بێتەوە و بۆخۆی لە گۆشەگیریدا بە خێر و خۆشی بژی. بەڵام ئەمە تەنیا دەبێتە هۆی زێدەبوونی هانەی پاوانخوازانەی کرملین.

رووسیا هەروەك چووە ناو بۆشایی وڵاتێکەوە کە لە ئەنجامی رووخانی ئەڵمانیا دروست ببوو، ئاوهاش دەتوانێ ئەو بۆشاییە سیاسییە پڕ بکاتەوە.



راستییەکی نوێ لە سیاسەتی نێودەوڵەتیدا ئەوەیە کە دنیای سۆڤیەت و هەروەها دنیای دیموکراتی بەرەورووی فراوانخوازییەکی ئایدیۆلۆژیك بوونەتەوە. فراوانخوازیی ئایدیۆلۆژی، هاوئاستی فراوانخوازیی سیاسییە. ئیتالیای کۆمۆنیست دەشێ بەشێك لە موڵکی رووسیا بێتە ئەژمار و پاشەکشەیەك بێ بۆ ئەمریکا و ئینگلیز. ژاپۆنێك کە دیموکراتییە، دژە کۆمۆنیستە. ئەڵمانیای کۆمۆنیست، ئەگەر ئەمریکا و ئینگلیز بەجێی بێڵن، بێ ئەملاوئەولا دەبێتە هۆی ئەوەی رووسەکان لە قەراخ رووباری راینەوە چاو ببڕنە فەڕەنسا. ئەو کاتەیە کە فەڕەنساش دەشێ ببێتە کۆمۆنیست. ئەو کاتەیە کە جەنگی سێهەمیش بۆی هەیە سەروسەکوتی وەدەرکەوێ. یان ئەگەر دیموکراسییەکان تا ئەو کاتە، بە ژمارە کەم و لاواز بووبنەوە، ئەوکاتەیە کە تەمەنی دیموکراسی کۆتایی هاتووە.

ئەمە وانەیەکی پڕ باجە کە لە دەستدرێژیی فاشیستی و هێرشی ژاپۆن بۆ سەر *پێرل هاربەر*[٤٩]ەوە دەستمان کەوت. زۆربەی کۆنە دوورەپەرێزخوازانی ویلایەتە یەکگرتووەکان و زۆربەی باجدەرانی ئەوروپا، پێدەچێ ئەو وانەیە فێر بووبن، بەڵام لەو دواییەدا، کاڵایەکی نوێی دوورەپەرێزخوازان خەریکە بێتە نێو بازاڕەوە.

ئەمەش کۆمۆنیستە ناوخۆیی و هاودەستە نیشتمانپەروەرەکانن کە هاوار دەکەن: "واز لە یونان بێنن، واز لە تورکیا بێنن، واز لە چین بێنن، واز لە ئەڵمانیا بێنن، یارمەتیی ئینگلیز مەدەن" ... بەڵێ، دەستان بەردەنەوە، با رووسیا بتوانێ دەستی درێژ بکا!

لەوێوە کە هەموو جۆرەکانی ئیمپریالیزم و گشت چەشنەکانی فراوانخوازی خراپن، بۆچی هەر بەو توندوتیژییەی کە بە گژ فراوانخوازیی سۆڤیەتدا دەچمەوە،

(٤٩) بەندەرێکە لە کۆمەڵە دوورگەی هاوایی لە ئۆقیانووسی ئارام و بنکەی سەرەکیی کەشتیە جەنگییەکانی ئەمریکا لەو ناوچەیەدا لە جەنگی دووەم. ژاپۆنییەکان لە ٧ی دیسامبەری ١٩٤١ بە ٣٥٣ فڕۆکەی کامی کازە(خۆکوژی) پەلاماری ئەم بەندەرەیان دا و بە لەناوبردنی کەشتیە جەنگییەکانی ئەمریکا لە ئۆقیانووسی ئارام، ئەم وڵاتەیان - کە تا ئەوکات بێلایەن بوو - هێنایە جەنگی جیهانیی دووەمەوە.

بەرەنگاری فراوانخوازیی ئەمریکایی نابمەوە؟ لەو ناوەدا جیاوازییەك هەیە: لە ژێر فراوانخوازیی ئەمریکادا، وڵاتەکان هێشتا دەرفەتی ئەوەیان هەیە بۆ ئەو شتەی دەیانەوێ خەبات بکەن، بەڵام لە جێگایەکدا کە دیکتاتۆریی رووسی سەقامگیر بووبێ، هەموو دژایەتییەك بە شێوەکی بێبەزەییانە سەرکوت کراوە. لەگەڵ ئەوەشدا، من هێشتا نیگەرانی مەترسییەکانی ئیمپریالیزمی ئەمریکاییشم.

ئەمریکایی وا هەن کە تەواو دژی دوورەپەرێزین. ئەوان داوای ئیمپراتۆریی ئەمریکایی و دەسەڵاتی شێلگیرانەی ئەمریکا لە سەرانسەری دنیادا دەکەن. لەسەر ئەوە سوورن کە دەبێ بە ئیمپریالیزمی ئەمریکا رووبەرووی ئیمپریالیزمی سۆڤیەت ببینەوە. من تەواو دڵنیام کە ئەو رەوتە بە هەر لایەکدا بکەوێ، دەشێ نەهامەتیی ئابووری، ئاژاوە و شەڕی لێبکەوێتەوە.

هەندێ ئەمریکی وای دادەنێن کە بەریتانیای مەزن، وڵاتانی هاوبەرژەوەندی بەریتانیا[٥٠]، ئەمریکای لاتین، فەرەنسا، ئیتالیا، ئەڵمانیا، یونان، تورکیا، سکاندیناڤیا، رۆژهەڵاتی نزیك، هیند، هیندوچین، مالیزیا، ئەندەنووسیا، چین و ژاپۆن خێرا بیر لە وابەستەبوون بە ئەمریکا دەکەونەوە بۆ ئەوەی یارمەتیی ماڵی و پشتگیریی سەربازی بەرامبەر بە رووسیا وەربگرن. دەڵێن:"بۆ نەکرێ؟ ئەمریکا ئامادەیە هەموو کەس لە چنگی گورگە رەشە زلەکە یان ورچە سوورە زەبەلاحەکە رزگار بکا." ئەمە ساویلکەییە. ئەوان پێشوازی لەو سیناریۆیە ناکەن و تا دوا هەناسە بەرامبەری دەوەستنەوە. قەبووڵمە کە ئەمریکا لە زۆربەی ئەو وڵاتانەدا دەتوانێ حیزبێکی سیاسیی لایەنگری خۆی پەیدا بکا یان پەروەردەی بکا. بەڵام ئەو حیزبە لەگەڵ دژایەتیکردنێکی توندی ناوخۆدا بەرەوڕوو دەبێ.

لەحاڵی حازردا دڕدۆنگی و نیازخراپی بەرامبەر بە ئەمریکا لە دەرەوە، نە تەنیا لە ناو کۆمۆنیست و لایەنگری کۆمۆنیستاندا بەڵکو لە نێو دیموکراتەکانیشدا هەن کە لەوە دەترسن ویلایەتە یەکگرتووەکان حەزیای سەدەی بیستەم بێ کە توانا

(٥٠) Commonwealth یەکێتی موستەعمەرەکانی پێشووی ئینگلیز و ئینگلیز خۆی.



ئابووری و سەربازییە زەبەلاحەکەی بەسەر وڵاتە بچووکترەکاندا زاڵ دەبێ. ئەوان نیگەرانی ئەوەن نەکا ئەمریکای کۆنەپارێزی سەرمایەدار، بەو مەرجە یارمەتییان بدات کە وەرگری ئەو یارمەتییانە ببنە پەیڕەوی ئایدیا و ئامانجە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی ئەمریکا؟

پێوەلکاندنی نارەسمی دوورگەکانی پێشووی ژاپۆن لە ئۆقیانووسی ئارام بە ئەمریکاوە، هەر ئێستا خەڵکی لە ئاسیا و هەندێکی لە خودی ئەمریکاش - کە لە بایەخی دۆستایەتی لەگەڵ ئاسیا ئاگادارن - تووشی کێشە و دڵەڕاوکێ کردووە. من دۆستایەتیی سەد ملیۆن ئاسیایی قەت بە خاوەندارێتی گشت دوورگە بچووکە مەرجانییەکانی ئۆقیانووسی ئارام نادەم" دورگە و قەڵەمڕەوی خاکی لە شەڕێکی ئاسمانی - ئەتۆمیدا نابنە ئامرازێکی کاریگەری بەرگریکردن.

جموجووڵی ئەمریکا لە ئەورووپا، لە چین و ژاپۆنیش خراوەتە ژێر زەرەبین. بەڵام پڕوپاگەندەی لایەنگرانی سۆڤیەت، وێنە راستەکە دەشێوێنێ. راستییەکەی ئەوەیە کە حکوومەتی سەرمایەداریی ئەمریکا هیچ نارەزایەتییەکی بەرامبەر هەڵبژاردانی سۆسیالیست و کۆمۆنیستەکان لە ناوچەکانی خۆی لە ئەڵمانیا دەرنەبڕی. لە کاتێکدا حکوومەتی سۆڤیەت نەیهێشت سۆسیال دیموکراتەکان لە ناوچەکەی ئەودا چالاکی بنوێنن. راستیەکەی ئەوەیە کە حکومەتی ئەمریکا لایەنگری نیشتمانیکردنی پیشەسازی لە نەمسایە بەڵام حکومەتی سۆڤیەت بۆ ئەو کارە بەربێنەیان دەخاتە سەر رێ. ژەنەراڵ *جۆرج.سی.مارشاڵ*، دەوڵەتێکی لایەنگری ئەمریکای بەسەر چیندا نەسەپاند، بەو جۆرە کە وی شینسکی حکوومەتێکی لایەنگری رووسیای بەسەر رۆمانیادا سەپاند، هەروەك ستالین رژێمێکی لایەنگری رووسیای لە پۆڵۆنیا دامەرزاند.

مارشاڵ بە پێچەوانەوە هەوڵی دا کۆمۆنیستە دژە ئەمریکایە لایەنگرەکانی رووس بهێنێتە ناو حکوومەتی چینەوە. کاتێك کە مەئموریەتەکەی بۆ کۆتاییهێنان بە شەڕی ناوخۆی چین شکستی هێنا، نەك هەر مۆرە تیۆرداڕێژە کۆمۆنیستەکانی

چین، بەڵکو کۆنەپەرست و شەڕخوازە راستگەراکەی (*کومین تانگ*)یشی لەم شکستەدا بە هاوبەش زانی. ئەو داوای لە چینییەکان کرد کە حکومەتێکی هاوبەند لەگەڵ میانەڕۆکان پێکبێنن، بەڵام دەسەڵاتی ئەوەی نەبوو کە حکوومەتێکی وا، بەسەر ئەو میللەتەدا بسەپێنێ.

راستییەکەی ئەوەیە کە ژەنەراڵ *مەك ئارتۆر* ئازادییەکی بێسنووری دایە کۆمۆنیست و سۆسیالیست و سەندیکا کرێکارییەکانی ژاپۆن. هەڵبژاردنەکان لە ژاپۆن ئازادانە بەڕێوە چوون. حکوومەتی هەڵبژێردراوی ستانەکان و حکوومەتی ناوەندی لە تۆکیو، بە فەرمانی دامودەزگای داگیرکەری ئەمریکا نەڕووخێنراون. مەك ئارتۆر" لایەنگرانی فاشیستی، سەربازیخوازان و خاوەن کارگا گەورەکانی لاداون. لەگەڵ ئەوەشدا بانگەشەچی و زوڕناژەنان، بە شێوەیەکی بەرچاو ئەم کردەوە ئامالْ باشانە بە شێوەیەکی تر ناشیرن دەکەن و هەر ئەم کارە تەنانەت لە لایەن زۆر کەسی زیرەکیش قەبووڵ دەکرێ. دەڵێن: بۆچی ئەمریکا لە چین لایەنگری لە کۆنەپەرستی دەکا؟ یان لە یۆنان؟"، "بۆچی ئەمریکا سەدان ملیۆن دۆلار لە وڵاتانی پادشایی - فیۆداڵی و نەوتاویی عەرەبان خەرج دەکا؟ ئەمەیە ئەو دیموکراسییەی ئەمریکا بانگەشەی بۆ دەکا؟" سیاسەتی ئەمریکا دەشێ لە نیگای سیاسەت داڕێژانی ئەمریکاییەوە لە واشتنۆن دی.سی نیازپاکانە بێ، بەڵام لەبەر چاوی کەسانێك کە لە لایەکی ترەوە دەیبینن، شتێکی جیاوازە.

لە ١٩٤٦دا، گەلێك لە ئینگلیزە بەرپرس و دەروەستەکان لە هەموو حیزبە سیاسییەکان دژی پارە بە قەرزدانی ئەمریکا و بەریتانیا بوون و لە پەرلەمان بە دژی دەنگیان دا، هەر چەند وڵاتەکەیان ئێجگار پێویستی بە یارمەتیی ماڵی هەبوو. ئەم هەقیقەتە کە نەهامەتی و مەترسیی رووخان، حکوومەتێکی بێگانە ناچار دەکا داواکار و وەرگری یارمەتیی ئەمریکا بێ، بە هیچ شێوەیەك زەمانەتی ئەوە ناکا کە ئەمانە ببنە سوپاسگوزار و دۆستی ئەمریکا.



هیندێك کە تازە لە چنگی حکوومەتی بەریتانیا رزگار بووە، چ شتێك جگە دوژمنایەتی لەگەڵ ئەمریکا لە خۆی نیشانددا ئەگەر تەنانەت ناڕاستەوخۆش بۆی دەربکەوێ ئەمریکا دەیەوێ دەستی لە کاروباری هیند لە ناوەوە و دەرەوەدا هەبێ؟ ئەدی ئەندەنووسیا؟ یان برمە؟ یا هیندوچین؟ سەدان ملیۆن مرۆڤ هەن کە لەسەر ئەوە سوورن خۆیان بن و ئازاد بن.

وڵاتان لە هەر چەشنێك بن، حەز ناکەن لەگەڵ هێزێکدا بە تەنیا وەمێنن. هێزێك کە لەوانەیە ئازادییە نەتەوەییەکانیان بەرتەسك بکاتەوە. لە کاتێکدا کە وا هەست بکەن ویلایەتە یەکگرتووەکان قۆناغێکی نوێی لە ئیمپریالیزم دەست پێکرووە، لە نێوان خۆیان یەك دەگرن تا بەرگریکردنەکەیان بەهێز بکەن و بە گشتی، کێشە بۆ ئەمریکا دروست بکەن. دواجار ئەمریکا لەوانەیە ناچار بێ ئەوەی ستالین دەیکا، ئەویش بیکا: ببێتە دیکتاتۆری ناوچەی ژێر کۆنترۆڵی خۆی، بە هۆی زەبروزەنگەوە" دەوڵەتگەلی دروستکراو چێبکا، نەیارانی سەرکوت بکا و دژە ئەمریکییەکان دوور بخاتەوە سیبریایەکی لە جۆری ئەمریکاییە. راست وەك ئەو رەفتارەی کە رووسیا لەگەڵ سەرکردە نەیارەکانی لە هەنگاریا، پۆڵۆنیا، بولگاریا، رۆمانیا و یۆگسلافیا کردی .

ئەگەر بتهەوێ بە چەکی ستالین، لەگەڵ ستالین شەڕ بکەی، کتومت دەبیە ستالینیست. بەڵام حکوومەتە دیموکراتی و رێکخراوە دیموکراتییەکان نابێ هەوڵ بدەن یارییەکە بە شێوازی کۆمۆنیستان بەرنە پێشەوە. ئەوان دەبێ شێوازی دیموکراتیك بگرنە بەر و بە پێی بنەما دیموکراتییەکان بجووڵێنەوە. حیزبی بەهێزی کۆمۆنیستی فەڕەنسا، کە بەبێ هەرا و شەڕی ناوخۆ ناشێ سەرکوتی بکەی، کاریگەریی لە سەر سیاسەتی دەرەوەی فەڕەنسا دادەنێ و لەبەردەم فەڕەنسا دەبێتە کۆسپ تا سیاسەتێکی دیموکراتگەرا، رۆژئاواگەرا یان ئەمریکاگەرا لە کاروباری دەرەوەی خۆیدا بگرێتە بەر.

چەك ناتوانێ بەربەرەكانێی ئەم بارودۆخە بكا مەگەر ئەمریكا بیەوێ پاسەوانی لە هەر شار و گوندێكی فەڕەنسا یەك بە یەك بكا و ئیدارەی بكا. رزگاربوون لە بەلاّی كۆمۆنیزم لە چین، بە هۆی زەبروزەنگی پەتی و رووتەوە، بە مانای هەلاّیساندنی جەنگێكی گەورەیە لە ناوچە سنووریەكانی سۆڤیەت و چین كە دەوری سەد و پەنجا ملیۆن كەسی تێدا دەژی. ئاخۆ ئەمریكا دەتوانێ ئەم كارە بكا؟ ئایا ئامادەیە كاری وا بكا. پێم وایە وەلاّمەكە نا بێ.

راستگەراییەك كە دەلێ دەبێ ئیمپریالیزمی سۆڤیەت بە ئیمپریالیزی گەورەتر و باشتری ئەمریكایی بەرپەرچ بدرێتەوە، بە هیچ شێوەیەك راستگەرایی نییە. بیرێكی گەمژانە و مەحكووم بە شكستە! دیموكراسی ملی لە ژێر چەقۆدایە. كەواتە، ئێستا كاتی ئەوە هاتووە كە دیموكراتیتر، ئەخلاقیتر، مەسیحاییتر و گاندی ئاساتر بین. ئەمە تاقە ترووسكەی هیوایە بە سەركەوتن بەسەر دیكتاتۆریدا. دیموكراسییەك كە لەگەڵ خۆی - بەتایبەتی لە قەیرانەكاندا- راستگۆ نەبێ، خۆی لە ناو دەبات.

دوورەپەرێزخوازیی ئەمریكا و دوورەپەرێزخوازیی بەریتانیا هیچ كامیان ناتوانن وەلاّمی فراوانخوازیی رووسیا بن. هەندێ ئینگلیزی ساویلكە پێیان وابوو لە یەكەم شەڕی ئەتۆمیدا، هەندێ ولاّت دەتوانن بێلایەن بن. ئەوانە وا بیر دەكەنەوە لە كاتێكدا رووسیا فراوان دەبێتەوە یان كاتێ كە رووسیا و ئەمریكا لە سەر بالاّدەستی و زالّبوون ئینكەبەرایەتیی یەكتر دەكەن، خەلّكانی تر و یەك لەوانیش ئینگلیزەكان دەتوانن هەروا دیموكرات بمێننەوە. بەلاّم ئینگلیز رۆلّی سەرەكی لە خەبات بۆ دیموكراسیدا دەبینێ. بەبێ بەریتانیا لەوانەیە دیموكراسی لەناو بچێ. ئەگەر سیاسەت داڕێژانی ئینگلیز، بە ئەنقەست پەیوەندیی خۆیان لەگەڵ ئەمریكا تێكبدەن، پێگەی دنیای هاوبەرژەوەندی ئینگلیزیش باشتر نابێ، ئەم كارە ئینگلیز دەباتە ژێر رەحمەتی كۆنترۆلّی رووسیاوە كە بە هۆی سارد و سڕی پەیوەندیی ئینگلیز بەرامبەر بە ئەمریكا، هان دەدرێ دەسەلاّتی خۆی فراوان بكاتەوە. بیری



دوورەپەرێزی، بە هەمان رادە بۆ پیرە ئینگلیز، كۆن و لەكار كەوتووە كە بۆ ویلایەتە یەكگرتووەكانی هەرزەكار.

وەلاّمی ئیمپریالیزمی رووسی، بەرهەمهێنانی ئیمپریالیزمی ئەمریكاییش نییە. ئەم كارە بە مانای ئاژاوە و بەریەك كەوتن و سەرئێشەیە.

بۆمبی ئەتۆمیش وەلاّمێك بۆ ئەو كێشەیە نییە. هەندێ دەنگی تایبەت لە ئەمریكا هەن كە دەلّێن باش دەبوو ئەگەر هەر ئەمڕۆكە بۆمبی ئەتۆم لە مۆسكۆ درابایە. ئایا ئەمانە دۆستی دیموكراسین؟ نەخێر، ئەمانە دوژمنی دیموكراسین، بڕوایان بە دیموكراسی نییە و بڕوایان بەوە نییە كە دیموكراسی بتوانێ لە ركابەریەتێكی ئاشتیخوازانەدا لەگەڵ دیكتاتۆریی سۆڤیەت سەركەوێ.

بەلاّم من بڕوام پێیەتی.

كەواتە باشتر وایە دیموكراسییەكان و رووسیا پێكەوە ركابەری بكەن. ئەگەر رووسیا سەركەوت ئیدی دەبێ فاتیحایەك بۆ دیموكراسی بخوێنین. بەلاّم ئەگەر دیموكراسییەكان لە بەربەرەكانێ لەگەڵ رووسیادا سەركەوتن، ئەودەم شەڕ و تۆقاندن روونادات.

هەموو دنیای غەیرە سۆڤیەت - نەك هەر ویلایەتە یەكگرتووەكان - دەبێ لە شەڕی سیاسی بە دژی سۆڤیەتدا بەشدار بن. پێم وایە ئەگەر دیموكراسییەكان بە دوای رێگەی راستی سەركەوتندا بگەڕێن، دەتوانن براوەی مەیدانەكە بن. ئێستا دەبێ ببینین ئەم رێگەیە كامەیە:

## بەشی سێزدەهەم

# پلانێك بۆ ڕێگەگرتن لە شەڕ لەگەڵ ڕووسیا

دنیا لە فەزیحەتێکی جەرگبڕدا پەلەقاژەیەتی. نەهامەتیی ئابووری لەوانەیە دنیا قووت بدا.

جەنگێکی سێهەم دەشێ ڕوو بدات کە ملیۆنان قوربانی بە دواوە بێ. خودی دیموکراسی لە وانەیە لەناو بچێ.

ئەمە ڕەشبینی نییە. هەقیقەتی پەتییە. کەسی ڕەشبین دەڵێ هیچ کارێکمان لە دەست نایە بەری ئەو ڕەوتەی پێ بگرین. کەسێکی بەدبین کە بەمانە پێدەکەنێ، پڕە لە شادومانی درۆیین، چیرۆکی پیاوکوژی دەخوێنێتەوە و ئالوودەی ئەلکۆلە. بەڵام کەسی گەشبین لەسەرخۆیە. گەشبین وەك ئارمیای پێغەمبەرە کە ڕووخانی داهاتووی حکوومەتی ئاشووری دەدی، بەڵام پێی وابوو دەکرێ کارێك بکەی.

دەکرێ ڕێگە لە شەڕی سێهەم بگیرێ. هیچ شتێك لە شەڕێکی داسەپاو ناخۆشتر نییە. شەڕ ڕوونادەن بەڵکو دروست دەکرێن و وەڕێ دەخرێن. چۆنیەتیی دروستکردنی جەنگی دووەم بە خۆشیەوە هاتۆتە سەر کاغەز تا هەمووان پەندی لێ وەربگرن. هەزاران گەمژەیی جەنگ دروست دەکەن. دەکرێ لە ڕێگەی عەقڵ، تێگەیشتن و کرداری بەوەخت بەری پێ بگیرێ.

دێموکراسییەکان هەمیشە ئامادەن بچنە ناو شەڕەکانەوە تا دنیا بۆ دیموکراسی ئارامتر بکەن!

ئەوان بەشداریی شەڕی یەکەم و دووەمی جیهانیان کرد تا دنیا بۆ دیموکراسی ئارامتر بکەن. بەڵام لەمەودای نێوان ئەو دوو شەڕەدا کارێکیان بۆ ئەوە نەکرد دنیا بۆ دیموکراسی ئارامتر کەن! هەر بۆیە ناچارن بەشداریی شەڕێکی دیکە بکەن تا دنیا

هەندێکی دیکەش بۆ دیموکراسی ئارامتر بکەن!! ئێمە لەوانەیە لە ماوەی ١٠ تا ١٥ ساڵی دی بۆ پاراستنی دنیا لە دیکتاتۆری، لەگەڵ رووسیا تووشی شەڕ بین، مەگەر هەر ئێستا بە ئامرازی ئاشتیخوازانە کارێك بۆ رزگارکردنی دنیا لە دەست دیکتاتۆری بکەین. مرۆڤ لە سەردەمی ئاشتیدا دەبێ بۆ دیموکراسی شەڕ بکا، ئەگینا ناچار دەبێ بە جەنگ بۆ دیموکراسی خەبات بکا. شتێك کە هیچ کەس حەزی لێناکا.

چۆن دەکرێ لە کاتی ئاشتیدا بۆ دیموکراسی شەڕ بکەین؟

بە دیموکرات بوون!

دیموکراسییەکان چەند ساڵ زیاتر دەرفەتیان نییە - رەنگە ١٠ ساڵ - کە لەو ماوەیەدا دەتوانن رێگە نەدەن بگەنە هەڵدێری یەکەم جەنگی ئەتۆمییەوە. لە کاتێکدا کە پاش ئەم ماوەیە پەیوەندیی رووسیا - ئەمریکا هەر بەم شێوەیەی ئێستا بێ، هەروا بارگرژ و ناخۆش بێ، لەوانەیە شەڕەکە هەڵبگیرسێ، چونکە لەوانەیە تا ئەوکاتە، رۆحیاتی دژە شەڕی سەردەمی پاش جەنگ کۆتایی هاتبێ.(ستالین لێکی داوەتەوە کە بۆ نۆژەنکردنەوە و دەرکێشانی ئابووریی رووسیا لەناو وێرانەکانی جەنگ ، ١٥ ساڵی ماوە پێویستە.)

لە دەیەی ئایندەی دیموکراسییەکاندا دەبێ دیموکراسی لە هەموو شوێنێکدا فراوان بکرێتەوە و رەگ دابکوتێ. ئەمە تەنیا رێگەی بەرگرتن لە جەنگ لەگەڵ ئیمپراتۆریی رووسیایە.

دیموکراسییەکان دەبێ ئیرادەی باشترکردنی دیموکراسیان هەبێ و پلانێکی بەرهەستیشیان بۆ داڕشتبێ. بەرنامەی رزگارکردنی دیموکراسی لە رێگەی دەوڵەمەندکردن و باشترکردنیەوە، نابێ تەنیا لە لایەن سیاسەت داڕێژانی ئەمریکایی دابڕێژرێ یان ئەمریکییەکان بە تەنیا جێبەجێی بکەن. ئەمریکییەکان ئەوەندە خۆش دەژین، هێندە دوورن، ئەوندە باوەڕیان بە ئابووری و سەرمایەداریی تایبەت هەیە کە ناتوانن لە قووڵاییی ئەو کێشەیە بگەن کە رووبەڕووی دنیا بۆتەوە.



زمانی حاڵیان ئەوەیە :"ئابووریی ئازاد و ئازادی سەرسوڕهێنەرن، مەگەر وانییە؟ کەواتە بۆچی تێکەڵیان بکەین؟ هەمووشتێك دەشێ زۆر باش بێ، بە مەرجێ کە بۆ رووسیا و بە ناوی رووسیاوە نەبێ." هەر بۆیە پێشنیاری هەموویان ئەوەیە: بەرامبەر رووسیا سەختگیر بە!" و "حیزبی کۆمۆنیست نایاسایی بکە." ئەمە هەمان ئەو رەوتەیە کە کۆنەپارێز و کۆنەپەرستانی لە رووبەڕووبوونەی پێویست لەگەڵ کێشە جیهانییەکان تووشی نەزۆکی کردووە. ئەوان نازانن حاڵەکە چەند نالەبارە.

دۆخەکە هێندە جیددییە کە پێویستی بە رێگەچارەیەکی قارەمانانە هەیە. بەڵام پێدەچێ گەلێك لە سیاسییەکان گەیشتبنە بنبەست و زۆربەی کەسانی دیکەش کە بە تەونە جاڵجاڵۆکەی دەسەڵاتی نەتەوایەتییەوە بوون - هەروەتر.

جێگەی داخ ئەوەیە کە دەبینین کاربەدەستە رەسمییەکان لەو بارەوە مشتومڕ دەکەن کە فلان سنوورە دەبێ ١٠ کیلۆمەتر بۆ لای رۆژهەڵات بچێ یا ٨ کیلۆمەتر بۆ لای رۆژئاوا. ئەوان لە جیاتی مشتومڕ لە سەر پێوانی سنووران، دەبوایە لە بارەی هەڵگیرانی سنوورەکانەوە دوابان. تەنانەت لەوەش ناخۆشتر ئەوەیە ببینی دەوڵەتان لە بارەی ئەوەی تا چ رادەیەك رێگە بە ئەڵمانیا بدەن دەست بداتە بەرهەمهێنانی پیشەسازی، باس و مشتومڕ دەکەن. لە کاتێکدا ملیۆنان مرۆڤ لە سەرانسەری دنیادا لەڕ و برسی و نەخۆشن و لە سەرەمەرگدان - لە بەر ئەوەی کاڵا و خواردەمەنی کەمە - راگرتنی بەرهەمهێنان بەهەر هۆیەك، جینایەتە، کەچی مرۆڤی بە رواڵەت ماقووڵ، سیاسەتێکی ئەوتۆیان بەرامبەر ئەڵمانیا گرتۆتە بەر. ئەوان لەوە دەترسن ئەڵمانیا دیسان شەڕێکی دیکە هەڵگیرسێنێ. ئەمە دان پێدانانێکە بە بێ توانایی و دەستەوەستانی مرۆڤ لە کۆنترۆڵکردنی دێوی دەسەڵاتێك کە داهێنانەکەی (نەك چرای جادوویی عەلائەدین)، لە زەوی و ئاسمان و ئاو و **خۆی** بانگ کردووە و بەکاری هێناوە.[٥١] ئەم پیاوە سیاسیانە مێشکیان

(٥١) مەبەست لە توانای جادوویی تەکنەلۆژیایە.

هەیە، بەڵام لە بازنەی بیری کۆن و رزیودا گیریان خواردووە. هەوڵ دەدەن نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم لە قالبی سەدەی نۆزدە بدەن، ئاشکرایە کە ناکرێ! ئەوان بە زۆری دەیانەوێ دنیای فرۆکە و ئەتۆم لەبەر پشتێنی سەدەی نۆزدەهەمی نەتەوەخوازی بچەقێنن و لەبەر ئەوەشە کە ئێستا گوێمان لەو هاوار وناڵینە دەبێ.

دیموکراسی تەنیا بە جیهانی روانین و بیر لە گشت زەوی کردنەوە[٥٢] دەکرێ رزگار ببێ نەك بە نەتەوەخوازیی لە قالبدراوی ناو سنووران.

با ناوچەی رۆهری ئەڵمانیا وەك نموونە وەربگرین. ئەم ناوچەیە دەوڵەمەندترین و گرنگترین ناوەندی پیشەسازیی ئەوروپایە. لە راستیدا دڵی پیشەسازیی ئەوروپایە. ئەم دڵە پێشتر تەنیا بۆ ئەڵمانیا لێی دەدا و دوای ئەوەی دەرکەوت لە جەستەی ئەڵمانیا زیادە، ئەڵمانیا چووە شوێن ئەندامەکانی دیکە و لە ماوەی دوو جەنگدا، دوو جار هەوڵی دا ئەوروپا داگیر بکا.

ئێستا دەبێ چ بکەین؟ نیوەی دڵەکە نەشتەرگەری بکەین و فڕێی بدەین، بەم کارەی خۆمان، توانای پڕبەهای بەرهەمهێنان بە فیڕۆ بدەین و گەلێك مرۆڤیش قڕ بکەین؟ هەندێ حکوومەت کتومت ئەم پێشنیارەیان کردووە. رۆهر بدەینە فەڕەنسا؟ ئەم دڵە بۆ فەڕەنسا زۆر گەورەیە و خودی ئەڵمانیاش بەبێ تەنانەت یەك ترپەشی دەمرێ. لەگەڵ ئەوەشدا، فەڕەنسا هەر ئەوەی دەوێ، واتە هەموو رۆهر بۆ خۆی. ئاخۆ وا باشتر نییە، ئەم دڵە بدرێتە هەموو ئەندامەکە واتە ئەوروپا، واتە رۆهر خوێن بگەیەنێتە ئەڵمانیا، فەڕەنسا و هەموو ئەوروپا؟ ئەمە هەمان جیهانی روانینی ئابوورییە. کار و کاسبی باش، بەڕێوەبەرایەتی باش، بازاڕی باش و

---

(٥٢) ئەم گوتارە، لە نەوەدەکانەوە تا ئێستا، برەوێکی جیهانی پەیدا کردووە و بووە بە دروشمی یونسکۆ و جوولانەوە سەوزەکان: "جیهانی بیربکەینەوە، نەتەوایەتی بڕیار بدەین و خۆجێیی کار بکەین." وشەی زەوینی یان Earthian وەکو جۆرێك دەربڕینی شوناس و پێناسەی نەتەوایەتیی شەخسی، لەو سەردەمەوە برەوەی پەیدا کردووە. لە حاڵی حازردا ئەوروپای یەکگرتوو و بەهێز، دیارە نەك بۆ هەموو دنیا، بەڵام لانیکەم لە نێو خۆیدا، سنوورەکانی هەڵگرتوون و ئەم تێزەی بردۆتە واری جێبەجێکردنەوە.



مرۆڤایەتیی بێ غەل و غەش و هەروەها ئاشتی، پێویستی بە جیهانی روانینی ئابووری لە زۆربەی شوێنەکانی دنیادا هەیە. ئاشکرایە کە نەتەوەخوازی لەو ناوەدا، بە تەواوی لەکارکەوتوو و کۆنە.

پینە و پەڕۆی گەلانی لێك جیا، چ لە جۆری ئابووری یان سیاسییەکەی، دیاردەیەکی سەرنجڕاکێش نییە. ویلایەتە یەکگرتووەکان، کاتێ کە *لیۆن بلوم* سەرۆکی حیزبی فەڕەنسا لە ساڵی ١٩٤٦ سەردانی واشنتۆنی کرد، لە سەروبەندی هەڵبژاردنی فەڕەنسادا، بە پەلە قەرزێکی دانێ. ئەمریکییەکان نەیاندەویست کۆمۆنیستەکانی فەڕەنسا دەنگەکان گەسك بدەن. ئەو قەرزەی پێیان درا پێدەچێ پێویست بووبێ. بەڵام ئەمە رێگەی بەرەورووبوونەوە لەگەڵ کێشەیەکی جیهانی یا تەنانەت کێشەکانی فەڕەنسا نییە، چونکە قەرزەکە درا، بەڵام هێشتا کێشەکان لەسەر جێی خۆیان ماونەوە.

کری کۆمەڵایەتی، سیاسی و ئابووریی لە یونان لەبەریەك هەڵدەوەشێ، ئینجا، دوای ئەوەیە کە یۆنان قەرز وەردەگرێ. لە تورکیاش پێدەچێ کرەکە خەریکی تەنك بوون و دڕان بێ، تورکیاش پارە قەرز دەکا. بەڵام ئەم کرە دەشێ لە هەر لایەکی دیکەشەوە بدڕێ، چونکە هەمان قوماشە تەنك بووەکەیە کە پەڕپووت بووە و لە رادەی خۆی زیاتر، پینە کراوە.

هیندستان پێویستی بە پۆڵایە. ئەگەر هیند بتوانێ کارگەی ئاسن لە ئەمریکا بکڕێ، هیندییەکان پارەی زیاتریان دەست دەکەوێ و لەوانەیە کاڵای زیاتر لە فەڕەنسا بکڕن. ئەگەر فەڕەنسا بە دوای ئەوەدا تووتنی زیاتر بکڕێ، ئەگەر ناوچەی رۆهر بە بێ تەگەرە خەریکی بەرهەمهێنان بێ و تووتنی زیاتر لە یونان بکڕێ، ئەگەر کەشتییەکانی یونانی باری گەورەتر هەڵبگرن و ئەگەر دراوسێکانی یونان واتە سلاڤەکانی باکوور دەست لە دەستێوەردانی یونان هەڵگرن، ئەو کاتە رەنگە یۆنان رێگەچارە و حکوومەتێکی میانەڕۆی دەست کەوێ. رەنگە گرفتی یونان بەر لە هەموو شتێك بە دەستی دەرەوەی یونان چارەسەر بکرێ.

زۆربەی کێشە و گرفتە نەتەوەییەکان پەیوەندییان بە رەفتار و دەرمانی نێودەوڵەتییەوە هەیە. گرفتی ئابووری زۆربەی کات کێشەی ئاسانە و لەگەڵ ئەوەشدا تا کاتێ کە کۆسپە سیاسییەکان هەڵنەگیرێن، کەس توانای چارەسەری ئەو کێشە ئاسانەی نییە.

پرسەکە زۆر سادەیە: ئەم کارە پشك پشك ناشێ ئەنجامی بدەی. لە دەست ئەم یان ئەو بانکیش نایە. لە توانای حکوومەتێکیش بەدەرە. بۆ باشترکردنی دیموکراسی و دوابەدوای ئەویش رێگەگرتن لە جەنگ، رێکخراوێکی نێودەوڵەتی پێویستە کە لە پەنا دەسەڵاتی ئابووریدا خاوەنی دەسەڵاتی سیاسیش بێ. دڵی رێگەچارەی سەرکەوتنی دیموکراتییەت هەر لەم خاڵەدایە:

رێکخراوێکی نێودەوڵەتی بە دەسەڵاتی سیاسی و ئابوورییەوە: واتە دەوڵەتێکی نێونەتەوەیی.

ئەم رێگەچارەیە جیددی و شۆڕشگێڕانە دێتە بەرچاو. هەر واشە، جیددی و شۆڕشگێڕانەیە.

بەڵام دنیا بەبێ ئەم رێگەچارە سادەیەش، هەروا درێژە بە پەلەقاژە و تەقەللاکانی دەدات. ئێمە دیسان خاوە خاو دەکەین و پینە دەکەین و خۆدەخافڵێنین. بەڵام دواجار، ئەم دەوڵەتە دادەمەزرێنین. ئێمە هەنگاومان بەرەو دەوڵەتی نێونەتەوەیی ناوە.

هەندێ رەخنە و دژایەتیکردنی تیۆری دەوڵەتی نێونەتەوەیی هەن:

**رەخنەی ژمارە یەك:** "خەڵك ئامادەی جیهانگەرایی نین، دنیا لە هەموو کاتێك زیاتر، نەتەوەخوازە."

ئەم بابەتە لۆژیکی دێتە بەرچاو، بەڵام لە راستیدا وا نییە. نەتەوەخوازیی روو لە زیادی ئێستا، لە ترس و نائارامییەوە سەرچاوەی گرتووە. هەر ئەو نائارامییە بەشبەحاڵی خۆی دەبێتە هۆی هەستی نائارامی و ترس و تۆقانی زیاتر و کەواتە هەمیشە خۆی پاراو دەکا و گەورەتر و خراپتر دەبێ. بۆ چوونە ناو سەردەمی



جیهانگەرایییەوە تۆ ناتوانی سەبر بگری نەتەوەخوازی لەناو بچێ. نەتەوەخوازی ئەگەر بە دەست خۆی بێ هەرگیز لەناو ناچێ. کاتێ لاواز دەبێ کە جیهانگەرایی لە ئارادا بێ. جیهانگەرایی یارمەتی دەدا تا ئارامی هەبێ و ئارامی ترس لەناو دەبات. ئەگەر ترس نەبێ، نەتەوەخوازیش نامێنێ. حکوومەتی نێونەتەوەیی، نەتەوەخوازی کاڵ دەکاتەوە و بەم جۆرە مەترسیی شەڕ کەم دەبێتەوە.

**رەخنەی ژمارە دوو:** "مرۆڤێك کە دیموکراسی دەوێ و لە قۆرخکەرانی دەسەڵات تۆقیوە، چۆن دەتوانێ لایەنگری لە زلهێزێك بکا کە بە هەمان ئەرك و پانتایی چالاکییەوە، دەیەوێ دەسەڵاتی سامناکی خۆی لە سەر دنیا پیادە بکا؟"

دنیا شایەدی فراوانبوونی دەسەڵاتی ئەمریکا و رووسیا و بەرتەسك بوونەوەی سنووری سەربەخۆیی گەلێ لە وڵاتە بچووکترەکانە. ئەم دۆخە لەمەودواش درێژەی دەبێ و هەموو نەتەوە بچووکەکان لەوانەیە ببنە گۆڕەپانی ململانێیەك کە لەودا دوو زلهێزەکە بۆ باڵادەستیی خۆیان شەڕ دەکەن، جا مەگەر دەسەڵاتێکی نێونەتەوەیی پێکبێ کە لە بەرامبەر بەهێزاندا پارێزگاری لە بێهێزەکان بکا. لە نەبوونی حکوومەتێکی نێونەتەوەییدا، تەنیا یەك نەتەوە- کە تەنیا دەشێ ئەمریکا یان رووسیا بێ - بەسەر دنیا دا حوکم دەکا و گشت نەتەوەکانی دی دەکاتە ملکەچی خۆی. لە راستیدا ئەوەش زل حکوومەتێکە بە دەسەڵاتی بێسنوورەوە. بەر لە روودانی کارەساتێکی وا و لەسەردەمێکدا کە دیموکراسییەکان، چ گەورە و چ بچووك، هێشتا خاوەنی ئازادیی کردەوەن" دەبێ لە یەکێتییەکی نێودەوڵەتیدا یەك بگرن. حکوومەتی هەڵقولاو لەو یەکێتییە، دەتوانێ سوود لە کۆمەڵە مافێك وەربگرێ، بەڵام حکوومەتەکانی ئەندامی یەکێتییەکەش، واتە نەتەوەکانی ئێستا، هەمان مافیان دەبن. سیستەمی لێپێچینەوە و هێورکردنەوە، کۆنترۆڵ و راگرتنی دوولایەنە، بەهێزەکان سنووردار دەکا، کۆنفیدراسیۆنی ناوچەیی لە ئەورووپا، ئاسیا، ئەمریکای لاتین و ئەفریقیا دەتوانێ هەموو جۆرە پێ لێهەڵبڕینێکی لەرادەبەدەری هەر هێزێك بباتە ژێر پرسیار، هێزێك کە - لە هەموو حاڵەتێکی گریمانەییدا-

ناتوانێ هەموو جۆرە کێشەکانی مرۆڤ چارەسەر بکا. ئەمە باشترین شانسی مانەوەیە بۆ حکوومەتە بچووکەکان، لەوێوە کە دەوڵەتی نێونەتەوەیی تەنیا شانسی پاراستنی دیموکراسی و ئاشتییە، دەبێ بە لای زلهێزێکی وەك ویلایەتە یەکگرتووەکانیشەوە سەرنجڕاکێش بێ.

**رەخنەی ژمارە سێ:** "بۆچی رووسیا بە ئەنقەست لە دەوڵەتی نێونەتەوەیی پێشنیارکراو دەردەهاوێژرێ؟"

رووسیا بەم هۆیە دەردەهاوێژرێ کە بۆ بەهێز کردنی دیموکراسیی سەرمایەداری، ئابووریی تێکەڵاو یان سۆسیال دیموکراسی کار ناکا. بۆلشەڤیزم لە را و کردەوەدا دژی دیموکراسیی سەرمایەداری، ئابووریی تێکەڵاو و سۆسیال دیموکراسییە. وتەبێژ و لایەنگرەکانی رقیان لەو شێوازانەیە و هێرشیان دەکەنە سەر. دەی جا چۆن دەکرێ چاوەڕوانی ئەوە بین رووسیا کار بۆ بەهێزکردنیان بکا؟

دنیای دیموکراسی لە پێناو خۆلادان لە شەڕ و درێژەکێشان و مانەوەی خۆی، دەبێ گرفتەکانی دیموکراسی چارەسەر بکا. دیکتاتۆریی سۆڤیەت، ئاشکرایە حەز ناکا لە چارەسەرکردنی ئەو گرفتانەدا بەشدار بێ، بە پێچەوانەوە، لە ئەڵمانیا، چین و یونان و تەقریبەن هەموو جێگایەك پەرەشی پێداون. دنیای دیمۆکراسی بۆیە لە بارودۆخی شڕ و ئاڵۆزی ئێستادا ماوە چونکە لە کارکردن بۆ گۆڕین و چاکسازیی پێویست وەدرەنگ کەوتووە. ئەم درەنگ بوونە هەلێکی زێڕینی بۆ کۆمۆنیزم رەخساندووە تا پەرە بگرێ. ئێستا دێموکراسییەکان دەبێ گۆڕانیان تێدا بکرێ، چاکسازی بکرێن و بەم جۆرە بەر بە کۆمۆنیزم بگرن. بەڵام رووسیا بۆ بەرگرتن بە کۆمۆنیزم، ئامادە نییە.

دیپلۆماتەکان چەنەیان شل بوو هێندەی لەگەڵ رووسیا باسی پێکهێنانی دنیایەکی بابەتییانە و دامودەزگایەکی بابەتییانە بکەن. ئەوان بە شێلگیرییەوە هیوادارن کە لەو دنیا و لەو دامودەزگایانەدا، دیموکراسی گەشە دەکا و کۆمۆنیزم پێیەکانی هەڵدەکێشێتەوە. بەڵام ئەمانە بەراستی پێیان وایە مۆسکۆ لە ئەنجامدانی



ئەو ئەرکەدا هاوکارییان دەکات. ئایا ئەمانە بەراستی لە سەر ئەو باوەڕەن کە کۆبوونەوە و چەندلێدانەکانیان، تامەزرۆیی رەگداکوتاوی رووسیا بۆ پەرەپێدانی کۆمۆنیزم دەگۆڕێ یان بە پێچەوانەوە، ئەمان خۆیان وەك کۆمەڵە کەسێکی دێموکرات، بڕوایان بە بەرتەسك کردنەوەی کۆمۆنیزم، لاواز دەبێ؟

رووسیا و دێموکراسییەکان ئامانجی لێکدژیان هەن. چۆن دەتوانن پێکەوە هەنگاو بنێن؟

بۆ ئاشتی؟ ئاشتی بە هەڵوێستی چەقبەستووی دۆگم و وەستاو بەدی نایە. گەلان لە سەردەمی ئاشتیدا ململانێی یەکتر دەکەن. هەمیشە کردوویانە، ئێستاش هەروەتر!

ئەمڕۆکە، ئەو ململانێیە زۆر توندە. ئەم هەقیقەتە کە بۆ ساڵێك وای دابنێ دنیا لە ئاشتیدا دەژی، بەو مانایە نییە کە ئاشتی بەرەو لاوازبوون و پێشێل کردن ناچێ. ئاشتی دەشێ لە لایەکی دیکەوە بەو مانایەش بێ کە **دنیا بەرەو شەڕ بەڕێوەیە.** زۆربەی جاریش هەر بەو مانایە بووە. دنیا جگە لە چین و ئیسپانیا، لە ساڵانی **١٩٣٧**و **١٩٣٨**دا بە رواڵەت لە ئاشتیدا بوو. بەڵام لە راستیدا ئەمە ئاشتی نەبوو و ئەگەر دیموکراسیەکان بیانزانیبا ئەو دۆخە نیشانەی ئاشتی نییە، لەوانەیە کارێکی وایان کردبا جەنگی دووەمی جیهانی روونەدات.

کەواتە ئەوە بەس نییە بڵێی: "من ئاشتیم دەوێ". دەبێ ئاشتییەکت بوێ کە بەرایی جەنگ نەبێ و خۆئامادەکردن نەبێ بۆ جەنگ. ئێمە بەهەرحاڵ چەند ساڵێك لە ئاشتیدا دەبین: ئاشتی و ئارامیی دەرەنجامی ماندوویەتیی جەستەیی و رۆحی. لە نێوان ئەو مەودا زەمانییەدا چ رووداوێك خەریکی گووران و قەومان دەبێ؟ ئەگەر بڕیار بێ ئەم مەودایە بە شەڕی ئایدیۆلۆژییەکان و بیروڕای سیاسی پڕ بێتەوە، کەواتە دەکرێ بڵێین ئاشتی نییە و وا باشترە ئێمە باشتری بناسین و باشتری پێناسە بکەین.

ئەو کەسەی دەنەڕێنێ: "ئاشتی، ئاشتی"[٥٣] ، دەبێ پێ لە هەبوونی پرسیاری گرنگی شەڕی سیاسی بەرامبەر خۆی بنێ. ئایا پێشنیار دەکا کە دیموکراسییەکان لە سەرانسەری دنیادا دێموکراسی بەهێز بکەن؟ ئەگەر وەڵام نا بێ، کەواتە لایەنگری فراوانبوونی کۆمۆنیزمە و کارەکە بە شەڕ یان لەناوچوونی دێموکراسی کۆتایی پێدێ. ئەگەر وەڵامیش بەڵێ بێ، ئەگەر دەیەوێ لە شەڕی سیاسیدا بۆ دیموکراسی و بەرامبەر بە کۆمۆنیزم بەشدار بێ، ئەو کاتەیە کە ناتوانێ لەو شەڕەدا، شان بە شانی رووسیای کۆمۆنیست یا یۆگسلافیای کۆمۆنیست یان کۆلۆنییەکانی رووسیا خەبات بکا.

حکوومەتی سۆڤیەت نیشانەی بەرچاوی ئێجگار کەمی لە ئامادەیی خۆی بۆ هاوکاری و چارەسەری کێشە سیاسی، سەربازی، ئابووری، کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەکانی سەردەمی ئاشتی لەسەر ئاستی دنیادا لە خۆی نیشان داوە، ئەڵبەتە ئەگەر قەبووڵ بکەین کە لە جێدا نیشانەی ئەوتۆ هەبوونە. کاتێ واز لە مشتومڕ لە سەر شتی گشتی دێنین و دێینە سەر نموونە راستەکانی هاوکاری، دۆزینەوەی ئەو نیشانانە زەحمەت و لەراستیدا مەحاڵ دەبێ. کەواتە نابێ دەرفەت بە هزرێکی وەك: "یەك دنیامان زیاتر نییە! کەواتە دەبێ لەگەڵ دراوسێ بسازێین" بدرێ تا یەکێتیی و یەکبوونی واقیعی و باشترکردنی دیمۆکراسیی جیهانی وەدرەنگی بخا.

دوو خێزان کە لە خانوویەکدا، هاومالّی یەکترین" لەوانەیە لە سەرەتای هاومالّەتیدا، وشە و دەستەواژەی زۆر جوان و رێزدارانە بەرامبەر یەکتری دەربڕن. بەڵام کاتێ دەست دەکەن بە مشتومڕ لە سەر نۆرەی گەسك لێدان یان بەشە

(٥٣) گرووپکەلی لایەنگری ئاشتی لە سەرانسەری دنیادا، دوای جەنگی دووەم، بە ئاماژەی سۆڤیەت و بە رێکخستن و سەرۆکایەتی شاراوە و دابینکردنی دارایی حیزب و تاقمە کۆمۆنیستەکان دامەزران تا وێڕای شاردنەوەی وابەستەیی خۆیان خەڵکانێکی بێئاگاتر و فراوانتر بەرەو دروشمی جوانی ئاشتی رابکێشن، بەڵام لە راستیدا بیانکەنە تابووری پێنجەمی سیاسەتی یەکێتی سۆڤیەت.



مەسرەفی ئاو و کارەبا و گاز، لەوانەیە وا باشتر بێ یەکیان ماڵەکەی بۆ شوێنێکی تر بار بکا تا دۆستایەتییان تێك نەچێ.

پینەدۆز رێیان ناکەوێ لە ئەنجوومەنی زانایانی ئەتۆمیدا ببنە ئەندام. فاشیستەکانیش لە رێکخراوێکی لیبراڵدا وەرناگیرێن. لیبراڵەکانیش، لە حیزبێکی کۆمۆنیستیدا وەرناگیرێن. لادانی کەسەکان بە پێی پێشمەرج یان بەرژەوەندیی دزێوی تاکەکەسی، کارێکی ناشایستە. بەڵام لادانیان بە گوێرەی لێکدژیی بۆچوون و کرداریان، رۆڵ و دەورە تایبەتە راگەیەنراوەکانی خۆیان، راستییەکی رۆژانە و بێ ئەملاولایە.

دەرهاویشتنی یەکێتی سۆڤیەت لە کۆڕی دەوڵەتی نێونەتەوەیی، بە هۆی دوژمنایەتیکردنی خەڵکی یەکێتی سۆڤیەت نییە، بەڵکو تەنیا بە مانای ناسینی ئەو بەرژەوەندی و کارە تایبەتە جۆراوجۆرانەیە کە بە پێی ئەزموون و پێشینە، بوونەتە کۆسپی هاوکاریی رووسیا لەگەڵ دنیای غەیرە سۆڤیەتدا.

دامەزرانی دەوڵەتێکی نێونەتەوەیی لە ناخی دنیای دیموکراتیدا، بەڵام بە بێ رووسیا، بە قازانجی خەڵکانی یەکێتی سۆڤیەت تەواو دەبێ. چونکە ئەگەر دیموکراسییەکان دەست بە تێگەیشتنی ئەو بابەتە بکەن کە ئاشتی پێویستی بە چارەسەری دیموکراتیانەی کێشەکانی خودی خۆیان هەیە و ئەگەر، لە جیاتی سەرقاڵبوون بە دانوستانی بێکەڵك و ئازاردەر لەگەڵ مۆسکۆ، یەکێتییەك بۆ چارەسەری هەمان گرفتە ناوخۆیەکان پێکبێنن، دەتوانن واز لە هەر چەشنە بیرکردنەوەیەك بێنن کە ئارامی و شادومانی داهاتوویان بە شەڕێك لەگەڵ روسیا دەبەستێتەوە. جگە لەوە دەوڵەتی نێونەتەوەیی، دەتوانێ رێگە لە داگیرکردنی وڵاتە لاوازەکان لە لایەن رووسیاوە بگرێ. دەوڵەتی نێونەتەوەیی، دەکرێ لە رووسیا بەهێزتر بێ. بەم جۆرە کۆنترۆڵەی رووسیا، دەکرێ بەر بە قەومانی شەڕی سێهەم بگیرێ. قۆناخێکی دوورودرێژ لە ئاشتی و ئارامی، دەتوانێ دیموکراسی پێشکەشی رووسیاش بکات.

ئەورۆکە، ئالۆزی و لێك زویر بوون، لە نێوان دنیای دیموکراتی و رووسیادا توندە و لە حاڵی پەرەگرتندایە. ئەم دۆخە مەترسیدارە. هەموو گرفتەکان لەوەوە سەرچاوە دەگرن کە هەر دووك دنیا لە یەك ماڵدا دەژین و، هەوڵ دەدەن کێشە لە چارە نەهاتووەکانی ئەنجامی ژیانی هاوبەش چارەسەر بکەن. با ئەم دووە لێك جیا ببنەوە، ئەودەم پەیوەندیی بازرگانی و پەیوەندیی دیپلۆماتی لەگەڵ رووسیا باش دەبێتەوە.

ئەگەر دیموکراسییەکان ئامرازێکیان هەبێ کە کەموکووڕی و تەخسیرەکانی خۆیانی پێ لابەرن. دەشێ ترسان لە رووسیا، دوژمنایەتی لەگەڵ رووسیا و بیرکردنەوەی شەڕ لەگەڵ رووسیا کۆتاییان پێبێت. ئەوان دەتوانن و دەبێ داوەرووکێنە ئەو کارە. سەرکەوتن لە راپەڕاندنی ئەو ئەرکەدا بە مانای رێگەچارەی خودی ئاشتییە.

پاراستنی ئاشتی نە بە چەکەوە بەندە و نە بە دیپلۆماسییەوە. ئاشتی بە خۆبنیاتنانەوەی ئابووری، سیاسی و ئەخلاقی و هەروەها بە جیهانگەراییەوە بەندە.

**رەخنەی ژمارە چوار:** "رێکخراوی نەتەوەکان لەو نێوەدا چی بەسەردێت؟ ئاخۆ دەوڵەتی نێونەتەوەیی جێگای رێکخراوی نەتەوکان دەگرێتەوە و بەم جۆرە هەڵیدەوەشێنێتەوە؟"

حکوومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان کە لە رای گشتیی خۆی دەترسێ کە نەکا دژی ئەندامێتی ئەو لە رێکخراوی نەتەوەکان بێ و بەم شێوەیە رێکخراوەکە تووشی هەمان شکست و فەشەل بکەن کە بە دژایەتیکردنی خۆیان کۆمەڵی نەتەوەکانی پێشوویان بەو دەردە برد، لە پروپاگەندەی خۆی لە ساڵانی ١٩٤٤ و ١٩٤٥دا بە زێدەڕۆییەوە بەو رێکخراوەی هەڵگوت. بەم کارە کۆمەڵێك هیوا و چاوەڕوانی بەرامبەر رێکخراوەکە دروست بوو کە زێدەڕۆیانە و بێ بنەما بوون. راستییەکەی ئەوەیە کە ئەم رێکخراوە سوودی زۆری هەیە، بەڵام بۆ چارەسەرکردنی کێشە گەورە سیاسی و ئابوورییەکان، ئامرازی پێویستی بە دەستەوە نییە. هەر لە سەرەتای



کارەکەیەوە دەبینین کە سیاسەتوانان هەر بەو جۆرە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکەن کە دەوڵەتەکان لەگەڵ کۆمەڵی نەتەوەکان کردیان. ئەوان بایەخ بە رێکخراوەکە نادەن. لە راستیدا ئەمە زلهێزەکان بوون کە بەرپێنەیان خستە بەر ئابلۆقەی نەوتی و ئابلۆقەکانی دیکەی کۆمەڵی نەتەوەکان لە دژی ئیتاڵیای فاشیست. دوای ئەو شکستە، کێشەی ئیسپانیا کەوتە بەر دەست کۆمیتەی دەست تێوەرنەدەری لەندەن. کۆمیتەیەك کە بە شێوەیەکی قێزەون لە ئامانجی خۆی لایدا و یارمەتیی فرانکۆی فاشیستی دا سەربکەوێ. لە کاتی لووتکەی قەیرانەکانی چێکوسلۆڤاکیا لە سێپتەمبەری ١٩٣٨دا، هەرچەند کە هێشتا دانیشتنی کۆمەڵی نەتەوەکان لەو بارەوە درێژەی هەبوو، باس و هەڵسەنگاندنی قەیرانەکە بێدەنگەی لێکرا و پاشماوەی کارەکە کەوتە دەستی نادڵسۆزانەی *نویل چەمبرلین* و *ئیدوار دالادیە*. ئەم دووەش، بەپەلە بەرەو قەسابخانەکەی مونیخ کەوتنە رێ و لەوێ کوشت و کوشتارێکیان وەڕێ خست هەر مەپرسە!

ئێستاکەش، بە هەمان شێوەی جاران، کێشە بە راستی قەیراناوییە گەورەکان لە دەرەوەی رێکخراوی نەتەوەکان چارەسەر دەکرێن، چونکە رێکخراوەکە نە پارەی هەیە، نە هێزی پۆلیس، نە دەسەڵات و هێز.

گەورەترین خاڵی لاوازیشی مافی ڤیتۆیە. بە پێی دەقی پەیماننامەی سان فرانسیسکۆ، کە هێندەی گەیشتنە عەرشی خوا پەسن درا، تەنیا ئەنجوومەنی ئاسایشی رێکخراوی نەتەوەکان دەتوانێ بە وەستانەوەی خۆی بەرامبەر دەستدرێژیکەر رێگە لە هەڵگیرسانی شەڕ بگرێ.

ئەنجوومەنی ئاسایش یازدە ئەندامی هەیە.[٥٤] پێنج هێزی گەورە (ویلایەتە یەکگرتووەکان، یەکێتی سۆڤیەت، بەریتانیا، فەڕەنسا و چین) کە ئەندامی هەمیشەیین و ٦ وڵاتی مامناوەندی یان بچووکی هەڵبژێراو لە کەم ماوەدا. هەر کام

(٥٤) دیارە ئەوە هی ساڵی ١٩٤٧ە، ئەمڕۆکە (ساڵی ٢٠٠٥) دە ئەندامی ناهەمیشەیی هەن و بڕیار وایە زیاتریش بکرێن.

لە ئەندامە هەمیشەییەکان خاوەنی مافی ڤیتیۆن. گریمان یەك لەو پێنج زلهێزە دەست بداتە دەستدرێژییەك. دە ئەندامەکەی دیکەی دەستەی (منصفه) دەبێ ئەو بە تاوانبار بناسن، بەڵام چونکە یازدەمین ئەندام واتە هەمان دەستدرێژیکەرە تاوانبارەکە دەنگی نەرێنی دەدا، بۆیە ڕێکخراوی نەتەوەکان، وەك ڕێکخراوێکی هەڵقوڵاو لە هەموو نەتەوەکان، ناتوانێ هیچ کارێك بکا. ئەندامەکانی دەبێ لە دەرەوەی ڕێکخراوەکە دەست بەکاربن و بەم کارە ڕێکخراوی نەتەوەکان هەڵوەشێننەوە تا بتوانن هەنگاوێك بۆ ئاشتی هەڵگرن. ئاشکرایە **ڤیتۆ** دەرکەوتەی شەڕخوازانەی دەسەڵاتی نەتەوەییە: "نەتەوەیەك کە بەهێزە لەسەرەوەی یاسایە". لێرەدا حوکمی **دەسەڵاتە** کە قسەی دەڕوا.

ئەم خاڵەش زۆر زۆر سەرنجڕاکێشە کە مافی ڤیتۆ بە پێداگریی ویلایەتە یەکگرتووەکان، واتە بەهێزترین نەتەوە و هەروەها ڕووسیا، واتە شەیداترین نەتەوە بۆ دەسەڵات، لە پەیماننامەی سان فرانسیسکۆدا گونجێنرا. بەڵام، ئەوە حکوومەتی سۆڤیەتە کە لە ڕێکخراوی نەتەوەکان چەندین جار سوودی لە مافی ڤیتۆ وەرگرتووە، نەك ویلایەتە یەکگرتووەکان.

دەسەڵات بە یاسایەك لغاو دەکرێ کە هێزێکی گەورەی لە پشتەوە بێ. نەتەوەی بەهێز بۆ پاراستنی خۆی، کەمترین پێویستی بە هێزی بەڕێوەبردنی یاسا و کەمترین حەزی لە یاسایەکە کە بتوانێ لە کاتی قوربانی بوونی گریمانەییدا بیپارێزێ.

ویلایەتە یەکگرتووەکان نیشانی داوە کە ئامادەیە دەست لە بەشێك لە مافی ڤیتۆی خۆی هەڵگرێ.

زۆر دەوڵەتی وەك چین، ئوستراڵیا، هۆڵاند، زلاندنو و بەریتانیا و... ڕێکخراوە گەورەکان و کەسایەتییە بەرزەکان و گەلێکی تریش، بە ئاشکرا هێرشیان کردۆتە سەر ڤیتۆ بە مانای تێکدەرەی ئاشتی. بەڵام حکوومەتی سۆڤیەت، بەتوندی و بێبەزەییانە بەدژی هەر جۆرە بەرتەسك کردنەوەیەکی ڤیتۆ وەستاوەتەوە و ئەوی ڕەخنەی لە بەکارهێنانی گرتبێ، سەرکۆنەی کردووە. ئەم بەرگریکردنە، لە ڕوانگەی



نەتەوەخوازیی نوێی ڕووسیای لە ناوخۆدا، سروشتییە. ئەو کاتەی کە ڕووسەکان لە خاکی خۆیاندا کەمتر نەتەوەخواز بوون، بەرگرییان لە سەروەریی نەتەوەیی لەم جۆرە نەدەکرد.

ڤیتۆ دەبێ هەڵبوەشێتەوە. ئەم کارە هەنگاوێکی گەورەیە بەرەو گۆڕینی ڕێکخراوی نەتەوەکان بۆ دەوڵەتێکی نێونەتەوەیی بە ڕاستی کاریگەر و چالاك.

هەندێك دەڵێن یەکێتی سۆڤیەت بەبێ مافی ڤیتۆ هەمیشە وا هەست دەکا لەلایەن تێکەڵەیەك لە وڵاتانی سەرمایەدارییەوە لە دەنگداندا شکست دێنێ. بەڵام لەو لاوە، لە سایەی ڤیتۆوە ڕووسیا دەتوانێ هەموو هێزەکانی تر ببەستێتەوە. بە دەربڕینێکی تر بە گوێرەی ئەو بیرۆکە سەیر و سەمەرەیە، ئەگەر **زۆرینە** بتوانێ لە دەنگداندا ڕووسیا شکست بدا، هەڵەیە، بەڵام بۆ ڕوسیا بە تەنێ، زۆر باش دەبێ بتوانێ زۆرینەکە لە بەدەستهێنانی دەنگدا بۆڕ بدات. ئەمەیە لێکدانەوەی دیکتاتۆری. ئەمە ناسیۆنالیزمێکە کە لە ئایین هەڵگەڕاوەتەوە و بۆلشەڤیکی لێ دەرچووە. ئەگەر ڕووسیا بەرامبەر بە هێزەکانی غەیری سۆڤیەت، هەست بە دوژمنایەتییەکی نەگۆڕ دەکا، ڕێکخراوی نەتەوەکان چۆن دەتوانێ ڕۆژگارێك، ڕۆڵی خۆی ببینێ؟

ڤیتۆ دەبێ بسڕێتەوە. خۆ ئەگەر ڕووسیا نارازی بوو دەتوانێ لە ڕێکخراوی نەتەوەکان بچێتە دەرەوە و هەرکات ئامادە بوو قەبووڵی بکا کە تەنیا کۆڵەکەیەك کە ڕێکخراوی نەتەوەکان دەتوانێ لەسەری ڕابوەستێ **جیهانگەرایی**یە، هەمیشە پێڵاوی لە بان چاوان دەبێ.

کۆمیساری دەرەوەی ڕووسیا، *ماکسیم لیت ڤینۆف* قارەمانی بەرز و ڕەمزی ئاسایشی بە کۆمەڵ بوو. تا ئەوەی هاوکات لەگەڵ قۆناغی ئێستاکەی فراوانخوازیی مۆسکۆدا، ستالین لە ساڵی **١٩٣٩**دا لایدا. لیت ڤینۆف وەك سەرۆکی شاندی نوێنەرایەتیی وڵاتەکەی خۆی لە گفتوگۆکانی کۆمەڵی نەتەوەکان لە ژنێف، بەردەوام هێرشی دەکردە سەر هزری **جیهانگەرایی**.

ئەو بڕوای بە جیهان شموولی یان هاوڕایی و یەکێتی بیروڕا نەبوو، چونکە ئەم ئایدیایە دەرفەتی بە ئەڵمانیا، ئیتاڵیا، یان ژاپۆن دا کە کۆمەڵی نەتەوەکان سەقەت بکەن و پەکی بخەن. لیت ڤینۆف بە ئەنقەست لە کۆبوونەوەی سێپتەمبەری **١٩٣٧دا** بەسەر ئیتالیادا بازی دا. لەم دانیشتنەدا لە بارەی ڕێگەگرتن لە **ژێردەریاییە نەناسراوەکانی** مۆسولینی بە دژی ئەو کەشتیانەی کەلوپەلیان بۆ کۆماریخوازەکانی ئیسپانیا بار دەکرد، گفتوگۆ کرا. ئەو دەیزانی بەشدار بوونی ئیتاڵیا، کۆبوونەوەکان دەشێوێنێ. ئیتاڵیا لەوێ نەبوو، لە ئەنجامدا بەشدارەکانی تر ڕێککەوتن و، تا ماوەیەك پاسەوانە دەریاییەکانی ئینگلیز - فەڕەنسا توانیان ڕێگە لە ڕێگریی فاشیستان لە مەدیتەرانەدا بگرن.

ڤیتۆ بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ واتە **نەبوونی یەکێتی بیروڕا** و **لە ئارادانەبوونی جیهان شموولی** و گۆپاڵێکە بە دەست نەتەوەی دەستدرێژیکەری بێ یاساوە. ڤیتۆ دیکتاتۆریی نەتەوەیەکە کە یەك کەس حوکمی بەسەردا دەکات. ڕێکخراوی نەتەوەکانی لەم جۆرە، ناتوانێ دیموکراسی ڕزگار بکات، ستالینیش مەرەقی نییە دیموکراسی ڕزگار بێت!

تادێ کۆڕ و کەسی کەمتر پەیدا دەبن کە ئازایانە و سەرسەختانە هەوڵ بدەن ئەو مافە بە شێوەیەکی دروست و بۆ ئامانجی خێر بەکار بێنن. کۆمەڵی نەتەوەکان لەو جۆرە کۆڕ و کەسانەی هەبوون، بەڵام سیاسەتمەدارە پلە بەرزەکان، زۆربەیان ڕێکخراوی نەتەوەکانیان بۆ ئەوە بوو بەرپێنە بخەنە بەر پێی یەکتری و لایەنی بەرامبەر تووشی شەرمەزاری و سەرشۆڕی بکەن.

ڕێکخراوی نەتەوەکان کە بۆ دەرمانکردنی زامەکانی ئەم جیهانە خاکییە چی لە دەست نەیە، بە کەڵکی چی دێت؟

ڕێکخراوی نەتەوەکان ئەگەر ڕووسیای لەگەڵدا بێ زۆر باشترە، بە مەرجێ ڕووسیا لایەنگری ئاشتی و ئازادی بێ. بەڵام ڕێکخراوی نەتەوەکان زۆر باشترە ڕووسیای لەگەڵدا نەبێ ئەگەر ڕووسیا کۆسپ دروست بکات. هەر وەك تا ئێستا لە



ناوەوە و دەرەوەی ڕێکخراوی نەتەوەکان هەر خەریکی تەگەرە دروستکردن لە بەردەم ئەو کارانەدا بووە کە دنیای ئێمە بۆ ڕزگار بوون لە تیاچوون، بە قووڵی پێویستی پێیانە. تا ئەو کاتەی ڕێکخراوی نەتەوەکان نەبێتە ئامرازێك بۆ باشترکردنی دیموکراسی، ڕووسیا، ئەم ڕێکخراوە وەك چەکێك بۆ پرشوبڵاو کردنی دیموکراسییەکان و دواجار تێکشکاندنیان بەکار دێنێ. پەیماننامەی ڕێکخراوی نەتەوەکان بە بێ دواکەوتن دەبێ چاکبکرێ و بەم جۆرە بهێنرێتە سەر بیچمی دەوڵەتێکی کاریگەری نێونەتەوەیی کە بتوانص خۆشگوزەرانی، ئازادیی تاکەکەسی و ئاشتی دەستەبەر دەکا.

ڕێکخراوی نەتەوەکانی ئێستا ئەو دەوڵەتە نێونەتەوەییە نییە کە باسی لێوەکرا. دەبێ سەرلەنوێ دابڕێژرێتەوە تا ببێتێ، زۆر پێدەچێ لە لەحزەیەکدا کە نەتەوەکانی جیهان دەست بە دووبارە داڕشتنەوەی ڕێکخراوی نەتەوەکان دەکەنەوە، لە کردەوەدا پێیان نابێتە دامەزرانی دەوڵەتێکی نێونەتەوەیی، بەڵام بەبێ ڕووسیا. جێی داخە. بەڵام چی بکەین؟ وازهێنان لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی نێونەتەوەیی و دوابەدوای ئەوە بێبەش کردنی خۆمان و هەموان لە ئامرازی ئێجگار پێویستی ڕزگاریی ئاشتی و دیموکراسی؟ ئەمە باجێکی زۆر قورسە و لە دەرەوەی توانای نەتەوەکانی جیهانە بۆ ئەندامێتی ڕەسمی و کۆسپ دانەری ڕووسیا لە ڕێکخراوی نەتەوەکاندا.

بە بێ دەوڵەتێکی نێونەتەوەیی، مرۆڤایەتی هەروەك تا ئێستا وا بووە، بەرەو هەڵدێری ئاژاوە و تەفروتونا بوون دەچێ. درێژەی دۆخی ئێستا، دەتوانێ ئیمپریالیزمی ئەمریکایی و ئیمپریالیزمی ڕووسی لە سەر کۆشی خۆی پەروەردە بکا و گەشە پێبدا و دواجار بە شەڕێك لە نێوان ئەم دووە کۆتایی پێبێ. ئەمە باجێکی زۆر گرانە کە بۆ هاوکاری نەکردنی ڕووسیا لە ڕێکخراوی نەتەوەکاندا دەبێ بیدەین.

دامەزراندنی دەوڵەتێکی نێونەتەوەیی دەشێ لەوەی چاوەڕوان دەکرێ ساناتر بێ. ژمارەیەکی زۆر لە نووسینگە و بنکەکانی ڕێکخراوی نەتەوەکان کە ئەرکی زۆریان

پێ رادەپەڕێ، خەریکی کارن و رووسیاش حزووری تێیاندا نییە. دامەزراوگەلی نێونەتەوەیی دیکەش پێویستن. پلانی رەسمیی حکوومەتی ویلایەتە یەکگرتووکان ناسراو بە *باروخ* بۆ کۆنترۆڵکردنی وزەی ئەتۆم، پێشبینی دامەزراندنی *رێکخراوی گەشەپێدانی ئەتۆمی* ADAی دەکرد تا کاروباری گشت سەرچاوەکانی یۆرانیۆم و باقیی مادە قەڵشت هەڵگرەکان لە سەرانسەری دنیادا بەڕێوە ببات و هەروەها تاکە بەرهەمهێنەری بۆمبی ئەتۆم و لە کاتی پێویستدا، تاکە بەکارهێنەری بێ. رووسییەکان بە تووڕەیی و هەڵچوونەوە رەتیانکردەوە. *گرومیکۆ* باڵیۆزی رووسیا کە قسەی بۆ ستالین دەکرد، دەیگوت رێکخراوی گەشەپێدانی ئەتۆم شتێکی زیادەیە، هەر هێندە بەسە کارێك بکەین ئەمریکا هەموو بۆمبە ئەتۆمەکان فڕێ بدات و واز لە دروستکردنی بۆمبی دیکەش بێنێ. ئینجا کێ دەزانێ ئاخۆ رووسیا، یان ئەرژەنتین، یان ئیسپانیا، یان تورکیا بە نهێنی خەریکی دروستکردنی بۆمبن یان نا؟ ئایا ئەگەر ئەوە راست بێ ئاخۆ رووسیا لێدەگەڕێ بێ تەگەرە تێخستن پشکنینی قەڵەمڕەوەکەی بکرێ؟

کرملین چەندین جار نیشانەی لێڵی لەمەڕ قەبووڵکردنی ئیحتمالیی پشکنینی سنووردار دەربڕیوە. بەڵام پشکنینی سنووردار، لە بنەڕەتدا پشکنین نییە، کەواتە وەڵامی راستەقینە و کردەیی رووسیا بەم پرسە"نا"یە. دیکتاتۆری لێناگەڕێ بێگانەکان و تەنانەت هاووڵاتیانی خۆی ئازادانە بسووڕێنەوە و لێر و لەوێ رامێنن.

ئاندرێ گرومیکۆ جێگری وەزارەتی دەرەوەی سۆڤیەت لە وتاری خۆی لە ١٩ی مەی ١٩٤٧ دا لە نیویۆرك بە دژی پشکنینی دەست ئاوەڵای پێگە ئەتۆمییەکان وەستایەوە. چونکە بە پێچەوانەی"سەروەریی نەتەوەیی و سەربەخۆیی وڵاتان"ە.

ئەو لە درێژەدا گوتی: "رێکخراوی نەتەوەکان دامەزراوی حکوومەتە خۆبەڕێوەبەر و سەربەخۆکانە. پێشێلکردنی سەروەری و سەربەخۆیی ئەندامەکانی بە مانای رووخاندنی بناغەی هەبوونیەتی." بەڵام سەروەریی نەتەوەیی، بناغەی بێتوانایی رێکخراوی نەتەوەکان لە رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ هەڕەشەکانی



شەڕیشدایە. پەسندکردنی پلانی *باروخ* بۆ کۆنترۆڵی بۆمبی ئەتۆم، بوو بە خاڵێکی درەوشاوە لە سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکادا، چونکە راگەیاندنی بەیاننامەی ترۆمن لەمەڕ رزگاریی یونان و تورکیا لە فراوانخوازیی کۆمۆنیستی لێکەوتەوە. ئەگەر رووسیا لەوە ترسابایە ئەمریکا بۆمبی ئەتۆمی هەبێ، دەبوایە پلانی *باروخی* قەبووڵ کردبا. چونکە بە پێی ئەو پلانە، ویلایەتە یەکگرتووەکان وێڕای هەموو وڵاتان، نە دەیتوانی بۆمبی ئەتۆمی هەبێ و نە دروستی بکا.

بەڵام لەو لاشەوە هەر ئەم پلانە، نەیدەهێشت رووسیا تاهەتایە ببێتە خاوەن بۆمبی ئەتۆم و مۆسکۆ ئەمەی بە دڵ نەبوو. بۆیە پشتگیری لە پلانەکە نەکرد.

حکوومەتی سۆڤیەت دەیەوێ بۆمبی ئەتۆمی هەبێ. رووسیا مل بۆ هەبوونی بۆمبی ئەتۆم لەلایەن ئەمریکییەکانەوە رادەکێشێ، بۆ ئەوەی بۆخۆشی بتوانێ ئەو بۆمبە دروست بکا. بۆ؟

بە چەند هۆی مومکین: ستالین دەزانێ دیموکراسییەك، بەتایبەتی ئەمریکا، کە خەڵکەکەی بە هۆی بەکارهێنانی بۆمبی ئەتۆم لە هیرۆشیما و ناکازاکی خۆیان بە گوناهبار دەزانن، زەحمەتە مووشەکە ئەتۆمییەکانی بەسەر وڵاتە ئاشتیخوازەکاندا بەرداتەوە. ستالین لە بۆمبە ئەتۆمییەکانی ئەمریکا ناترسێ. بەڵام پێدەچێ وا بیر بکاتەوە کە هەبوونی بۆمب لە دەستی رووسیادا بەرامبەر بە ئەمریکایەك کە بە چڕیی دانیشتوانی زیاتر، شاری گەورە و ناوەندیی چڕوپڕی پیشەسازییەوە، زیان هەڵگرترە، باڵادەستییەکی تایبەتی پێدەبەخشێ. ئەو زیاتر بڕوای بە دەسەڵاتی نەتەوەییە تا رێکخراوێکی نێونەتەوەیی.

ملبادانی رووسیا لە نایاسایی کردنی بۆمبی ئەتۆم لە رێگەی جیهانگەراییەوە، زەبرێکی جددی بوو لە ئایدیای **دنیای یەکگرتوو** کەوت. ئەم زەبرە وێڕای نیشانەی زۆر و زەوەندی هاوکاری نەکردنی سۆڤیەت، بەرگرتن لە جەنگێکی ئەتۆمی لە رێگەی چوونە ناو شەڕێکی سیاسییەوە، ئێجگار پێویست دەکا.

یەکەم هەنگاو بەرەو سەرکەوتن لەم شەڕە سیاسییەدا، دامەزراندنی دەوڵەتێکی نێونەتەوەییە. دەوڵەتی نێونەتەوەیی دەتوانێ *ڕێکخراوی گەشەپێدانی ئەتۆم* بەڕێوە ببا، ڕێکخراوێك کە لە ژێر چاودێریی ئەودا، هەموو نەتەوەکان - ئەو نەتەوە پاشکەوتووانەش کە زۆریان پێویست بە سەرچاوەی نوێی وزەی پیشەسازییە - بتوانن بەو زووانە دەستیان بگاتە وزەی ئەتۆم و هەروەها پاراستن و پشتگیریی ڕێکخراوێك کە جبەخانەیەکی پڕ لە بۆمبی ئەتۆمی هەبێ.[٥٥]

دەوڵەتی نێونەتەوەیی، دەتوانێ هێزێکی پۆلیسی هەبێ. دەتوانێ بانکێکی نێونەتەوەیی بەڕێوە ببا کە هەر ئێستا دامەزراوە. دەتوانێ ناوچەی پیشەسازیی ڕۆهر بەڕێوە ببا. دەتوانێ پرۆژەگەلێك لەسەر ڕووباری زەرد لە چین، ڕاین لە ئەڵمانیا و ڕووبارەکانی دی بە ئەنجام بگەیەنێ. وەك *ڕێکخراوی گەشەپێدانی گەڵیی تێنسی*[٥٦] دەتوانێ بازرگانیی جیهانیی بێ گومرگ ڕێکبخا. دەتوانێ ئاڵوگۆڕی بەها فەرهەنگییەکان وەڕێ بخا (ڕێکخراوی نەتەوەکان *یۆنسکۆی* بۆ ئەم کارە هەیە، بەڵام ڕووسیا نەچۆتە ناویەوە.) هیوا هەیە کە بتوانێ بەرگری لە مافی مرۆڤ بکا. دەتوانێ چاودێری و سەرپەرشتی زێ و ڕێگەئاوییە نێونەتەوەییەکان (گەرووی داردانێلی تورکیا، کاناڵی سوئێزی میسر، جەبەلەلتارقی مەراکیش، گەرووی پاناما، ڕووباری ڕاین و هیتر) بکا و بەم کارە چاوچنۆکی و هەراکان ببڕێتەوە.

---

(٥٥) دیارە چەندین ساڵە کە پێویستی هەبوونی وزەی ئەتۆم وەك جێگرەوەی نەوت کەوتۆتە بەر گومان و وزەگەلی بێ مەترسی و هەرزانی بە تەکنەلۆژیی سادەترەوە، وەکو: گاز، کارەبا، خۆرەتاو، با، ئاو و شەپۆلی دەریا و... کەوتۆتە بەر سەرنجی نەتەوە و دەوڵەتە پیشەسازی و جووڵانەوە سەوزەکان . کەچی لەولاوە هەندێ وڵاتی دەوروبەری خۆمان دەبینین (وەك ئێران) گەیشتن بەو تەکنەلۆژییە بۆتە کێشەیەکی جیهانی و وەك کێشەی سەروەریی نەتەوەیی بە میللەتی دەقەبڵێنن تا کەمتەرخەمی و لاوازییەکانی حکوومەتی لەمەڕ هەژاری و گەندەڵی و نایەکسانی و نەخوێندەواری و دابین نەکردنی ئازادی و مافی هاوڵاتیی و مافی مرۆڤ لە ژێر سێبەری پڕوپاگەندەی جەنجاڵیی نێونەتەوەیی و ناوخۆ لە سەر ئەم ئامانجە و سەر بەگێچەڵی شێتانەی تاقیکراوەی پێ پەردەپۆش کەن.

(56) Tennessee Vally Authrity.



دەتوانێ کاری تایبەتیی گرنگ جێبەجێ بکا کە هیچ دەوڵەتێکی نەتەوەیی ناتوانێ ئەنجامی بدات.

دەوڵەتی جیهانی (نێونەتەوەیی) دەتوانێ ببێتە هۆکارێك بۆ کەم کردنەوەی دەسەڵاتی دەوڵەتە نەتەوەییەکان. بەم جۆرە ئەگەری سەرهەڵدانی دیکتاتۆرییە نەتەوەییەکان کەم بکاتەوە. جگە لەوە، بۆ نموونە دەتوانێ لە ناوچەی ڕۆهری ئەڵمانیا، ببێتە خاوەنی دامەزراوگەلی زەبەلاحی پیشەسازی. بە دڵنیاییەوە زۆربەی ئەوروپییەکان ئەم کارەیان پێ لە خاوەندارێتی سەرمایەدارێکی نێونەتەوەیی یان سەرمایەداریی ئەمریکی باشترە.

دەوڵەتی نێونەتەوەیی دەتوانێ بە چالاکییە ئابوورییەکانی، داهاتی پێویست بۆ خەرجییەکانی خۆی پەیدا بکا.

لە قۆناغی یەکەمدا، دەوڵەتی جیهانی دەتوانێ بانکێکی دەسەڵات بێ کە یەك یەکی نەتەوەکان دایانمەزراندووە. ئەم دەوڵەتە دەتوانێ دامەزراوەکانی ڕێکخراوی نەتەوەکان و ڕێکخراوی جۆراوجۆری نێونەتەوەیی بگرێتەخۆی کە بە یەکەوە گرێدراون.

بەڵام دەوڵەت، بەڕاستی دەوڵەت نییە مەگەر لەلایەن خەڵکەوە هەڵبژێردرابێ و مەگەر ئەوە کە دوای ئەوە یاسایەك جێگیر بکا کە خەڵکەکە بە یەکەوە گرێبدات - ئەم خاڵە هەمان لۆژیك بوو کە لە پێشنیاری *ئێرنست بوین* وەزیری دەرەوەی بەریتانیادا لە ڕۆژی ٢٣ی نۆڤەمبری ١٩٤٥ لە مەجلیسی پیرانی ئینگلیز خرایە ڕوو. پێشنیارەکە، مێژوویی بوو. دەیگوت: "ئێمە پێویستە ڕاڤەیەکی نوێ بۆ ئامانجی پێکهێنانی پەرلەمانێکی جیهانی بکەین کە ڕاستەوخۆ لەلایەن خەڵکی دنیاوە هەڵبژێردرابێ. ئەم خەڵکە، وەك گشتێك، کەسانێك دەبن کە دەوڵەتە دامەزرێنەرەکانی ڕێکخراوی نەتەوەکان بەرامبەریان بەرپرسیارن و لە ڕاستیدا یاسایەکی جیهانی پەسند دەکەن کە خۆیان (واتە خەڵکی دنیا) قەبووڵی دەکەن و بە شێوەیەکی ئەخلاقی پێی پابەند دەبن و حەز دەکەن بەڕێوە ببردرێ. چونکە

دەسەڵاتەکە لە دەنگی خۆیانەوە سەرچاوە دەگرێ و لە سەر شانی نوێنەرە راستەوخۆکانی خۆیانە کە داواکانیان وەدی بێنن."

جیهانگەرایی ئەمەیە. شتێکە تژی لە دیموکراسی. کەوابوو رووسیا بە توندی دژی ئەو جۆرە ئامانجە دەبێ. کەمتر لە چەند هەفتە دوای قسەکانی بوین، وەزیری دەرەوەی پێشوو *ئەنتۆنی ئادن* پێشنیارێکی لەو جۆرەی هێنا گۆڕێ، رادیۆی مۆسکۆ بە پێی هەمان بنەما، بوین و ئادنی مەحکوم کردن جگە لەوە **پەرلەمانە جیهانییەکەی** ئەوانی وەك شتێکی خەیاڵپلاو و زیانبار و کۆنەپەرستانە دایە بەر تەشەر و گاڵتەجاڕی.

بەڵام، حکوومەتی سۆڤیەت بە تەواوی بە دوای ئەو بابەتانەدا دەچێ.

دیکتاتۆرییەك چۆن دەتوانێ رێگە بە خەڵکی خۆی بدا بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانێکی جیهانی دەنگ بدەن – ئەویش بۆی هەبێ حیزبی نەیار و پاڵێوراوی نەیاریشی تێدا بن – لە حاڵێکدا ئێستا بۆ پەرلەمانی وڵاتەکەی خۆیان ناتوانن ئازادانە دەنگ بدەن؟

بەو هۆیانە تەنیا دیموکراسییەکان دەتوانن بەرەو دەوڵەتی نێونەتەوەیی هەنگاو هەڵگرن. ئەگەر چاوەڕوانی رووسیا بن، لەوانەیە هەرگیز ئەم کارە دەست پێنەکات. لەم حاڵەتەدایە کە رووسیا دەتوانێ بۆ هەمیشە دنیای دیموکراسی بە پارچە پارچەیی رابگرێ. واتە هەر ئەو شتەی ئاواتیەتی. دابەشکردنی دنیا لە سەر بنەمای دیموکراتی و نادیموکراتی، یارمەتیی مۆسکۆ دەدا دیموکراسی لاواز بکا و لەناوی ببات.

دەوڵەتی جیهانی، لەگەڵ رووسیادا مەحاڵە. بەڵام بە بێ رووسیا مومکینە. دەوڵەتی نێونەتەوەیی دەتوانێ هۆکاری ئەوەندە روون و راشکاوانە بخاتە روو و وەها بەرگری لە قازانجەکانی خۆی بکا کە وڵاتانی دەرەوەی بازنەی نفووزی رووسیا بتوانن خۆبەخشانە بێنە ناوی. بەڵام ئەوانیش تا کاتێك کە قازانجەکانی دەوڵەتی نێونەتەوەیی قەناعەتیان پێدێنێ کە ئەندامەتی لەم دەوڵەتەدا کارێکی ژیرانەیە،



دەتوانن درێژە بە رێگای خۆیان بدەن. هەریەك لە پاشکۆکانی رووسیاش دەتوانن بەم جۆرە بچنە پاڵی و بەم جۆرە پشتیوانیی پێویست بەرامبەر بە تۆڵەسەندنەوەی مۆسکۆ بە دەست بێنن. رۆژێك دادێ کە رووسیای دیموکراتیش بێتە ناو ئەو کۆڕەوە.

بنیاتنانی دەوڵەتی نێونەتەوەیی دەتوانێ بە خێرایی گشت کەشوهەوا و رۆحیاتی دنیای دیموکراتی بگۆڕێ. ئەم کۆڕە، دەتوانێ دەرمانی بەهێزکردنی کەس و نەتەوەکانیش بێ. ترسی بێ پسانەوەی ئەم سەردەمە لە قەومانی شەڕێکی تر، پیاو و ژنی وڵاتانی تووشی خەمۆکی و دڵەڕاوکی کردوون، مەگەر بە خێرایی شایەدی چوارچێوەیەکی چالاك بن کە پابەندی بەرگرتن لە شەڕ و نەهێشتنی هۆکارەکانی بێ. ئەم کارەش تەنیا بە دەوڵەتی نێونەتەوەیی دەکرێ.

دەوڵەتی نێونەتەوەیی، ئەگەر پێك بێ، دەتوانێ دەسەڵاتی کۆمۆنیزم لە دنیای دیموکراتیدا کەم بکاتەوە. کۆمۆنیستەکان لە هەموو شوێنێك نەتەوەخوازن. بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ئێمە، بەرامبەر بە مەترسیی بێگانان بەرگری لە نیشتمان دەکەین. بەم کارە خەڵك بۆ لای خۆیان رادەکێشن. بۆ وێنە لە فەڕەنسا کۆمۆنیستەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە بەرامبەر بە ئەڵمانیا رادەوەستن و فەڕەنسایەکی کۆمۆنیستی گرێدراو بە رووسیای کۆمۆنیستەوە، دەتوانێ هەڕەشەی ئەڵمانیا کۆتایی پێ بێنێ. بەڵام دەوڵەتێکی نێونەتەوەیی دەتوانێ ئاسایشی فەڕەنسا لە بەرامبەر ئەڵمانیادا تەزمین بکا" دەتوانێ هانی ئەڵمانیا بدا هاوکاریی ئابووریی فەڕەنسا بکا و بەم جۆرە میراتی نەفرەتی نێوان ئەو دوو نەتەوەیە لە ناو بەرێ" دەتوانێ گەرەنتیی سامان و خۆشگوزەرانی فەڕەنسا بکا. ئارامی و نەهێشتنی بارگرژیی سیاسی و ئابووری دەتوانێ کۆمۆنیستەکان لاواز بکا.

نەتەوەخوازی، دوورەپەرێزی، ترس لە شەڕ و ئامادەکاری بۆ شەڕ، یارمەتیی کۆمۆنیستان دەدا. کۆمۆنیستەکان توندوتیژی وەك تیۆری خۆیان بڵاو دەکەنەوە. ئەوان توندوتیژی بەکار دێنن. کۆمۆنیستەکان لە بەکارهێنانی توندوتیژیدا

مەعلانن. سەردەستەی جووڵانەوەکانی بەرگریی دژە فاشیستی لە ئەوروپا، کۆمۆنیستەکان بوون. لە مانگرتنەکاندا لە توندوتیژی ناپرینگێنەوە.

توندوتیژیی مەزهەبی لە هیند دنە دەدەن و سوودی لێوەردەگرن. کۆمۆنیستەکان ڕۆڵەی توندوتیژین و لە کەشوهەوای شەڕ و ئاژاوەدا گەشە دەکەن.

ئێمە لە سەردەمێکی پڕ توندوتیژیدا دەژین و ئەم دنیایە بە قازانجی کۆمۆنیست و فاشیستەکانە کە وەك ئامرازێکی شەرعیەت پێدراو دەڕواننە توندوتیژی. وا باشترە لێگەڕێین دێموکراسی، بە شێوازە ئاشتیخوازانەکانی خۆی، کێشەی نێوان وڵاتان و کێشە ناوخۆییەکانیان چارەسەر بکا، ئەودەم کۆمۆنیزم سیس هەڵدەگەڕێ.

دەوڵەتی نێونەتەوەیی دەتوانێ هەمان کاریگەریشی لەسەر نەزم و ئاسایش و ئەخلاقی جیهانی هەبێ. کاتێ دەوڵەتێك بە هێزی پۆلیسی پێویستەوە دەچێتە شارۆچکەیەکی دوورەدەست لە ڕۆژئاوای دڕندە کە کەوتبێتە دەست تاقمێك پیاوکوژی شەشلوول بەدەست، کار و کاسبی و ژیانی تاکەکەسی دەگەڕێتەوە سەر دۆخی ئاسایی خۆی، ڕێسای ئەخلاقی تاك و کۆ بەرز دەبێتەوە و بارگرژییەکان بزر دەبن، دنیای غەیری سۆڤیەت دڵنیا دەبێ کە ئەودەم خەڵکی ڕووسیاش ئۆخەی حەسانەوەیەکیان لە دڵی دەگەڕێ. من لە سەر ئەو بڕوایەم.

شیر و تفەنگی ڕاو لە جەنگی دووەمی جیهانیدا هیچیان پێنەکرا. بیری کۆن و ڕزیو و لەکارکەوتەش، لە شەڕی سیاسی بۆ دیموکراسیدا چی لە دەست نایە. لە سەردەمی ئەتۆم و ئەلەکترۆنیك و **توندفڕیی جێتدا**، جیهانگەرایی ڕێی لێناگیرێ. سیاسەت دەبێ هەنگاوی لەگەڵ زانست ڕێکبخا.

بەلای ڕووسیا و حیزبە کۆمۆنیست و فاشیستەکانەوە زۆر خۆشە کە سەرکردایەتیی نەتەوەخوازی بگرنە دەست، نەتەوەخوازی، ترس و ڕق و هەڵچوونی نالۆژیکی گەشە پێدەدا کە دیکتاتۆرییش لە سەر ئەوانە دەژی.



نەتەوەخوازی بۆیە دەهێنرێتە ئاراوە تا میللەتی ڕووس بیر لە جیاوازیی نێوان خۆی و دنیای دەرەوە بکاتەوە، نەك لە یەکبوونی مرۆڤ. هەر بیرێکی لە چەشنی برایەتیی مرۆڤ دەشێ بۆ ستالینگەرایی ژاری کوشندە بێ.

کاتێ ستالین، جیهانگەرایی بۆ نەتەوەگەرایی فڕێدا، هاوکات کەنیسەی کۆنی ئۆرتۆدۆکسی یونانیی ڕووسیای زیندوو کردەوە و هەوڵی دا خەرمانەیەکی پیرۆز لە دەوری سەری تزار و سوارچاك و شازادە فیۆداڵەکان بکێشێ. ئەمانە لەیەك سەرچاوە ئاو دەخۆنەوە.

کۆمۆنیزمی نەتەوەیی واتە هەمان رابردووی کۆنەپەرستی“ رابردوویەك کە ناتوانێ خۆی لەبەر دیموکراسیی پێشکەوتووی نێونەتەوەیی رابگرێ، تۆبلێی ساچمەزەن (تفەنگی چۆلەکەکوشتن) شەڕی پێ لەگەڵ بۆمبی ئەتۆم بکرێ؟

ململانێی نەتەوەگەرایی ئەمریکی و نەتەوەگەرایی ڕووسی دەشێ بە سەرکەوتنی نەتەوەگەراییەك بە سەر ئەوی دیکەدا و سەرکەوتنی دیکتاتۆریی وڵاتێك بە سەر هەموو دنیادا کۆتایی پێبێ، بەڵام ململانێی نێوان دیموکراسی و کۆمۆنیزمی نێونەتەوەیی، تەنیا دەشێ سەرکەوتنی دیموکراسی لێبکەوێتەوە، چونکە هەموو هێزە پێشکەوتووە عاقڵمەند و ئازادەکان پشتی ئەو دەگرن.

دیموکراسی، بۆ سەرکەوتنی خۆی، دەبێ لەوە دڵنیا بێ کە نوێنەری ڕاستەقینەی پێشکەوتن و عەقڵ و ئازادییە. **دەوڵەتی نێونەتەوەیی سەرچاوەگرتوو لە دیموکراسییەکان، دەشێ بە مانای کۆی ئەو سێیانە بێ، هەروەها خاڵی پاشەکەوت یان بانکی جیهانیی "دەسەڵاتی تەندروست" بێ.**

## بەشی چواردەهەم

# چراکە رووەو دەروونت داگیرسێنە

ئەرکێك کە لە سەر شانی دنیای دیموکراتییە ئەوەیە کە لە بارەی دیموکراسییەوە بگاتە رێککەوتنێك و ناوەرۆکەکەی بەهێز بکا. ئەم دەسکەوتە، لە پەلامارە دەرەکی و ناوەکییەکانی ستالینیزم دەیپارێزێ. ئەمە رێگایەکی ئاشتیخوازانەیە، باشترین رێگا و پێدەچێ تاقە رێگای بەرگرتن لە جەنگی سێهەم بێ. لەگەڵ ئەوەشدا، رێگایەك کە باشترکردنی پەیوەندی لەگەڵ رووسیای سۆڤیەتیشی لێدەکەوێتەوە.

ئێستا ئیدی وزەی ئەتۆم و ئاسمانگەڕی، هێدی هێدی چەمکی کۆنی دەوڵەت - نەتەوە تێکدەڕووخێنێ. وزەی ئەتۆم لە زۆر بواردا لەوانەیە شۆڕشێك بەرپا بکا. لەوانەیە سیستەمی ئابووری هەڵتەکێنێ و بیگۆڕێ. راپەڕینی خەڵکی کۆلۆنییەکان لە گۆڕانی بیچمی شتەکان دەچێ. دنیای دیموکراتی جێی خۆیەتی چاکسازی تێدا بکرێ. رووسیا خەریکە ئەو رەوتە گورجتر دەکا.

لەوە ناچێ رووسیای بۆلشەڤێك، بە ئیمپریالیزم و ناسیونالیزم و دیکتاتۆری و ئامالی دواکەوتوویی فەرهەنگی و پیشەسازی و زانستییەکەی خۆیەوە، شتێکی وای هەبێ بە دنیای غەیرە سۆڤیەتی ببەخشێ.

رووسێکی ئاسایی، چ تزاریست بێ چ کۆمۆنیست - کە لە پەنایەکدانانێکی ناڕاستیش نییە- هەم رقی لە ئەورووپایە و هەم شەیدایەتی. رێز لە بێگانە دەگرێ و هاوکات لێشی تۆقیوە. هەوڵ دەدا لاسایی ئەورووپا بکاتەوە و لەگەڵ ئەوەشدا دەیەوێ لە ناوی بەرێ. من ئاوات ناخوازم رووسیا بەسەر ئەورووپادا زاڵ بێ" من بە رووسی کردنی ئەورووپام بە لاوە پەسند نییە، وام پێ چاکترە رووسیا ببێتە

ئەوروپایی. لێنین دەستی بەو پرۆسەیە کرد. ئامانجی بەرایی بۆلشەڤیزم ئەوە بوو رووسیا بکاتە ئەوروپایی. بۆلشەڤیزم راپەڕینێك بوو بە دژی رابردوو. دواتری ستالین بە هەمان رابردوو وەنووسایەوە و ئیمانی پێهێنا و بیروبڕوای لێنینی بە لاڕێدا برد. ئێستا، رووسیا ئامادەیە لە رێگەی بە کۆیلەکردنەوە ئەوروپا تێکوپێك بدا. ئەم بەکۆیلەکردنە بە زیانی رووسیا و دنیاش دەشکێتەوە.

رووسیا چی هەیە کە ئاسیا پێویستی پێیەتی؟

دیسپلین؟ خۆ لە رووسیادا دیسپلینێك لە گۆڕێدا نییە. دیسپلین دەبێ خۆکرد و لە دڵەوە بێ.

لە رووسیا بەرتەسکی و دیسپلینی ئیشك و برینگ هەیە کە ساختە و بە زۆرەملییە. چینی و هیندی لە هاوولاتییانی سۆڤیەت بە دیسپلینترن. رووسیای ئەمڕۆ بۆ وەرێ خستنی دیسپلینی نافەرمانیی مەدەنیی گاندی ئاسا دەستەوەستان و کۆڵەوارە.

دابەشکردنی زەیوزاری رووسی؟ ئاسیا تینووی چاکسازیی زەویوزارە، بەلام رەنێوهێنانی ئیشتراکیی ستالینی بووە بە شێوازێکی نوێی ئاغا و رەعیەتی، هەڵبەت بە دیسپلینی کوێرانەی پترەوە.

جموجووڵ و چالاکی؟ بەڵێ لە رووسیادا، جموجووڵ، گرم و هۆڕ و توانا هەن. لەپای چی؟ بە هەر نیازێك بێ بە دڵنیاییەوە بۆ پێگەیشتنی تاك نییە .

ئەگەر ستالین دەسەڵاتداری ئاسیا بوایە، ئاسیای لە باشترین رۆحی خۆی بێبەری دەکرد: رۆحێك بە ناوی **گاندی**. ئەو ئاسیاییانەی چاویان لە مۆسکۆیە و ئەوانەی ئیلهام لە ژاپۆنی پاوانخواز وەردەگرن، کەمترین رادەی گاندیگەراییان تێدایە و زۆرترین دژایەتییان لەگەڵ گاندی هەیە. ئەمانە عەسکەرتاری کرچوکاڵ و ناشارەزان کە بە بەرزکردنەوەی دروشم، سلاوی سەربازی دەدەنەوە. پێیان وایە وەك خەڵکانی ئازادە رەفتار دەکەن، یان وا بیر دەکەنەوە بەم شێوازە دەگەنە ئازادی. بەلام ئەمانە بە گرتنەبەری شێوازەکانی ستالین تەنیا دەتوانن مەیدانەکە



بۆ ستالینێك چۆڵ بکەن کە ئەمانی پەروەردە کردووە. تاکتیکی غافڵگیرانەی نفووزی کۆمۆنیستەکان زۆرتر لە سەر ئەو کەسانە کاریگەرە کە لاوازن یان "ئازادیخواز و کرێکار دۆستن" و وا هەست دەکەن دەسکەوتی کەمیان بووە و دەبێ بە رێگەی **قەدبڕدا** بڕۆن و شتێك بە شتێك بکەن. ئەو کەسانە جاروبار حەز دەکەن لاسای شێوازی رێکخراوەیی و دیسپلینی پاوانخوازان بکەنەوە، واتە: کۆبوونەوەی گەورەی پڕ فیق و هەرا، پڕوپاگەندەی زێدرۆییانەی جەنجاڵی، سان و رێژەی سەربازی و بوغزاندن و بە کافرکردنی نەیاران. لەبەر ئەوەیە کە حکوومەتە نوێیەکانی ئاسیا، رەنگە حکوومەتە ناسەقامگیرەکانی ئەوروپاش، وا بیر بکەنەوە ئەگەر پالەوانبازی وەرێبخەن، درندانە دەست بدەنە توندوتیژی و جووڵە و چالاکیی خۆیان بەوە نمایش بکەن کە چۆن بە خێرایی و بەوپەڕی هێزەوە دەتوانن خۆیان بگەیەننەوە بارودۆخی تازە و دەرفەتەکان بقۆزنەوە، سەرکەوتوو دەبن.

لە ژێر هەر گرفتێکی ئابووری و سیاسیی دیموکراسییەکاندا کێشەیەکی بنەڕەتی خۆی حەشار داوە:

کێشەی ئەخلاقی، کێشەی پەیوەندیی شیاو لە نێو ولاتان و تاکەکاندا، ئا لێرەدایە کە رووسیا کورتی دێنێ یان لە بنەڕەتدا هیچی پێ نییە” ستالینیزم دژە ئەخلاقییە.

دیموکراسی دەتوانێ لە جیاتی فێربوون لە سەرۆکی فەرماندە ستالین، لە مەهاتما گاندی فێری شت بێ. دیموکراسی دەتوانێ ئەم پێشدەستییە بدۆزێتەوە کە دەبێ زۆرترین راستگۆیی و ئەمەگداری و یەکڕوویی بەرامبەر بە بنەماکانی خۆی هەبێ. ئەگەر دیموکراسی پەیڕەوی لە سەرمەشقێکی وەك ستالین بکا، دەبێ واز لە گشتێتی و بنەماکانی خۆی بێنێ و خیانەتیان لێبکا.

دێموکراسی سەرەڕای ئەوەی هەوڵی داوە باش بجووڵێتەوە، هەمیشە کەموکووڕی هەبووە، بەلام ئەمڕۆ کەوتۆتە بەر پەلاماری توند و ئەم دۆخە لە

جەستەیەك دەچێ ململانێی میکرۆبێك بکا: جەستەکە دەبێ لە باشترین دۆخی خۆیدا بێ، ڤیتامینی نوێ وەربگرێ و توانا پاشەکەوتکراوەکانی خۆی بخاتە گەڕ.

کۆمەڵە ئازادییەك لە دێموکراسییەکاندا هەن کە تەنیا کەسانێك بە کەمیان دادەنێن و گاڵتەیان پێدەکەن کە هەرگیز لە سایەی حکوومەتێکی دیکتاتۆریدا نەژیاون. نابێ ئەم ئازادییە بەنرخانە بە کەم بزانرێن. دەشێ پەرە پێبدرێن و کامڵ بکرێن، چونکە قەیران لەگەڵ رووسیا، بوونی ئەو ئازادییانەی کردۆتە مەسەلەیەکی چارەنووسساز.

بارودۆخێکی سەیرە: یەکێتی سۆڤیەت نە دیموکراسییەکی سیاسییە و نە ئابووری. بۆلشەڤیکەکان لە ماڵی شووشەییدا دەژین. کەچی بەردەفڕکە دەکەن. بۆیەش وا دەکەن چونکە ماڵە شووشەییەکەیان بە دیوارێکی ئاسنین دەپارێزرێ و بەردی کەسیان ناگاتێ. لەگەڵ ئەوەدا رەخنەکانی کۆمۆنیست و رووسیا لە دیموکراسیی رۆژئاوا و هەروەها ئەو رەخنانەی لە لایەن هیچ کام لەو دوو بەرەیەوە نین، خەڵکیان بەرەو ئەوە پاڵ پێوەناوە بە چاوێکی وردبینانەتر لە نێوەڕۆکی دێموکراسییەوە رامێنن. جا چونکە لە نزیکەوە تێیەوە رادەمێنن، داوای چاکسازیی زیاتریشی لێدەکەن. بەڵام لە هەمان کاتدا و لە راستیدا، دەبێ شوکرانەبژێری هەر ئەو بەها و ئازادییانەش بین کە هەمانن. دیموکراسی دەبێ سوود لە پێشنیارەکەی گاندی وەربگرێ کە دەڵێ: "چراکە رووەو دەروونت داگیرسێنە."

دنیای دیموکراسی وەك یەکەیەك، دەبێ چراکە لە دەروونی خۆی بگرێ. دێموکراسی دەبێ کۆمەڵە پرسیارێکی دوادۆزانە لە خۆی بکا: ئایا دێموکراسی دەتوانێ بە دژی دیکتاتۆری بجەنگێ و لە هەمان کاتدا دیکتاتۆری وەك فرانکۆ لە ژێر باڵی خۆی بگرێ؟ ئاخۆ ئەمە دۆخێکی دیموکراتییە کە سێ - چوار حەزیا، چارەنووسی وڵاتە بچووکەکان بە بێ وەرگرتنی رای خۆیان دیاری بکەن؟ تۆ بڵێی ئەمە دیموکراتییەت بێ کە لە را و کردەوەدا یارمەتیی **دیکتاتۆرێك** بدەی کە



گەرەکیەتی نەتەوەیەکی سەربەخۆ هەڵلووشێ؟ دەبێ دیموکراتی بوون بەو مانایە بێ کە زلهێزەکان، ئارامیی خۆیان لە سەر حیسابی نائارامیی هێزە بچووکەکان وەدەست بێنن؟ مەگەر نازانن کە ئیدی هیچ ئارامییەکی رەها لە چواچێوەی قەڵەمڕەوەکانی وڵاتێك لە ئارادا نییە. ئاخۆ ڤیتۆی زلهێزەکان لە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان دیموکراتییە؟ ئایا تەگەرە تێخستن لە راپەڕینی ئازادیخوازانەی کۆلۆنییەکان، کارێکی دیموکراتییە؟ باشە ئەسڵی **ماف بە دەسەڵاتدارە** بە مانای دێموکراسییە یان یاسای دارستان؟ تۆ بڵێی دیپلۆماتەکان هەوڵ بدەن لە رووی کەمتەرخەمی و نابەرپرسیارێتییەوە، واژەی **ئاشتیخواز** بۆ ئەو وڵاتانە بەکار نەهێنن کە لە کاتی شەڕی هاوپەیماناندا بە دژی ئەوان شەڕیان دەکرد و لە باتی ئەوە ئەم وشەیە بۆ ئەو نەتەوانە بەکار بێنن کە بەراستی ئامادەن بەشێك لە سەروەریی نەتەوەیی خۆیان بە دەوڵەتی نێونەتەوەیی ببەخشن؟

دنیای دیموکراتی ناتوانێ سەرکەوێ، مەگەر دەوڵەتی حیزبی کرێکاری بەریتانیا سەربکەوێ. ئەگەر هاوکاریی نزیك و یەکسانی ئینگلیز لە ئەورووپا و هەروەها هیند لە ئاسیا نەبێ، هەموو زێڕ و سامانی ئەمریکا ناتوانێ بەر بە کۆمۆنیزم لە نیوەگۆی رۆژهەڵات بگرێ. کۆمۆنیزم لە ئەورووپا و ئاسیا شکست ناهێنێ، مەگەر رەفتارێکی دۆستانە یان هیچ نەبێ لێبوردەیی بەرامبەر بە رژێمە سۆسیالیستەکان یان ئابوورییە تێکەڵاوەکان بگرێتە بەر. ئێستا کە مەترسیی بێکاری لە بەریتانیا جێگەی خۆی داوە بە کەمبوونی درێژخایەنی هێزی کار، سەندیکاکانی کرێکاری لە بەریتانیا و کارمەندی دەشێ دەست لە دژایەتیکردنی خۆیان لەگەڵ کۆچی کرێکارانی بێگانە بۆ وڵاتەکە هەڵگرن. فەڕەنسا دەبێ ئەو راستییە بزانێ کە ئەڵمانیای بێ بەرهەمی خەمبار و نەخۆش، لە ئەنجامدا یەکگرتنی ئەڵمانیا - رووسی لێدەکەوێتەوە کە بە سەر ئەورووپا و یەك لەوان فەڕەنسادا زاڵ دەبێ. ئەڵمانییەکان دەبێ بە رەفتار و دەنگی خۆیان نیشان بدەن کە نایانەوێ ببنە چنگی خوێناویی و دڕندانەی رووسیا. ئوستراڵیا سەرەڕای

سیاسەتی دەرەوەی نموونەیی خۆی، ناهێڵێ کۆچبەری رەنگین پێست بچنە ولاتەکەیەوە. ئەمە نە دیموکراسییە و نە بە قازانجی دنیای دیموکراتییە. زوڵم و زۆری ئەفریقیای باشوور لە رەشەکان، بڕوای ئاسیا بە دیموکراسی لاواز دەکا. دەوڵەتی نەتەوەیی چین تەنیا بە کڕینی چەك و چۆڵ ناتوانێ کۆمۆنیستان شکست بدا. تا ئەو کاتەی حیزبی کومین تانگ و حکوومەتی ناوەندی پڕاوپڕ لەو خاوەن زەوی و شەڕخوازانە بن کە کۆسپی چاکسازیی زەویوزار و پەرەپێدەری بەرتیلخۆری، گەندەڵی، بورس بازی و بێکەڵکیی ئیدارین، کۆمۆنیستەکانی چین لە ناو وەرزێرە بێ زەوییەکاندا دەتوانن لایەنگری زۆر بۆ لای خۆیان رابکێشن.

ئەگەر دنیای دیموکراسی خاوەنی دەوڵەتێکی نێونەتەوەیی بێ، گشت ئەو دەبێ و نابێیانە بە ئاسانی دەکرێ جێبەجێ بکرێن و وەدی بێن. لە دەوڵەتێکی وادا باشترین دیموکراسیەکان دەتوانن ببنە نموونەیەك بۆ خەڵکی تریش.

هەر ولاتێکی دیموکراسی دەبێ چراکە لە دەروونی خۆی بگرێ. بەرتەسك کردنەوەی مافی دەنگدان بە هۆی دەمارگرژی و ترسەوە، دیموکراسی نییە. کاتێ کاتولیێك یان جوولەکەیەك رێگەی پێنادرێ لە سەر سندووقی دەنگدان بێ، کاتێ کە تەنیا دەوڵەمەند و نەجیبزادە بۆیان هەیە پۆستی دیپلۆماتی یان پایەکانی تر وەربگرن، کاتێ کە دەوڵەمەند و سیاسەتوانی گەندەڵی ناپاك و بێ ویژدان حیزبی سیاسی بەرێوە دەبەن و کاتێ کەسانی هەڵبژێراو بۆ نوێنەرایەتی خەڵك تەواو گوێڕایەڵی فەرمان و داوکارییەکانی کەسانی دەستڕۆیشتوو و گرووپی گوشار دەبن، دیموکراسی دەبێتە گاڵتەجاری. ئەگەر دەوڵەتێك دەبینین کە کەمە نەتەوەیەکی دانیشتوو وەدەر دەنێ، ئەگەر دەوڵەتێك دەبینین کە مافی پەنابەرێتی بە ستەمدیدە و کەسانی ژێر مەترسی رەوا نابینێ، دەبێ دڵنیا بین کە ئەو دەوڵەتە بنەمایەکی دیموکراتی پێشێل کردووە.

ئەوە کە ئازادی بدەینە لایەنگرانمان شتێکی ئاسانە. مەرج و بنەڕەتی دیموکراسی ئەوەیە کە نەیاران لە دژایەتیکردنی خۆیاندا ئازاد بن. دیموکراسی لە



راستیدا، ئازادیی کەمینە لە دژایەتیکردن و ئازادیی **کەمینە مانەوەیە**. ئەگەر کەسانێ یا گرووپگەلێ سەبارەت بە بیروباوەڕیان ئازار دەدرێن و هەڵدەپێچرێن و ئەگەر ناتوانن یان بە لایانەوە سەختە کە بیروباوەڕی خۆیان لای خەڵکی تر دەربڕن، ئەمە ستالینیزمە، ئەمە هەمان ئەو کارەیە کە هیتلەر و مۆسۆلینی و ژاپۆنییەکان کردیان، فرانکۆش خەریکە دەیکا. *پاول رۆبیسۆن*(٥٧) با هەرچی پێی خۆشە بیڵێ، یان بیچڕێت. تۆ بە دانی ئازادیی دیموکراتی بەو هونەرمەندە دەتوانی رەخنەکانی لە دیموکراسی کەم بکەیەوە. ئەوە قسەی تێدانییە لەسایەی سیستەمی ستالینیدا هەرگیز رێگەی پێنادرێ و ناتوانێ بە دژی ستالینیزم لە رووسیا قسە بکا یان گۆرانی بڵێ. تۆ ئەمە بەو و بە دۆستەکانیشی دەڵێی، ئەوکاتەیە دەبینی کەسانی وەك ئەو بڕوا بە دیموکراسی دێنن. بەهەرحاڵ تۆ ناتوانی بڕوات بە دیموکراسی بێ و هاوکات، بە بەرتەسك کردنەوەی ئازادیی خەڵکی تر، نکوولی لێبکەی.

**مرۆڤ ئەگەر برسی یان بێکار، یان لە خوێندنی بەدڵی خۆی بێبەش بێ، ئازاد نییە. ئەو کەلاوەنشینانەی، نەخۆشی و تاوان و دژایەتیکردنی ئەخلاق زاوزێ دەکەن، دیموکراتی نین. دیموکراسییەك کە مووچەی کەم دەداتە مامۆستاکانی، دیموکراسیی خزمەتگوزار نییە. ترس لە سەردەمی پیریی بێ پاشەکەوت، لای کەسانی بەناو تەمەن کەوتوو، زۆر جار دەبێتە هۆی چاوچنۆکی، گەندەڵیی ئەخلاقی، دزی و مامەڵەی گەندەڵ و بەرتیلخۆری و لەبەر ئەوە بە دژی بنەما ئەخلاقییەکانی دیموکراسی دەجووڵێتەوە.**

---

(٥٧) Paul Robeson (1976-1898) وەرزشکار، مافناس، هونەرمەند و چالاکی نەهێشتنی ستەمی نیژادی ئەمریکایی کە لە گۆرانییەکدا، هەڵوێستی دژی ستەمی نیژادیی سۆڤیەتی پەسن دا و بەهەمان هۆ رەخنەی لە سەرمایەداری و حکوومەتی ئەمریکا گرت. لێرەدا، لویی فیشێر بە لای خۆیەوە، پەسندان و بەرگریی یەکپارچە و بێ شەرت و مەرجی ئەو لە سۆڤیەت بە ناڕاست دەزانێ. نیلسۆن ماندێلا رێبواری سەربەرزی ناتوندوتیژی، رۆبیسۆن بە هونەرمەندی خۆشەویستی خۆی و **قارەمانی ئێمە** ناو دەبا.

ئەگەر هەژاری و نائەمنی بەربڵاو بێ، تەنانەت ئازادترین هەڵبژاردن و ئازادیی کاملی رادەربرین و کۆبوونەوەش زامنی دیموکراسی نین.

مرۆڤێك کە نەتەوە یان ئایینەکەی بکەوێتە بەر ئازار و راوەدوونان، ئازاد نییە. لە شارۆچکەیەکی نزیکی فڕۆکەخانەی لۆس ئەنجلۆس تابلۆیەکی گەورەم بینی کە وەك پڕوپاگەندە لێی نووسرا بوو: **قەدەغەی پاك**، واتە جوولەکە یان قولەرەشەکان بۆیان نییە بێنە شارۆچکەکەمان. ئەمە هیتلەریزمە، چۆن دەتوانێ **پاك** بێ؟ نامەسیحیاییە، چۆن دەتوانێ دیموکراتی بێ؟ ئەگەر ئەو شتانەی مایەی پاوانخوازین لە دێموکراسییان دەربهاوێژی، ئەوەدەم بەرەت لە ژێر پێی دوژمنە ناوەکی و دەرکییەکانی دیموکراسی راکێشاوە. بە پێچەوانەوە ئەگەر هیچ کارێك نەکەی و لە جیاتی ئەوە بەردەوام بە سەر کۆمۆنیست و خەڵکی تردا هاوار بکەی: **سوورە!** ئەو کاتەیە کە ژمارەی کۆمۆنیستان زیاتر دەکەی: **وەك هیتلەر بجووڵێوە تا نازی و فاشیست و کۆمۆنیستان بەرهەم بێنی.**

ئەگەر هەر دێموکراسییەك رەخنەگرانە و بێبەزییانە بەخۆیدا چووبایەوە و لاوازییە نادیموکراتییەکانی خۆی دۆزیبانەوە و لایبردبان، ئیدی ئێستا لەگەڵ ئەو هەمموو قەیرانە جیهانیانەدا بەرەو ڕوو نەدەبووین کە هەن. لە دیموکراسیەکدا هەمموو ژن و پیاو و منداڵێك دەبێ پەیڕەوی لە بنەماکەی گاندی بکا و تیشکهاوێژەکە لە دەروونی خۆی بگرێ. رادەی وەدیهاتنی ئەم ویستە، پەیوەندیی بە رادەی خواست و ئیرادەی کەسەکەوە هەیە. هەر تاکێك تا چ رادەیەك وەدیهاتنی ئەم ئامانجەی بوێ، دیموکراسی بە هەمان رادە لەودا وەدی دێ.

ئێوارەخوانێك لە *لانگ بیچیی* کالیفۆرینا ساز کرابوو. من لەوێ باسی خەباتی سیاسی بە دژی رووسیای ستالینیم کرد و بۆچوونی گاندیم بیر خستنەوە کە دەڵێ دنیای مۆدێرن لە رادە بەدەر لەسەر **پەیداکردن و دەست خستن و چیم هەیە** و زۆر کەم لە سەر **خۆم چیم** چڕ بۆتەوە.

بەڵام **خۆڕاگر بە** و **خۆت بە** فەلسەفەی مەهاتمایە.



دوای وتاربێژییەکانی دانیشتنەکە، پیاوێك هاتە لام و خۆی وەك پزیشك پێ ناساندم و لێی پرسیم: "خەڵکی سەر شەقام و مرۆڤی ئاسایی لەو نێوەدا، چیان لە دەست دێ؟"

گوتم: "تۆ رۆژانە چاوت بە ٥٥ تا ٨٠ نەخۆش دەکەوێ."

گوتی:" بەڵێ نیازم وایە هەقی ڤیزیت کەم بکەمەوە.

**دکتۆر، باش لە خەباتی سیاسی بۆ دێموکراسی گەیشتبوو.**

لە نزیك گەڕەکی رۆژئاوای پارکی ناوەندیی نیویۆرك، شەوێك دوو کوڕیژگەم تەماشا دەکردن کە بەفری پێش دوکانێکیان دەماڵی. چاك خۆیان ماندوو دەکرد. کاتێك یەکیان پشتی راست کردەوە تا پشوویەك بدا، هەلم بۆ هەڵکەوت لێی بپرسم:

"کەس پێی گوتوون ئێرە بماڵن؟"

گوتی:" کەس پێی نەگوتووین، ئێمە لەبەر هیچ شتێ ئەم کارە ناکەین."

ویستم پارەیەکیان بدەمێ. گوتیان "نا، سوپاس، ئێمە پێشەنگین."

ئاخۆ ئەو دووە کە گەورەش بوون، هەروا ئامادە دەبن خزمەت بە کۆمەڵگەی خۆیان بکەن؟

یان ژیان، بە مانای هەڵپە و خۆکوتانی شێتانە بۆ **چنگ خستن و پەیداکردن** دەیانگۆڕێ و خرایان دەکا؟ ئاخۆ ئەمە راست نییە کە منداڵی باش، لە گەورەی باش پترن؟ سەروتاری رۆژنامەکان، مامۆستایان بە هۆی پێکهێنانی یەکێتی و دەستدانە مانگرتن مەحکووم دەکەن." بەڵێ، مامۆستا خزمەتکارێکی کۆمەڵایەتییە نەك کاسبکار." بەڵام خۆ رۆژنامە، گۆڤار، رادیۆ و دەزگایەکی بڵاوکردنەوەی کتێبیش و ...تاد، بە هەمان رادە ئەرکی کۆمەڵایەتیی گرنگیان بەرامبەر گەورەکان لە سەر شانە. ئاخۆ خاوەنی رۆژنامە خۆی بە خزمەتکاری کۆمەڵگا نازانێ؟ یان وا بیردەکاتەوە ئەرکی ئەو نییە کە خەڵك فێر بکا،

زانیارییان بداتێ و پەروەردەیان بکا و ئاستیان بەرزتر کاتەوە، بەڵکو دەبێ خوێنەرانی سەرقاڵ و دڵخۆش بکا تا ڕۆژنامەکەی بۆ بفرۆشرێ؟

زۆربەی خەڵك خۆیان لە بەرپرسیارێتییە کۆمەڵایەتییەکانیان دەدزنەوە. هاووڵاتییانی دیموکراسییەك زۆر جار پێیان وایە کە دەنگی خۆیان خستە سندووقەوە، ئیدی ئەرکیان تەواو دەبێ و ئەگەر نامەیەك بۆ نوێنەری پەرلەمان بنووسن یان چاو ببڕنە کردەوەی حکوومەت و بە دژی هەڵەکانی ناڕەزایەتی دەرببڕن، بە هۆی شەرافەتی هاووڵاتێتییان ڕەنگە پیرۆزباییش لێکتری بکەن کە ئەو کارە گەورانەیان ئەنجام داون. بەڵام دێموکراسی شتێکە زۆر زیاتر لە هەڵبژاردنی ئازاد و حکوومەتی باش و ئەم جۆرە ناڕەزایەتی دەربڕینە بێ کەڵکانە.

**مەهاتما گاندی دەڵێ کەسانێك کە ڕاستەوخۆ دەرگیری کارێکن، بەر لەوەی کێشەکە هێندە ئاڵۆز بێ کە پێویست بکا حکوومەت دەستی تێوەربدات، دەبێ بۆخۆیان کێشەکە چارەسەر بکەن. بە وتەیەکی تر، ئەو زیاتر بڕوای بە هاوکاریکردن و هەوڵی خۆکرد هەیە نەك پەسندکردنی یاسا. تێورەکەی وی ڕادیکاڵ و بنەڕەتییە: یاساکان هەندێ جار یارمەتیدەرن، بەڵام تۆ ناتوانی خۆشەویستیی برایانە یان هەقیقەت یان خێرخوازی یان لێبوردەیی یان ویژدان لە دەفری یاسا بکەی و پەسندی بکەی. چونکە، ئەو دیموکراسییەی لە کتێبە یاساییەکاندایە، هۆکاری پێویست بۆ" زیندوو"بوونی نییە. تەنیا بوونەوەرە زیندووەکانن کە بە ڕەفتاری لەحزە بە لەحزەی خۆیان، ئەو ئایدیا بەنرخە دەکەنە هەقیقەتێکی زیندوو.**

**گاندی بەرامبەر بە هیچ کەس ڕق و قین و بەخیلی یان ڕەنجانی لە دڵدا نییە. سی ساڵی ڕەبەق بە دژی ئیمپریالیزمی ئینگلیز خەباتی کرد، بێ ئەوەی یەك وشەی توند و چزوودار لە دژی هیچ ئینگلیزێك دەربڕێ. گاندی دۆستایەتیی خۆی لەگەڵ ئەو دەسەڵاتدارەی پاشایەتی تێکنەدا کە ئەوی خستە زیندانەوە.**



**گاندی دژی سیتەمێك بوو نەك کەسەکان. شێوازەکەی وای لێکرد لە شکان نەهاتوو بێ و کاریگەرییەکی مەزن و لەرادەبەدەری پێبەخشی.**

**"من شەیدای نیزامی فیۆدالی نیم". گاندی ئەم وتەیەی لە مەراسیمێکی نوێژ لە ویلایەتی *بەیهار* لە مارسی ١٩٤٧ دەربڕی و لە درێژەدا گوتی: "هەمیشە بە دژی سیستەمی ئاغا و ڕەعیەتی دواوم. بەڵام بە ڕاشکاوی دانی پێدادەنێم من دوژمنی خاوەن زەوییەکان نیم. من دوژمنی کەس نیم. باشترین ڕێگەی بەدیهێنانی چاکسازی لە سیستەمە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکاندا کە هەموو لایەك لەسەر ئەوە کۆکن کە خراپەیان کەم نین، بە شاڕێگەی "خۆئەزیەتدان"دا تێدەپەڕێ. هەر چەشنە پشتگوێ خستن و لادان لەو ڕێگەیە، تەنیا گۆڕانی بیچمی ڕواڵەتی خراپەکەیە کە وا بیر دەکرێتەوە بە کاری توندوتیژی خاشەبڕ دەکرێ."**

گاندی لە هەمان سەفەر بۆ بەیهاردا، کە بۆ سەرکۆنەکردنی هیندووەکان لەسەر ئازاردانی مسوڵمانان ئەنجامی دا، لە مەراسمێکی دیکەی نوێدا نامەیەکی پێگەیشت کە جنێوی تێدا نووسرا بوو. گاندی ڕایگەیاند:" ئەگەر یەکێك جنێوم پێبدا، من لە سەرمە جنێوی پێ نەدەمەوە، خراپە ئەگەر بە خراپە وەڵام بدرێتەوە، تەنیا لێکدراوێك ( زەرب)ێك لە خراپەی لێدەکەوێتەوە، ئەوە هەر هیچ کە کەمی ناکاتەوە.

ئەمە یاسایەکی گەردوونییە: کڵپەی ئاگری توندوتیژی، بە توندوتیژیی زیاتر ناکوژێتەوە.

**زۆر جار دەبینی وشەیەکی نەجووراو بەزم و شەڕێکی گەورە دەنێتەوە. ئاخر کەسانی دەرگیر ناتوانن ببەخشن، ئارام بگرن و بحەسێنەوە! زۆرجار دەبینی مرۆڤی لاواز کە یەکێکی لە خۆی بەهێزتر زوڵمی لێدەکا، خەفەتی خۆی بە سەر کەسێکدا دەڕێژێ کە هەر هیچ هێزی نییە! زۆر جار کەسانی زۆرلێکراو دەبینین کە هەوڵ دەدەن ببنە زۆردار! کاری چەند ناشیرین دەبینین کە لە حەزی "سەلماندنی**

بالادەستی" یان "نیشاندانی بەهێزی"یەوە سەرچاوە دەگرن! زۆر جار ڕێکخراوی بەسوود دەبینی لاواز دەبن یان لە بەریەك هەڵدەوەشێن، چونکە ئەو کەسانەی کە لە پێناوی خۆشەویستیی بیروبڕوایەك لە ڕێکخراوەکەدا کار دەکەن، ئێرەیی بە پێگەی کەسێکی تر، لە ڕێکخراوەکەدا دەبەن!

گاندی، هەر کاتێك خزمەت بە خەڵك پێویست بێ، خۆی بە بچووك دادەنێ. ئەوە هەمان خاڵی بەهێزیەتی. ئەو هەمیشە چالاکە و لەگەڵ ئەوەشدا خاکەڕایە، گەورەترین خزمەتیشی "وەها بوونی"یەتی.

کاتێ مەهاتما مۆدیل و سەرمەشق بێ، هاووڵاتییانی دیموکراسیەك لەباتی هانەی وەك بالادەستی و خۆڕەپێش کردن و پارە و پلەوپایەی کۆمەڵایەتی و دەسەڵات، دەتوان بە سەر دوژمنکاری و تێکهەڵقۆچین و ئەو نایەکسانیانەی کە ئازادی بەرتەسك دەکەنەوە و ڕێگە لە گەشەکردنی تاکەکان دەگرن، بالادەست بن.

پارە- لەیەك خاڵی ئاڵوگۆڕکەری تایبەت (تێپەڕین لە هێڵی هەژاری) بترازێ - ناتوانێ بەختەوەری بهێنێ. هەڵپەی پارە پەیداکردن لەوانەیە بەدبەختیشی بە دواوە بێ. دەوڵەمەندان لەوانەیە بە هەمان ڕادەی هەژاران هەست بە نائەمنی بکەن. وەسەر یەکنانی سامان بۆ چێژوەرگرتن و دەسەڵات و خۆڕانان لە تاکدا نەخۆشییەکە لەو کەسەوە دەڕژێتە کەشوهەوای ئالوودەی گشت کۆمەڵگاوە. ئەگەر مرۆڤەکان ئەم خاڵە بە جوانی ببینن(دەشیبینن ئەگەر ڕاستگۆیانە پرسیار لە خۆیان بکەن مەسەلەکە چۆنە و ڕاستگۆیانەش وەڵامی خۆیان بدەنەوە)، لەوانەیە بگەنە سیستەمێکی بەهای تر. ئەوڕۆکە، لە ڕوانگەی زۆربەی خەڵکییەوە، پارە پڕبایەخترین شتە؛ ربە و پێوانەیە: لە ئینگلیزیدا قسەیەك هەیە دەڵێ: "بەقەد ملیۆنێك دۆلار هەستی پێدەکەم."



پێداگرتنی شێتانە لە سەر پارە وەك دوامین بەها، کەسێتی وێران دەکا. تاکگەرایی نوێ، لەرزۆکانە لەسەر ئەوەوە وەستاوە کە تاك چی هەیە نەك خۆی چییە[٥٨]. ئەم دوو شتە هەمیشە یەك نین.

تاکخوازە توندوتیژەکان، سامانی نەوتیی پینسیلوانیا- یان بە فیڕۆدا. ئەوان دارەکانی ڕۆژئاوای ویلایەتە یەکگرتووەکانیان بە فیڕۆدا و ئێستا خەریکی ئەو کارەن. ئەوان گەیشتنە سامان و سامانی کۆمەڵگایان گەسك دا. تاکخوازیی سەرمایەداری، کەسی لێهاتوو، کارامە و لەسەر کار سوور خەڵات دەکا و لە هەمان کاتدا، بە پارەی تالان و دزی خەڵات و دیاریش دەداتە سەرزلە دەستبڕ و بێویژدانەکان .

تاکگەرایی گاندی لە ناخی بڕوابوون بە "ناتوندوتیژی"یەوە سەرچاوە دەگرێ. لە کاتێکدا کە تەنیا چەکی، دادخوازی و ئیرادەی پۆڵایینیەتی، بە گژ خراپەی خاوەنی دەسەڵاتدا دەچێتەوە. کاتێ دەسەڵاتی پارە ژێرپێ دەنێ، دژە سەرمایەدارێکە و ئەو دەمەی هێزی دەسەڵات ژێر پێ دەخا، دیموکراتێکە.

گاندی دەرمانی دژە ژەهری ستالینە، ئاخر مەهاتما ڕەمزی تاك لە بەرامبەر "حکوومەتی دەسەڵاتداری موتڵەق"ە. گاندی بەرامبەر بە دەسەڵات و شەوکەتی ئیمپراتۆریی بەریتانیا وەستایەوە و سەرکەوت. ئەم کارەشی بە بێ پارە، بێ توندوتیژی و تەنانەت بێ ڕێکخستنێکی ئەوتۆ ئەنجام دا. ئەو بە هزرێك و لە ڕێگەی توانای سەرچاوەگرتوو لە ئامرازی شەرەفمەندانە و وتەی شەرەفمەندانەوە ئەو کارەی کرد.

هەندێ کەس دەڵێن ئەم شێوازە لە دەرەوەی هیند ناشێ سوودی هەبێ، باشە تا ئێستا کەس تاقی کردۆتەوە؟

(٥٨) ئەم دەربڕینە وەبیر فیلمی **هاوشاری کەین** دەخاتەوە کە لە چڵەپۆپەی سامان و ناو و ناوبانگ و ئالوودە بوون بە گەندەڵی، لە ساتەوەختی سەرەمەرگدا، حەسرەتی ئەو لەیستۆکە دەخوا کە بە منداڵی لیێ بێبەش بووە و بە یادی ئەو لەیستۆکەوە گیانی دەردەچێ.

کۆمەڵگای ئێمە (ئەمریکا) شانازی بە تاکگەرایی خۆیەوە دەکا و زۆربەی زۆری خەڵك لە سەر ئەو بڕوایەن کە ڕێگەی سامان و ناوبانگ لە بەردەمیان ئاوەڵایە. لەگەڵ ئەوەشدا تاك هەمیشە لە رووی کۆمەڵایەتییەوە خۆی بە کەمبایەخ و بێتەئسیر دێتە بەرچاو. بابەتێکی زانستی یان بەرهەمهێنان یان دابەشکرنی لەگەڵ باس بکە، خێرا بە گوڕ و تین و بڕوا بەخۆبوونەوە ئانگژای دەبێتێ تا هەڵینێ. بابەتی هەژاری، سیاسەت یا ئاشتیی جیهانی لەگەڵ بهێنەگۆڕ، دەڵێ:

"ئەمەیان هیچی لەگەڵ ناکرێ." تاکگەرایی ئێمە، تاك لە زۆربەی زۆری تواناکانی بێبەش دەکا، جگە لەو توانایانەی بۆ پەیداکردنی پارە و دەسەڵات پێویستن.

گاندی بڕوای بە توانای تاکەکان، چ بە تەنیا و چ لە ڕێگەی ڕێکخراوەکانیانەوە بۆ کاریگەریی دانان لەسەر رەوتی ڕووداوە گەورەکان هەیە.

ملیۆنان کەس ئامادە بوون لە جەنگی دووەمی جیهانیدا گیانی خۆیان بەخت بکەن. ملیۆنان کەسی مەدەنی خوێنیان بەخشی، کاریان کرد، پارەیان دا، کاتیان بۆ تەرخان کرد و ئازایەتییان نواند. مرۆڤەکان ئامادن بمرن یان کوێرەوەری ببینن بەڵام لە شەڕدا سەرکەون. ئەوان چاو لە ژیانی خۆشتر دەپۆشن بۆ ئەوەی ڕێگە لە شەڕ بگرن. گاندییزم[٥٩] داوا لە خەڵك دەکا ژیانێکی خۆشتر بژین. داوایان لێناکا وەك وەلی و پیاوچاکە خەرقەپۆشەکان (یووگی و ریشپانە هیندووەکان) بژین. بەڵام داوایان لێدەکا کەمتر خۆویست، کەمتر چاوچنۆك، کەمتر پووڵەکی و کەمتر خۆپێزۆر بن" داوایان لێدەکا لەگەڵ کەسانێکدا کە جیاوازن - **لەگەڵ جیابیر و**

(٥٩) دیارە باشتر وایە بزانین گاندی خۆی بە توندی دژی ئەو جۆرە دستەواژانە بوو و بڕوای وا بوو: "من هیچ شتێکی نوێم بە جیهان نەبەخشیوە و لە فیرقەسازیش بێزارم. هەر کەس و بەهەر ناوێکەوە بنەماکانی ناتوندوتیژی لە ناخی خۆیدا پەروەردە بکا( بنەماگەلێك کە بە قەد چیاکان کەوانارن) منی لە خۆیدا درێژە پێداوە." ئاشکرایە نووسەر، بەو ئاگادارییەی لە بیروڕاکانی گاندی هەر لەم بارەوە هەیبووە، بۆ چڕکردنەوەی بابەتەکەی، ئەم دەربڕینەی بەکار هێناوە.



**ئەوانی تردا** - دلۆڤانتر، راستگۆتر و دۆستانەتر هەڵسوکەوت بکەن و خێرخوازتر بن. کەسانێك وەڵام دەدەنەوە: "نا، ئەمانە زۆر تەمومژاوین." بەڵێ تەمومژاوین، بەڵام تا ئەوکاتەی کە پاش لە خەو هەستانی بەیانی تووشی یەکەم مرۆڤ دەبی، لە حاڵێکدا هێشتا خەواڵووی.

ئەدی دوای ئەوە؟ دەبێ هەر ئەم بنەمایانە راستەوخۆ و راشکاوانە لەگەڵ ئەو کەسەدا لە کار بکەی، یان نەیکەی. هەر چۆنێك بێ دەبێ دەست بدەیە کردارێکی راستەوخۆ و ئاشکرا. مامۆستای قوتابخانە، خوێندکار و قوتابی، کاربەدەستی دەوڵەت، خاوەن کارگا، خاوەن زەوی، سەرۆکی کۆمپانیا، هونەرمەند، سەرنووسەر، بلێتفرۆشی تراموا، پاسەوان، بەقاڵ، کڕیار، کرێکار و... بە ئیرادەی خۆی دەتوانێ لە هەر خولەکێکدا، یارمەتییەکی کردەیی بە شادمانی خۆی و خەڵکی تر بکا. ئەوانەی سامان و دەسەڵاتیان هەیە، لە چوارچێوەی ئابووریی ئێستایاندا یان بە چاکسازیکردن دەتوانن دۆخی ژیانێکی خۆشتر بڕەخسێنن.

گەلێ کەس هەن زۆر لەوەی کە یاسا یان رێسای پیشەکەیان چاوەڕوانیی لێیان هەیە، باشتر لەگەڵ هاوڕەگەزی خۆیان هەڵسوکەوت دەکەن" ئەمانە لە رووی دەروونپاکیی سروشتییانەوە وەها رەفتار دەکەن. هەموو کەس دەتوانێ لەوەی کە هەیە باشتر رەفتار بکا. ئەگەر ئێمە دەست بە کار بین و هەموو دەرفەتێك بۆ باشترکردنی خۆمان و کۆمەڵگاکەمان بقۆزینەوە، رۆحیاتی نائومێدانەی ئێستا دەشێ لەناو بچێ و خەڵك ئیدی ناتوانن بڵێن: "ئێمە هیچمان لە دەست نایە... پەیوەندیی بە منەوە نییە."

تاکگەرایی گاندی لە بڕوابوون بە مرۆڤەوە سەرچاوە دەگرێ. **"دەست بدە کردەوە دەنا بمرە" دروشمی خۆشەویستی گاندییە و چونکە نایەوێ بمرێ، دروشمەکەی "دەست بدە کردەوە"یە.**

**ئەو کەسانەی دەڵێن هیچمان پێناکرێ بە زۆری کەسانێکن کە هەوڵیان نەداوە و بە تەماش نین بیدەن. لە دەوراندەوری ئێمەدا هەندێك برینی کۆمەڵایەتی هەن**

**که پێویستیان به پەرستاری و سارێژ کردنه، هەندێك سیاسەت هەن که پێویستیان به نیازپاکی و راستگۆیی هەیه، هەندێك نادادپەروەری هەن که پێویسته لابرێن، هەندێك گۆڕانکاری ئابووریی هەن که پێویستیان به هاندان و ئەنجامدان هەیه.**

**گاندی له تەمەنی حەفتا و هەشت ساڵیدا**، له نێو هەزاران گرفتدا، پێی نایه ناوچەیەکی شەڵاڵی خوێن که به رق و هەڵچوون ژەهراوی کرابوو، تا به کێشەی دژواری دوژمنایەتیی هیندوو- مسوڵمانان رابگا. کارێکی وای کرد هەندێ له پیاوخراپ و تاوانبارەکان تۆبەیان کرد، ئەوانی دیکەش که پیاوکوژیشیان له نێودا بوون، خۆیان تەسلیمی ئەو یان پۆلیس کرد، کەسانێکی دیکەش غەرامەیان دا. **گاندی کێشەکەی چارەسەر نەکرد، بەڵام "لانیکەمی" ئەوەی کردی ئەوە بوو که" ئەوپەڕی" توانای خۆی بەکار هێنا.**

گاندی به هەبوونی رووبەرێك له ئازادی که بتوانێ له سەری بوەستێ و دەست به کردەوە بکا و، به بەکاربردنی ئامرازی توانای تاکەکەسی، توانیویه دنیا بخاته جموجووڵ. کەم کەس هەن بتوانن ببنه گاندی، بەڵام پەیوەندییەکی کورت به گاندییەوە دەتوانێ له دەروونی هەرکام له ئێمەدا ئەوەنده بخاته سەر توانای ئەخلاقیمانەوە که هەموو ستالینەکانی مۆسکۆ و هەموو ئەو ستالین و هیتلەره پەنجا دەر سەدی و دە دەر سەدی و دوو دەر سەدییانەی که له دیموکراسیەکاندا خۆیان مەڵاس داوە و له پاکیی دێموکراسی کەم دەکەنەوە، به چۆکدا بێنین.

گەیشتن به ئازادیی تاك و بنەما ئەخلاقییەکانی تاك و هەروەها گەیشتن به دیموکراسی و به پێی هەموو ئەوانەش: گەیشتن به ئاشتی، به تێکشکاندنی ستالینیزم و به یارمەتیی گاندی گەرایی وەدی دێت.

کەواته: **چراکه رووەو دەروونت داگیرسێنه.**